Contents

## پێشەکی

ئەم کتێبە هەوڵێکی بچوکە بۆ ناساندنی کۆمەڵێك کتێبی پەروەردەی و ناساندنیان بە خوێنەران. چەند بۆچونێکی جیاواز و دژ بەیەك لە خۆ دەگرێت سەبارەت بە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە دامەزراوەکاندا پرۆسەیەکی چڕوپڕو پێکهاتووە، پەروەردەو فێرکردن کلیلی سەرکەوتنە، کەوامان لێدەکات بە ئاگابین دەربارەی ئەو زانیاری و شارەزای و ئەخلاقەی کە زانین و شارەزای و ئەخلاقمان پێدەبەخشێت بۆ پێشکەوتنی داهاتوو.

هەندێك لە فەیلەسوف و پەروەردەکارەکان پێیان وایە سیستەمی پەروەردەی ئێستا لەلایەن بزنسمانەکانەوە دانراوە بۆ بە کۆیلەکردنی کۆمەڵگا، بۆ دروستکردنی کرێکاری شارەزاو گوێڕایەڵ بۆ ئەوەی کارگەو ئۆفیسەکانیان بۆ بەڕێوەبەرن، بۆیەش قوتابخانە دروستکراوە بۆ بەدەستهێنانی مرۆڤێکی بێ عەقڵ. لە بری بیری ئازاد و سەربەخۆ، کەواتە دەبێت ڕێگایەك بدۆزینەوە وامان لێ بێت گەنجەکان جیهانبینیان بەو شێوەیە بێت کە ئێمە دەمانەوێت کەواتە دوای خوێندن بەتەواوەتی دوای ئەو ڕاستە دەکەوێت کە ئێمە دەمانەوێت.

سیستەمی پەروەردە بۆ ئەوە دروست نەکراوە کە تۆ ببیتە کەسێکی پێگەشتوو تەنها ئەو تێگەشتنەت ئەداتێ وا هەست بکەیت فێر ئەبیت وزیرەك و سەرکەوتوو، بەڵام تێڕوانی تۆ بۆ واقیع زۆر تەسك و سنوردار ئەکات، لەبەر ئەوە کاریگەرترین ڕێگا بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگا دابڕانی خەڵکە لە توانای ئازادی بیرکردنەوە، وە چانسی ئەوەیان نەدەیتێ کە بیرکردنەوەیان لە سنور تێپەڕێت.

لە لایەکیترەوە هەندێك تر، پێیان وایە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن گۆڕانکاریە لە ڕەفتاری جەستەیی یان زیهنی تاك دروستدەکات و کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر ئازادکردنی بیر و پێشخستنی کۆمەڵگا، باوەڕیان وایە بە کردنەوەی دەرگای خوێندنگەیەك هۆکارە بۆ داخستنی دەرگای زیندانییەك. لەبەر ئەوە لەم کتێبەدا هەردوو بۆچونەکە خراەتە ڕوو.

کتێبی یەکەم: ئەی ڕۆڵەی شیرینم- نوسینی: ئیمامی غەزالی
وەرگێڕانی: عەلی موحەممەد تەتاخاجی

چاپی دووەم – ٢٠٢٤

بسم الله الرحمن الرحیم

ئەی ڕۆڵە

یەکێك لەو ئامۆژگاریانەی کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئامۆژگاری گەلەکەی پێکرد، ئەو فەرمایشتە بوو کە دەفەرموێت: نیشانەی پشت وەرگێڕانی خودا لە بەندە، سەرقاڵبونی بەندەیە بە شتانێکەوە کە قازانجی قیامەتیان بۆ نییە. خۆ ئەگەر کەسێك کاتژمێرێك لە تەمەنی بەسەریدا بڕوات و خەریکی ئەنجامدانی ئەو شتانە نەبێت کە لە پێناویدا هاتووە، ئەوا ئەو کەسە شایستەی ئەوەیە حەسرەت و پەشیمانیەکەی درێژە بکێشێت.

ئەی ڕۆڵە

ئامۆژگاری ئاسانە بەڵام سەختیەکەی لە قبوڵکردنیدایە. چونکە ئامۆژگاری لای ئەوانەی شوێن هەوا و ئارەزوو کەوتون تاڵە، ئەمەش لەبەر ئەوەی شتە ڕێگە پێنەدراوەکان لە دڵیاندا خۆشەویست و شیرینە. بەتایبەت لای ئەوانەی پێیان وایە زانستی بێکردەوە لە ڕۆژی دواییدا فریای دەکەوێ. هەروەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: بە سزاترین کەس لە قیامەتدا، زانایەکە کە زانینەکەی سودی پێنەگەیاندووە.

جونەیدی بەغدادی دەڵێ: هیچ شتێك سودی بۆمان نییە، جگە لە کڕنوش گەلێك کە لە کاتی تاریکی شەودا ئەنجامی بدەین.

ئەی ڕۆڵە

لە کردەوەدا مایەپوچ مەبە و بێحاڵ مەبە، لەوەش دڵنیابە کە زانیاری ڕووت و بێکردەوە خاوەنەکەی بەرەو ڕزگاری نابات. ئەگەر سەد ساڵیش زانست بخوێنی و هەزار کتێب کۆبکەیتەوە، هەتا کاریان پێنەکەیت. ئامادەی ئەوە نیت بچیتە ژێر بەزەیی خودا خاوەن دەسەڵاتەوە. هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: (وَأن ليسَ للإنسانِ إلى ما سَعى). واتە: بە ڕاستی مرۆڤ خاوەنی هیچ شتێك نییە جگە لەو کردەوانەی کە ئەنجامیان دەدات.

(فَمَن كانَ يَرجوا لِقاءَ رَّبِهِ فَليَعمل عَمَلاً صالحاً) واتە: جا ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگاری شاد بێت، با کار و کردەوەی دروست ئەنجامبدات.

ئەی ڕۆڵە

ئەگەر کار ناکەیت، کرێ وەرناگریت. پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت: خۆت لێپرسینەوە لە خۆت بکە، پێش ئەوەی لێپرسینەوەت لێبکەن، خۆت کێشانە و پێوانەی کردەوەکانت بکە پێش ئەوەی کێشانە و پێوانەت بۆ بکەن. هەروەها زانایەك دەڵێت: کارە ڕاستەکە ئەوەیە سەرنجت لەسەر کردەوە چاکەکە لابدەیت و وازیش لە چاکە نەهێنیت.

ئەی ڕۆڵە

چەندین شەو بە پێداچونەوەی زانست و تەماشاکردنی کتێب ڕۆژت کردوەتەوە و خەوت لە خۆت زڕاندوە، من نازانم نیەتت لەو کارەت چیبووە؟ گەر مەبەست و نیەتت ئەوە بووە دنیا بەدەست بهێنێت و خۆشیەکانی بەرەو خۆت رابکێشیت و پلە و پێگە بەدەست بهێنیت، تا دواتر لە نێو هاوشێوە و هاوەڵەکانتدا خۆت هەڵبکێشیت، ئەوا وەیلا بۆ تۆ. خۆ ئەگەر لە کارەکەشت نیەتت ئەوە بوو شەریعەتەکەی خودا زیندوبکەیتەوە و ڕەوشتت جوان بکەیت و نەفسی فەرمانکەر بە خراپە تێکبشکێنیت، ئەوا سەرفرازدەبیت.

ئەی ڕۆڵە

چەندت دەوێ بژی، لە کۆتایدا هەر دەمریت، هەروەها کێت دەوێت خۆشت بوێت، چونکە لە کۆتایدا هەر لێی جیادەبیتەوە، چ کارێکت پێخۆشە بیکە، چونکە لە کۆتایدا هەر لەسەر ئەو شتە پاداشتت دەدرێتەوە.

ئەی ڕۆڵە

لە ئینجیلدا خوێندومەتەوە کە دەفەرموێت: لەو ساتەوەی مردوو دەخرێتە سەر دارە مەیتەکەوە هەتا ئەو کاتە دەیخەنە گۆڕەوە، خودای گەورە چل پرسیاری لێدەکات، لە یەکەم پرسیاریاندا خودا دەفەرموێت: ئەی بەندەکەم، چەندین ساڵە ئەو شتانە خاوێندەکەیتەوە کە بەر دیدی بەدیهێنراوان دەکەون؛ وەك ماڵ و ئۆفیس و ئۆتۆمبیل، بەڵام یەك کاتژمێر ئەو جێگایەت پاکنەکردەوە کە بەر دیدی من دەکەوێت ئەویش دڵە- لە کاتێکدا ئێمە هەموو ڕۆژێك تەماشای دڵت دەکەین. پاشان خودا دەفەرموێت: سەرقاڵی چیت بۆ خەڵك، لە کاتێکدا بەو فەڕ و پیتە داپۆشراویت کە من ڕژاندومە بە سەرتدا؟

ئەی ڕۆڵە

زانستێك ئەمڕۆ لە تاوان دورتنەخاتەوە و هەڵتنەنێت بۆ خوداناسی، ئەوا سبەینێش لە ئاگری دۆزەخ دورتناخاتەوە. وزەو توانات بدە بە ڕووح و شکست و بێهێزیش بە نەفس، مردنیش بدە بە جەستە، چونکە هەواری تۆ گۆڕە و خەڵکی گۆڕستان هەموو ساتێك چاوەڕێی هاتنت دەکەن.

ئەبوبەکری سدیق خودای لێ ڕازی بێت دەڵێت: ئەم جەستەمان، یان ئەوەتا قەفەزی باڵندەیە یان مۆڵگەی ئاژەڵان.

دەگێڕنەوە جارێك پەرداخێك ئاوی ساردیان بۆ شێخ حەسەنی بەسری هێنا، بەڵام هەر کە پەرداخەکەی گرتە دەست لە هۆش خۆی چوو لە دەستی کەوتە خوارەوە، کاتێك هاتە هۆش خۆی پێیان وت: ئەوە چیت بەسەرهات باوکی سەعید؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: ئاواتەکەی دۆزەخیەکانم کەوتەوە یاد، کاتێك بە بەهەشتیەکان دەڵێن: نەختێك ئاومان بەسەردا برژێنن.

ئەی ڕۆڵە

لە ئامۆژگاریەکانی لوقمانی حەکیم بۆ کورەکەیدا بینراوە وتوێتی: ئەی کوڕە ئازیزەکەم با کەلەشێر لە تۆ زیتەڵتر نەبێت، ئەو لە بەرەبەیاندا بقوقێنێت و تۆش خەوتبێت.

ئەی ڕۆڵە

هەرچی کە دەیکەیت و دەیڵێیت و هەرچی کە نایڵێیت و نایکەیت پێویستە بە پێی یاسای شەرع بێت. پێویستە لەسەرت گوفتار و کردارەکانت لەگەڵ شەرع ڕێکبکەون، چونکە زانست و کارکردن بەبێ پشت بەستن بە شەرع گومڕایی لێدەکەوێتەوە. زمانی بێپێوەند و دڵی بێئاگا و پڕ لە ئارەزوو، نیشانەی بەدبەختیو نەگریسیە. هەتا نەفسبە تێکۆشانی ڕاستەقینە نەکوژیت، دڵت بە نوری مەعریفە نابوژێتەوە. هەروەها بزانە هەندێك شت بە قسە و نوسین وەڵامنادرێتەوە، مەگەر ئەوەی خۆت پێیانە بگەیت و بیانچێژیت. ئەگەر نا زانین یەکێکە لە شتە مەحاڵەکان، شتێك نییە بە وتن بەڵکو دەچێژرێن، هەر شتێکیش بۆ چەشتن بێت، بە قسە ناوترێت.

یەکەم پرسیار دەڵێیت ئەو کەسانەی ڕیگای خواناسیان گرتوەتە بەر، چییان لەسەرە؟

لە وەڵامدا دەڵێین چوار شت لەسەریان ئەرکە:

١- بیروباوڕێکی ڕاست و دروست بە بێ بیدعە.
٢- تەوبەی ڕاستەقینە و نەگەڕانەوە سەر تاوانکان.
٣- ئاشتکردنەوەیی دوژمن و ئەوانەی ناکۆکیت هەیە لەگەڵیان، تا مافی کەست بەسەرەوە نەمێنێت.
٤- بەدەستهێنان و فێربونی زانستی شەریعەت، بەو ئەندازەی پەیڕەوی فەرمانەکانی خودای پێدەکرێت.

دەگێڕنەوە گە پێشەوا شبلی خزمەتی چوارسەد مامۆستای خۆی کردووە و فەرمویەتی: چوار هەزار فەرمودەم خوێندوە، لە نێوان ئەم چوار هەزار فەرمودەیە تەنها سەرنجم لای یەکێکیان

بووه و سەرفرازی خۆم تێدا بینیوه، هەروەها سەرجەم زانستەکانی هەردوو دونیام تێدا بینیوه، ئیتر هەر ئەوەم بەسبوو. فەرمودەکەش ئەمەیە، کە پەیامبەری نازدار دەفەرموێت: بە ڕادەی مانەوت لە دوونیا، کار بۆ دوونیا بکە، هەروەها بە ڕادەی مانەوت لە قیامەت، کار بۆ قیامەت بکە بە ڕادەی پێویستیت بۆ خودا کار بۆ خودا بکە، بە ڕادەی ئارامگریت لەسەر ئاگر، کار بۆ جەهەنم بکە.

ئەی ڕۆڵە

سەرنجی ئەم چیرۆکە بدە: حاتەمی ئەصەم یەکێك بوو لە هاوەڵانی شەقیقی بەصری، ڕۆژێك شەقیق پرسیاری لێکرد ئەم سی ساڵە تۆ هاوڕێی منیت، چیت لەم هاوڕێیەتیەوە دەستگیر بوو. ئەویش لە وەڵامدا وتی: هەشت شتی بەسوود وەك زانست وەرگرتووە. شەقیقیش وتی ئەو هەشت شتە چین، حاتەمیش لە وەڵامدا وتی:

سودی یەکەم: لە بەدیهێنراوانم ڕوانی بینیم کە هەموویان خۆشەویست و دڵدارێکیان هەیە ئاوێزانی بوون، جا هەندێکیان تا مەرگ و هەنێکێکیتریان تا گوێی گۆڕ لەگەڵی دەچوون، هەموویان دەگەڕانەوە جگە لە کاری چاکە. لەبەر ئەوە بیرمکردەوە  کە کاری چاکەم کرد بە خۆشەویستی خۆم تا بێتە چرای ناو گۆڕز

سودی دووەم: هەندێك لە بەدیهێنراوەکانم بینی کە شوێن هەوا و ئارەزوەکانیان دەکەوتن، بەرەو خواستەکانی نەفس پەلەیان بوو، جا لەم فەرمایشتەی خودا وردبوومەوە: جا ئەوەی لە پایەو شکۆی پەروەردگاری ترسابێت و حسابی بۆ کردبێت و جڵەوی نەفسی خۆی گرتبێتەوە  ئەوا هەر بەهەشت جێگای مانەوەیەتی. لەبەر ئەوە قورئانم هەڵبژارد بۆ دژایەتی نەفسم، بۆ ڕوبەڕوبونەوە نەفسم ئامادە سازیم کرد.

سودی سێیەم: بینیم هەموو خەڵك هەوڵ بۆ کۆکردنەوەی ژیانی دوونیا دەدەن و بە توندی دەستیان پێوە گرتتوە، جا دوبارە بیرم لەم فەرمایشتەی خودا کردەوە کە دەفەرموێت: ئەوەی لای ئێوەیە و بە ئێوە بەخشراوە تەواو دەبێت و کۆتای دێت، بەڵام ئەوەی لای خودایە هەرگیز کۆتایی نایەت. دوای ئەوە زۆربەی سامانەکەم بەخشی بە هەژاران.

سودی چوارەم: هەندێك خەڵك وا گومانیان دەبرد کە شکۆ و سەربەرزیان پەیوەستە بە زۆری تیر ە وهۆز و تایفە، هەندێکیتریان بە زۆری ماڵ و سامان و منداڵ، هەندێکیتریان بە پلە و پایە، یان تاڵانکردنی مال و سامانی خەڵك هەندێکیتریان شکۆ و شانازیان بە هەدەردانی مال و سامان دەزانی، منیش بیرم لەم فەرمایشتەی خودا کردەوە کە

دەفەرموێت: بەڕێزترینتان لای خودا ئەوانەن کە زۆرتر لە خواترس و زیاتر فەرمانبەرداری خوان. لەبەر ئەوە منیش تەقوام هەڵبژارد.

سودی پێنجەم: هەندێك خەڵكم بینی کە زەمی یەکتریان دەکر و لە پاشملە باسی یەکتریان دەکرد، بۆمدەرکەوت هۆکارەکەی ئیربردنە بە سامان و خانەوادە و زانستی بەرامبەر، بۆیە بیرم لەم فەرمایشتەی خوداکردەوە کە دەفەرموێت: ئێمە رزق و رۆزیمان دابەشکردووە لە ژیانی دوونیا. بۆمدەرکەوت کە ژیان هەر لە سەرەتاوە لەلایەن خوداوە دابەشکراوە.

سودی شەشەم: خەڵکم دەبینی لەبەر مەبەست و هۆکارێکی دیاریکراو، دوژمنایەتی یەکتریان دەکرد جا بیرم لەم فەرمایشتەی خودا کردەوە دەفەرموێت: بەڕاستی شەیتان دوژمنتانە ئێوەش بە چاوی دوژمن سەیری بکەن. لەبەر ئەوە تێگەشتم نابێت دوژمنایەتی هیچ کەسێکبکەم جگە لە شەیتان.

سودی حەوتەم: بینیم خەڵکی بۆ دابینکردنی بژێوی ڕۆژانە هەوڵی جدی دەدەن بە ڕادەیەك گومانی حەرامی تێدەکەوێت هەر لەبەر ئەمەشە خۆیان سەر شۆڕدەکەن و ئاستی خۆیان نزمدەکەنەوە. جا بیرم لەم فەرمایشتەی خوداکردەوە کە دەفەرموێت: هیچ زیندەوەرێك نییە لەم زەوییەدا کە رزق و ڕۆزی لەسەر خوا نەبێت. لەبەر ئەوە تێگەشتم ڕزق و ڕۆزیم لای خوایە و هەر خۆشی دەستەبەری دەکات. ئیتر سەرقاڵی خودا ناسیبووم.

سودی هەشتەم: بینیم هەرکەسێك پشتی بە بەدیهاتویەکی دیاریکراو بەستوە، هەندێکیان دینار هەندێکیان ماڵ، پیشە و پیشەسازی، هەندێکیتریان بەدیهێنراوی وەك خۆیان، لەبەر ئەوە بیرم لەم فەرمایشتەی خودای گەورە کردەوە کە دەفەرموێت: هەرکەس پشت بە خودا ببەستێت، ئیتر ئەو زاتە بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، بێگومان خوا کار و فەرمان خۆی بەجێدەهێنێت. خوا بۆ هەموو شتێك نەخشەیەکی دیاریکراوی بڕیارداوە. بۆیە ئیتر منیش پشتم بە خودا بەست.

بزانە کە پێویستە ڕێبواری ڕێگەی راست پیرێکی هەبێت؛ مامۆستا و شارەزا و ڕێنمایکاربێت، تاوەکو بە پەروەردەکردنی ڕەوشت و خوە ناشرینەکانی دەربهێنێت و بیانگۆڕێت بۆ ڕەوشتی ڕێکوپێك و جوان.

پاشان پرسیاری خواپەرەستیت لێکردم، خوا پەرەستی سێشتە:

١-  پارێزگاری کردن لە فەرمانەکانی خودا.
٢-  ڕازیبوون بە قەزا و قەدەر و بەشی خودا.
٣-  دەستبەرداربوونی ڕەزامەندی نەفس، لە پێناو ڕەزامەندی خودا.

هەروەها لەبارەی پشت بە خودا بەستن پرسیارت لێکردم:

پشت بە خودا بەستن واتە، لەو شتانەی کە خودای بەڵێنی پێتداوە، باوەر و متمانە بە خودا پتەو بکەیت، واتە بڕوات وابێت ئەوەی کە بۆی دیاریکردویت بە دڵنیاییەوە پێتدەگات، ئەگەرچی هەموو دونیا هەوڵی ئەوە بدەن نەتگاتێ.

ئەی ڕۆڵە

بە هەشت شت ئامۆژگاریت دەکەم لێموەربگرە، بۆ ئەوەی زانستەکەت لەو دوونیا نەبێتە دوژمنت، کار بە چواریان بکەو چواریان بەلاوە بنێ:

ئەو چوار شتەی کە وەلانانیان ئەرکە لەسەرت:

وەلانانی یەکەم:  هەتا دەتوانیت لەسەر هیچ بابەتێك دەمەقاڵە و موناقەشە لەگەل کەس مەکە، چونکە زۆر بەڵا و ناخۆشی تێدایە. تەنها بەمەرجێك گوێ بەوە نەدەیت ئاخۆ گوتەی ڕاست لە سەر زار تۆ دەردەکەوێت یان ئەو، پاشان زیاتر بە تەنهابن نەك لەبەرچاوی خەڵك.

وەلانانی دووەم: ئاگاداری ئەوە بە نەبیتە ئامۆژگار و یادخەرەوە، مەگەر ئەوەی سەرەتا خۆت کار بەو شتە بکەیت کە دەیلێیت، پاشان ئامۆژگاری خەڵکی پێبکەیت.

وەلانانی سێیەم: تێکەڵی کاربەدەستان و دەسەلاتداران نەکەیت، نەشیانبینیت باشترە. چونکە دانیشتن و چاوپێکەوتنیان بەڵایەکی گەورەیە.

وەلانانی چوارەم: دیاری و بەخششی کاربەدەستان وەرمەگرە،  ئەگەرچی بشزانیت کە ڕەوایە و شتێکی حەرام نییە، چونکە چاوبڕینە ئەوان بیروباوەڕت تێکدەدات و بە هۆیەوە نەرمی و لایەنگری و ڕازیبوون بە ستەمەکەیان دێتە دوونیاوە.

ئەو چوار شتەی کە ئەنجامدانیان ئەرکە لەسەرت:

یەکەم: با شێوازی مامەڵەکردنت لەگەڵ خودا، وەك شێوازی مامەڵەکردنی بەندەکەت بێت لەگەڵت.

دووەم چۆنت پێ خۆشە مامەڵەت لەگەڵ بکرێت بەو شێوازە مامەڵ بکە.

سێیەم: ئەگەر زانستێکت خوێندەوە و پێداچونەوەیت کرد، پێویستە زانستێك بێت کە سودی بۆ دڵت هەبێت و ناخت پاکبکاتەوە.

چوارەم: زەخیرەی زیاتر لە ساڵێك پاشەکەوت مەکە.

وەرگێڕانی: ڕەسوڵ سوڵتانی

بەشی یەکەم

ئەو چاودێریانەی منداڵ پێویستی پێیانە

هەرشتێك بە دەستی خولقێنەری مەزنی جیهان دێتەدی، بێ کەمایەسی و بێکەموکووڕیە، کەچی هەر دەگاتە دەست تۆرەمە و وەچەی بەنیادەم گەندەڵ دەبێت. بنیادەم، کێڵگەیەك ناچار دەکات بەرهەمێك پێبگەیەنێت کە تایبەتە بە زەوییەکیتر، دارێك ناچار دەکات، بەری دارێکیتر بگرێت. بە کورتیەکەی بیپرینەوە هەموو شتێك تێکدەدات، وەك بڵێی حەزی لە شتی ترسێنەر و زەبەلاحە، پێی خۆش نییە هیچ شتێك بەو شێوەی بە دەستی سروشت خولقاوە، بە شەقڵ نەشکاوی بمێنێتەوە، تەنانەت ئەو شتە خودی مرۆڤیش بێت.

یەکەم قۆناغی پەروەردە لە هەمووان گرنگترە بە دڵنیایەوە ئەو قۆناغەیە لە ئەستۆی ژندایە، ئەگەر خولقێنەری مەزن بیویستایە بیخاتە ئەستۆی پیاوان ئەوا شیری پێئەدان. هەر لەبەر ئەوەیە ئەبێت لە بابەتە پەروەردەیەکان ڕوو قسەتان لە ژنان بێت، چوون ژنان زیاتر لە پیاوان توانای پەروەردەکردنی منداڵانیان هەیە و لێیان نزیکترن، هەروەرها هەڵسوکەوتیان زیاتر کاریگەری لەسەر منداڵ هەیە. (ئەگەر کوڕێك بێحورمەتی بە باوکی بکات ئەوە شیاوی لێبوردنە، بەڵام ئەگەر بێحورمەتی بە دایکی بکات، واتە حورمەت و پێگەی ئەو کەسە نەپارێزێت کە بە سکی هەڵیگرتووە، شیری خۆی پێداوە، چەندین ساڵ بەخێوی کردوە، دەبێت وەها بونەوەرێکی چەپەڵ لە ڕێوە شاربەدەربکرێت.

ئەو دەمەی لەدایك دەبین، بێهێزین و پێویستمان بە وزە و هێزە، هیچمان نیە و پێویستمان بە ناسین و هەڵسەنگاندن و داوەریکردنە، هەموو ئەو شتانە ساتی لە دایکبوون نیمانە و لە گەورەیدا پێویستمان پێیان دەبێت. لە ڕێگەی پەروەردەوە پێیان دەگەین و دەستەبەریان دەکەین. پەروەردە یان لە سروش یان لە مرۆڤەکان یان لە شتەکانەوە وەردەگرین. سروشت فێری پەروەردەی ناوەکی وزەکان و ئەندامانی لەشمان دەکات، مرۆڤەکانیش فێرمان دەکەن چۆن کەڵك لەو وزە و هێزانە وەربگرین، شتەکانیش لە ڕێی تاقیکردنەوەوە کاریگەریان لەسەرمان هەیە. پەروەردەس سروشت و شتەکان لە دەست مرۆڤ نییە، تەنیا پەروەردەی مرۆڤ لە ژێر کاریگەری و کۆنترۆڵی خۆماندایە.

هیچکات سروشت و عادەت خەسڵەتە بنەڕەتیەکانی و سروشتیەکانی نەفەوتاندوە، مرۆڤ کاتێك لە ڕەوشێکی دیاردا دەژی ئەو حەز و ئینتیمایانەی بەرهەمی خووخدەن، بەڵام هەر دۆخەکە گۆڕا سروشتی دەچێتەوە سەر ڕەوت و بنەڕەتی خۆی.

مرۆڤ هەستیار لەدایك دەبێت، لە ڕۆژی لەدایکبوونەوە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو دیاردە جۆراوجۆرانەی دەوروبەریان تەنیوە. ڕێکەوتنی نێوان ئەم سێ پەروەردەیە مەحاڵە، چونکە ناچارین یان دژی گەوهەر و سروشت ڕاوەستین، یان دژی دابونەریت و ڕێوشوێن و یاسا کۆمەڵایەتیەکان. دەبێت لە نێوان پەروەردەی مرۆڤێکی کامڵ و هاوڵاتیەکی کامڵدا (مافە مەدەنیەکان) یەکێکیان هەڵبژێرین. مرۆڤی سروشتی لە سروشتدا گەورە بووە، هەموو شت هی خۆیەتی، تاکە کەسێکە کە جگە لە خۆی و هاوخوێنەکانی گرنگی بی هیچ کەسێك نادات. مرۆڤی شارستانی تاکێکە بۆ کۆمەڵ، بەها و بایەخی بەو یارمەتی و هاوکاریانەوە بەستراوەتەوە کە بە خەڵکیان دەکات بەڵام ئەو مرۆڤەی لە سروشتەوە پەنای بۆ کۆمەڵی شارستانی هێناوە، ئیتر ئەو مرۆڤە میهرەبان گوێڕایەڵە نییە کە ئیلهامی لە سروشتەوە وەرگرتبوو.

سیستەمی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینە ئەوەیە، کە باشتر و زیاتر بتوانێت گەوهەر و سروشتی مرۆڤ بگۆڕێت و بونی ڕەها و ژیانی سەربەخۆی لێبسەنێتەوە، ژیانێکی سنوردار و بەرتەسکی پێببەخشێت و کەسایەتی تاکی ئەو لە یەکەیەکی هاوبەشدا بتوێنێتەوە. ئەو کەسەی لە نێو کۆمەڵدا هەستە سروشتیەکانی خۆی بپارێزێ و لەسەروی هەموانەوە بێت نازانێ چی دەوێ. نابێتە مرۆڤێکی ڕاستەقینە نە قازانجی بۆ خۆی دەبێ، نە بۆ خەڵك.

ئەمرۆ سیستەمی گشتی و دامەزراوەی پەروەردەیی بە مانا ڕاستەقینەی خۆی لە هیچ کوێ نییە و مەحاڵیشە هەبێت. لە ژیانی کۆمەڵایەتی هەرکەسێك دەبێ بۆ ئەو پلەوپایە پەروەردە بکرێ، کە شیاوێتی. لە میسری کۆندا منداڵ ناچار بوو ئیش و پیشەی باوکی خۆی ڕەچاو بکاتەوە، لانیکەم پەروەردە مانایەکی هەبوو، بەڵام لەم سەردەمەدا کە تەنها پلەو پایە بایەخێکی هەیە بەردەوام پلەی ئیش و پیشە گۆڕانکاری بەسەردادێت، ناکرێ دڵنیابی کە ئەگەر منداڵ بەو جۆرەی شیاوی پلەی باوکێتی پەروەردە بکرێ توشی زیان و خەسار نابێت. گرنگە بەر لەوەی پیشەیەی باوکت بۆی لەبەرچاو گرتووی، دەبێت پیشەی مرۆڤبوون فێربی. بەڕای من ئە کەسەی لە هەمووان زیاتر، بەرگەی ژان و ئازارەکان بگرێ، لە هەمووان باشتر پەروەردەکراوە. کەوابوو پەروەردەی ڕاستەقینە دەبێ زیاتر لایەنی کردەیی هەبێ. (مامان منداڵ دێنێتە جیهان، دایەن بەخێوی دەکا، لەلە پەروەردەی دەکا، مامۆستا وانەی پێدەڵێتەوە.) هێنانە دونیا – گەورەکردن –

پەروەردەکردن – وانەوتنەوە. فێرخوازەکەی ئێمە لەوجۆرە پەروەردەیەدا فێرنەبووە خۆ لەبەر ژان و ئازار و تاڵی و سوێری ڕابگرێ، بەڵکو فێری ئەوەبووە تەنیا خەم و ژان تاقیبکاتەوە.

هێندێك لە باوەڕەكانی کۆنەپەرەستان

تەواوی عەقڵ و باوەڕمان بریتیە لە چەند باوەڕێکی ڕەشۆکیانە، کە کوێرانە شوێنیان کەوتوین. ئەو مرۆڤەی لە کۆمەڵدا دەژی و بە کۆیلەی دەمرێ، کە لە دایك دەبێت دەیکەنە مەلۆتکە و دایدەپێچن ئەو دەمەشی دەمرێ لە کفنی دەپێچن. ئەو کاتەشی لە بەنیادەم دەچێت کۆیلەی سیستەمەکەی ئێمەیە.

دەڵێن هەندێك لە مامانەکان سەری ساواکە ڕێك دەگوشن بۆ ئەوەی بیچمێکی باشتر وەرگرێ، دایبابیش بەوە قایلدەبن، دیارە خوڵقێنەری جیهان کەلەسەری ئێمەی باش نەخولقاندوە و پێویستە مامانەکان لە دەرەوڕا و فەیلەسوفەکانیش لەناوەوە چاکیبکەن. منداڵ هەر کە لەدایکدەبێ خێرا کۆتوبەندی دەکەن؛ مەلۆتکەی دەکەن بە جۆرێکیش دەینوێنن سەری بێجوڵە بێ و لاقەکانیش نەبزوێنێ و هەردوو باسکیشی هاوتەریی جەستەیین. ئەوەندە پەڕوباڵی تێدەئاڵێنن هەر نەتوانێ ببزوێ. لە خۆڕا تورەدەبن، دەڵێن یەەم دەنگێکی لێبیسترا دەنگی گریان بوو، بۆچی وایە؟ لەبەر ئەوەی هەر لەهەمان ڕۆژی لەدایکبوون بە پێچەوانەی ویستی ئەوان دەجوڵێنەوە، یەکەم دیاریەك کە پێشکەشی دەکەن سزاو عەزابە؛ مەلۆتکەکردن و پێچانەوە و دەسرازەیە. ئەگەر منداڵ ئازاد بێت دەبێت بە وریایەوە ئاگاداریبن، بەڵام کاتێك پێچرایەوە و بەستراوە، لە قوژبنێك فڕێی دەدەن و زۆر گوێی نادەنە قیژە و هاوارەکانی. مناڵ لەسەرەتاوە فێری کۆیلەبوون دەکەن. دەبێت یان فەرمانبکات یان گۆڕایەڵ بێت.

هەندێك لە دایکان بە مەبەستی پاراستنی منداڵەکانیان لەو ڕوداوانەی پێویستی سروشتن، منداڵەکانیان زۆر لە تەوەزلی عەیش و نۆشدا نوقم دەکەن، پێیان وایە بەو شێوەیە لەبەردەم ئازار و ژاندا بەهێز و ئامادەیان بکەن، کەچی جەستەیان دەخەنە بەردەم نەخۆشی جۆراوجۆرەوە، کە دواتر لەکاتی باڵغبونیاندا بەرۆکیان دەگرێت. پێویستە دایکان پەیرەوی لە سروشتبکەن، سروشت منداڵ ناچاردەکات خۆڕابهێنن، وەرزشبکەن و میزاجیان ئامادە و بەهێز دەکات تا لەهەمبەر نەخۆشی جۆراوجۆردا خۆڕاگربن، هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ ئێشوئازار ئاشنایان دەکات. منداڵ بەر لەوەی جەستەی شەقڵ بگرێ و پتەو بێ بە ئاسانی گۆڕانکاری وەردەگرێ، چۆنتان پێخۆشە

دەتوانن ئاوا پەروەردەی بکەن، بەڵام کاتێك باڵغ بوو تازە خووی گرتووە گۆڕینی و چاکردنی ئەستەمە.

ئەرکی باوکان

بەم شێوەیە منداڵی پێنج بۆ شەش ساڵان لەناو ژناندا دەژیێ و یا دەبێتە قوربانی ڕابواردن ئەوان یان هی خۆی، بە خەیاڵی خۆیان هەندێك شتیان فێرکردوە کە هیچ لێیان تێناگا، حەز و ئارەزویان لە ناخدا دروستکرد و خەسڵەتە سروشتیەکەیان لەناوبرد. پاشان دەیدەنە دەست لەلە جگە لە خۆناسین هەموو شتێکی فێردەکات. ئەو منداڵە هەم زاڵمە هەم بەشخوراو، بە مێشکێکی پڕ لە زانیاری پەرشو بڵاو و بە جەستەیەکی لاواز فڕێدەدرێتە نێو کۆمەڵگاوە. لەویێ بێکەڵکی و بەدفڕی خۆی دەسەلمێنێت، هەمووان بەداخەوەن بۆ چارەڕەشی و گەندەڵی مرۆڤ. ئەگەر ئەتانەوێت منداڵەکەتان باشترین مرۆڤی لێدەربچێت، وەك چۆن دایك باشترین دایەنە، باوکیش باشترین لەلە و مامۆستایە. دایباب دەبێت لە دابەشکردنی کار و شێوەی بەڕێوبردنیدا ڕێکبکەون. باوکێکی ژیر، ئەگەر زانیاریشی نەبێت لە باشترین و کارامەترین مامۆستاکان باشتر منداڵ پەروەردە دەکات، چونکە هۆگری و خۆشەویستیەکەی قەرەبووی نەبونی زانستەکەی دەکاتەوە. لە حاڵێکدا زانست ناتوانێت جێگەی خۆشەویستی و هۆگری پڕبکاتەوە.

خستنەوەی منداڵ تەنها یەك لەسەر سیێ ئەرکی باوکایەتی بەجێهێناوە، چونکە ئەرکەکانیتر زۆرکردنی منداڵ، پێشکەشکردنی مرۆڤێکی کۆمەڵایەتی بە کۆمەڵگا و کەسانی نیشتیمان پەروەر بۆ نیشتیمان پەروەردە بکات. ئەرکی پەروەردەکردنی منداڵ لەئەستۆی باوك خۆیەتی، نەوەك بچێت کەسێکی بە پارە بۆ بگرێت بۆ ئەوەی پەروەردەی بکات.

هەڵبژاردنی ڕاهێنەر و قوتابی

ئەگەر باوکێك منداڵکەی خۆی پەروەردە نەکات، مامۆستایەکی بۆ هەڵدەبژێرێت، ڕاهێنەری منداڵ دەبێت گەنج بێت، بە مەرجێك ژیر و تێگەشتوبێ. دەبێت یەك زانست فێری منداڵ بکات ئەویش ناسینی ئەرکە کۆمەڵایەتیەکانە، دەبێت کەسێك بێت زیاتر ڕێی نیشانبدات نەوەك فێری بکات، نابێت منداڵ فێری ئەرك و فەرمان بکات بەڵکو دەبێت خۆی بکەوێتە کنە و پشکنین بیاندۆزێتەوە. خەڵکی ناوچەیەك ژیانیان بۆ فەراهەم هاتبێت خەڵکێکی تەمەڵ و تەوەزل دەردەچن، ئەگەر خەڵکێکیش ناوچەکەیان سەخت و ژیانیان پڕ لە کوێرەوەری و نەهامەتی بێت ئەوا خەڵکێکی زەحمەتکێش و ئەهلی بیرکردنەوە دەردەچن.

فێرخواز، مامۆستاکەی وەك پەتای سەردەمی منداڵی دەزانێ، مامۆستاش، فێرخوازەکەی بە بارێکی قورس دەزانێت کە هەتا زووە لە کۆڵی خۆی بکاتەوە. مامۆستا بە گوێرەی پێویست چاوی بەسەر فێرخوازەوە نابێ و فێرخوازیش ئەوەندە گوێی مامۆستا ناکات. بەڵام کاتێك دڵنیابن لەیەك هەوڵدەدەن خۆشەویستیان بۆ یەك بجولێت، فێرخواز شەرمەزار نییە بە گوێی مامۆستاکەی بکات، کە گەورە بێت دەبنە هاوڕێی یەك، مامۆستا بە حەزەوە کاروبارەکانی فێرخوازەکانی جێبەجێدەکات، چونکە دەزانێت ڕۆژێك چێژ لە میوەی ئەو درەختە وەردەگرێ؛ سامانێکە بە قازانجی ڕۆژگاری پیری ئەو دەشکێتەوە.

چەمکی پزیشکی لەبری ئەوەی مەرگمان بۆ وەدوا بخا، هەر لە پێشدا نیشانماندەدا. بەو پێیەی لەبری ئەوەی ژیان و تەمەن درێژبکات کورتیدەکاتەوە. تاقە کەڵکی پزیشکی پارێز و پاکوخاوێنیە. خۆپارێزی زیاتر تایبەتمەندیەکی ئەخلاقیە نەك زانستی.

هەڵبژاردنی دایەن

دیارە ئەگەر دایك خۆی شیر بدات بە منداڵەکەی زۆر باشترە، بەڵام ئەگەر نەلوێ، دەبێ ژنێك هەڵبژێرن، کە لەبارەی دەروونی و جەستەیەوە و ساخ و بەهێزبێ.

یەکەمین چاودێرییەکان مەلۆتکە

منداڵ لەو ساتەوە کە لە دایك دەبێ فێرخوازی سروشتە، نەك شوێنکەوتەی ڕاهێنەر. منداڵ لە کاتی خۆیدا تەڕ و وشکبکرێتەوە، وردە وردە ڕای بێنن، لە ئاوی زۆر سارد و زۆر گەرمیشدا خۆی بشوات، هیچ کات لە چۆڵە پێچ و و دەسراوە کەڵك وەرمەگرن.

پەروەردەی وردە وردەی ڕۆح

گەشەکردنی هزری و ڕۆحی منداڵ دەبێ پێ بەپێی گەشەکردنی جەستەی بێ. پەروەردەی منداڵ هەر لە یەکەم ڕۆژی لە دایکبونیەوە دەستپێدەکات.

منداڵ سەرەتا تەنیا لەگەڵ هەستەکانیانن. ئەوان جگە لە چێژ و ژان و خۆشی و ئازار هەست بە هیچ شتێك ناکەن. تەنیا شتێك کە منداڵ دەبێت خووی پێوە بگرێ، ئەوەیە خوو بە هیچ شتێکەوە نەگرێ. دیارە هەموو شتە نوێیەکان سەرنجی منداڵ ڕادەکێشن، مرۆڤ ئەوەندە لاواز و بێدەسەلاتە لە هەمو شتێکی نەناسراو و نامۆ دەترسێت. ئەو منداڵانەی لە خانووی نوێ و پاکوخاوێندا دەژین کە جاڵجاڵۆکە و حەشەراتی لێ نییە، لە جاڵجاکۆ و حەشەرات و کولە دەترسن جاری واهەیە کە گەورەش دەبن ئەو ترسە هەر

دەمێنێت. هەوڵبدەن منداڵ ببەن بۆ سەیران و دەرودەشت و بیانگێڕن، ناچاری بکەن جێگە بگۆڕێ، بۆ ئەوەی بتوانێ مەوداکان هەڵبسەنگێنێت. پاشان ئەوێ ناسی بیبەنە شوێنێکیتر کە خۆتان مەبەستانە بۆ ئەوەی فریوی هەستەکانیان نەخۆن.

مرۆڤ لەبەر ئەوەی سەرەتا کەمهێزە، یکەم دەنگی لێوە دەبیسترێ دەنگی گریان و ناڵینە، منداڵ دەزانێ چی پبیویستە بەڵام ناتوانێ دەریبێ، هەر لەبەر ئەوەشە بە گریان و قیژە داوای یارمەتی دەکات. هەرکاتێك منداڵ کەلوپەلێکی یاری ویست واباشترە بیبەین بۆلی کەلوپەلەکە، نەوەك کەلوپەلەکەی بۆ بهێنێن.

پەروەردەی ئەخلاقی منداڵ – یەکەم وانە چاونەترسی

منداڵ ئەو دەمەی فێری قسەکردن دەبێت کەمتر دەگری و ئەمەش گۆڕانی سروشتیە، چونکە شێوە ئاخافتنێك جێگەی شێوەیەکی دیکە دەگرێتەوە. لە ڕاستیدا منداڵ هەر ئەوەنە بتوانن نارەحەتی خۆیان دەربڕن، ئیتر بیانویەکیان نییە لە ڕێگەی قاوقیژەوە دەریببڕن، مەگەر ئەوەی ژانەکە ئەوەنە قورس بێت نەتوانێ بە زمانی دەریببڕێ. منداڵ ئەگەر بە تەنها بێت کاتێك ئازاری پێدەگات کەمتر دەیکات بە شین و زارین مەگەر ئەوەی هیواارێ دەنگی دەبیسترێ. کاتێك منداڵ دەکەوێت لە بری ئەوەی بە هەڵپە و شەپازلە لێی بچیتە پێش، خۆت مەشڵەژێنە ئەگەر زانیت کەوتنەکەی هیچ نیە وازی لێبێنە با تەحەمولی ئازارەکەی بکا. ئەگەر زیاتر بە دەوریدا بڕۆی پتر دەترسێ و ئۆقرەیەکەی زیاد دەکا. منداڵ کە دەکەوێت ترسەکەی زیاتر زیانی پێدەگەیەنێت تا ژانەکەی.

پەروەردە و فێرکاریەکەی ئێمە خۆبەزلزان و خراپیەکەی لەوەدایە، هەمیشە شتێك فێری منداڵەکەمان دەکەین، کە خۆیان باشتر دەتوانن فێری ببن. ئێمە ئەو شتە فەرامۆش دەکەین کە پێویستە فێری ئەوانی بکەین.

دەستپێکی ژیانی ئەخلاقی

شتێکیتر وا لە منداڵ دەکات ك پێویستی بە گریان و نوزانەوە نەبێ، هەوڵدان و گەشەی وزەی جەستەیانە. لەبەر ئەوە بەهێزتردەبن کەمتر پێویستیان بەوانیتر دەبێت.سەردەمی منداڵی سەردەمی خۆشی و یاری و چێژوەرگرتنە، بەڵام بە گریان و هەڕەشە و سزادان تێدەپەڕێنن، منداڵی چارەڕەش ئەشکەنجە دەدەن بۆ ئەوەی بەختەوەر بێت، هیچ بیر لەوە ناکەنەوە بەم هەڵسوکەوانە دەیانخەنە کۆشی مەرگەوە. هەوڵبدەن ئەو ساتە خۆشانەیان لێ تاڵ مەکەن کە هەیانە.

ئێمە نازانین بەختەوەری و چارەڕەشی لە جەوهەردا چین؟ بەڵام دەزانین، ئەوەی دەبێتە هۆی چارەڕەشی، نەبونی هاوسەنگیە لە نێوان ئارەزوەکان و دابینکردندا، هێزی خەیاڵ و فەنتازیای ئێمە کە پەرە بە ئارەزوەکانمان دەدا و زیاتر دەینەخشێنێ، شتێکی زۆر مەترسیدارە. لە دوونیا دوجۆر دڵبەستراوی هەیە، یەکێیان بە شتەکانەوە، ئەویتریان بە کەسەکانەوە. دڵبەستراوی بە شتەکانەوە لەبەر ئەوەی لەسەر بنەمای ئەخلاق دانەمەزراوە زیاد بە ئازادی ناگەیەنێ و گەندەڵی لەگەڵ خۆی ناهێنێ. بەڵام چونکە دڵبەستراوی بە مرۆڤەکانەوە پێچەوانەی تەکوزی و دیسپلینە و دەبێتە هۆی بەدیهێنانی چەوتی و گەندەڵی، لەم ڕێگایەوە یەکتر بەرەو گەندەڵێ دەبەن.

زیادەڕەوی لە گوشار خستنەسەر و زێدەڕەوی لە کەمتەرخەمیدا، بە قەد یەك زیانیان هەیە، ئەگەر لە منداڵ بدەن تەندروستی و تەنانەت گیانیشیان دەخەنە مەترسیەوە لەوانەیە چارە ڕەشیان بکەن. ئەڵام ئەگەر هەوڵبدەن هەموو ناخۆشیەکانیان لێدوربخەنەوە، ڕێگەیان بۆ خۆشتر دەکەن لە داهاتوودا چارە ڕەشتر لێقەوماوتربن. واتە ناسك و نازدار و دڵناسکیان دەکەن.

سروشتی مرۆڤ وایە، هەرچی لەبەر دەستێتی و لەژێر دەسەڵاتیدایە، بە هی خۆی دەزانێ. ڕای تۆماس هۆبز تارادەیەك ڕاستە، ئەگەر لەگەڵ چونەسەری ئاوات و ئارەزووەکان، شێوەی دابینکردنیشمان زیاد بکا، هەرکاممان هەوڵدەدەین ببینە سەرۆکی هەمووان. کەوابوو منداڵێك کە حەزی لە هەرشتێك بێت بۆی دەستەبەر بێت، خۆی بە خاوەن جیهان و هەموو خەڵکیش بە کۆیلەی خۆی دەزانێت و ئەگەر ڕۆژێك دایبابی ناچاربن، ئەو شتەی دڵخوازی منداڵەکەیە پێینەدەن، ئەویش کە پێی وایە هەرکات فەرمان بدات هەموو شتێکی بۆ دابیندەکرێ، ئەم خۆبواردنەی دایبابی لە دابینکردنی داواکەی بە یاخیگەری و لاساری دادەنێ. تەواوی ئەو بەڵگە و هۆکارانەی بۆ دەهێننەوە بە بیانویان دەزانێ و بە ناماقوڵیان لە قەڵەمدەدا. پاشان لاسار و بەدفڕ دەبێت و ڕقی لە هەموو کەسێك دەبێتەوە.

خودا منداڵی بەوجۆرە خوڵقاندووە، خۆشبویسترێن و یارمەتیبدرێن، نەك ئەوەی بمانترسێنن و بیانەوێت ئێمە گوێڕایەڵیان بین. ئەگەر ویستتان شتێك بە منداڵەکانتان بدەن، هەوڵبدەن بۆ دابینکردنی پێداویستیەکەی بێت، نەك بۆ ئەوەی وەڵامی داواکەیتان دابێتەوە یان گوێڕایەڵی ئەو بن. بەو شێوەیە وشەگەلی گوێڕایەڵی و فەرمانپێدان دەبێت

لە فەرهەنگەکەی ئەو بسڕنەوە. یەکێك لە پێشنارەکانی جۆن لۆك ئەوەیە منداڵ بدوێنن و بەڵگەی بۆ بهێننەوە، بەڵام بەڕای من ئەو سەرکەوتنەی بەدەستی هێناوە نیشانەی ڕاست و دروستیەکەی نییە. نابێت فەرمانی زارەکی بەسەر فێرخوازاندا بدرێت، لێیانگەڕێن تەنها ئەزموون فێریان بکا.

یەکەمین بنەماکانی ئەخلاقی کۆمەڵایەتی

لەبەر ئەوەی ئێمیل بە دوور لە نۆکەرە گەندەڵ و پەروەردەنەکراوەکان پەروەردە دەکرێ، فێری خودخدەی چەوت و ناشرین بێ، بەڵام ئەستەمە بە تەواوەتی لە هاوڕێی خراپ بپارێزێ.

سەرەتا دەبێ ڕێزگرتن لە مافی موڵکایەتی فێری منداڵ بکرێ، دوای ڕێزگرتن لە ئازادی کەسانیتر. بۆ ئەوەی مافی موڵکایەتی تێبگا و بزانێ چ واتایەکی هەیە، پێویستە سەرەتا خۆی خاوەنی شتێك بێت.

هەڵبەت پێویستە بڵێین منداڵ چ جۆرە ناڕاستیەك دەکەن. بە گشتی ناڕاستی منداڵ دوو جۆرن: یەکێکیان ناڕاستی کردەییە سەبارەت بەڕابردوو، دووەمیان ناڕاستیەك پەیوەستە بە داهاتوو. ناڕاستی یەکەم پەیوەندی بە کردەوەکانی خۆیەوە هەیە لەڕابردوودا؛ یا کردویەتی و حاشای لێدەکات یان نەیکردووە و دەڵێت کردوومە، ئەمجۆرە ناڕاستیە بۆ منداڵ ناسروشتیە، زۆرجار لەژێر هەڕەشەی گەورەکان منداڵان پەنا دەبەنە بەر ئەمجۆرە ناڕاستیانە، لەبەر ئەوە هەڕەشەکردن و فەرمانبەردن کارێکی ناخۆشە منداڵان بە دزیەوە ئەوەندەی بۆیان بلوێ خۆیانی لێدەدزنەوە. ناڕاستی دووەم، لەوەش نا ئاسایتر و ناسروشتیترە. چونکە دروستبوون یان نەبوون بۆ بەڕێوبردنی کارێك لە گرێبەستێك بەملاوە نییە. فکری منداڵان بەرتەسکە و جیا لە ئێستا هیچ نابینن، کەواتە ئەگەر شتێکیان لە ئەستۆگرت ئاگادراری دەرئەنجامەکانی نین. کەواتە منداڵان ناتوانن بەڵێن بدەن. هەر شتێکیان وت دەربارەی ڕابرددو بە ناڕاستی لەسەریان ئەژمار ناکرێت.

وێنەی ئێمیل لەسەردەمی منداڵیدا

ئێمیل ئەو کارەی دوێنێ کردویەتی کاریگەری لەسەر ئیشی ئەمڕۆی نییە. هیچ کات ناکەوێتە ژێر کاریگەری لاسایکردنەوە. هەر قسەیەکی گونجاوو باشی بزانی دەیڵێ و هەر ئیشێکی بە قازانجی بێ دەیکا. کەواتە هەرگیز چاوەڕێی مەبن قسەیەکی وابکا، پێگوتراوە یان کارێکی وا بکا، فەرمانیپێدراوە. هەڵسوکەوت و جوڵەکانی بەردەوام لەگەڵ

مەبەستەکانی گونجاون و کەمتر ڕێدەکەوێت، بەرلەوەی لە سەرکەوتن دڵنیابێ دەست بۆ کارێ بەرێ.

کتێبی سێەم

١٢ هەتا ١٥ ساڵی- پەروەردەی هزری

پێویستە لەم قۆناغەدا ئەوشتانە دیاریبکرێت کە بڕیار وایە فێربکرێت. نابێ هەموو شتێ فێر بکرێ، بەڵکو تەنها ئەو شتانە فێربکرێ بەکەڵکن.تەواوی ئەو حەقیقەت و ڕاستیانە، فامکردنیان پێویستی بە ئەقڵێکی پێگەشتوو و هزرێکی پوخت هەیە بۆ دوایی هەڵگرن، چونکە نەزانیان هیچ زیان ناگەیەنێت، بەڵکو ئەوەی توشی نەگبەتی و چارەرەشیت دەکات تەنیا و تەنیا هەڵکردنە. پێویستە سەرەتا بەرهەستەکان فێربکرێن.

فێرکاری ئەزموونی

دەبێ هەستپێکراوەکان بکرێنە چەمك و واتا، بەڵام نابێت کتوپڕ و بێپێشەکی لە بابەتە هەستپێکراوەکانەوە بۆ باتە ئەقڵانیەکان بازبدەین. نابێ لەبەر قسەی ئێمە شت قبوڵ بکات، بەڵکو دەبێت خۆی پێیبگا و لێڕوونبێتەوە. نابێت فێری زانستەکان بێ، بەڵکو دەبێت بیاندۆزێتەوە. ئەگەر کاریگەری وتە لەبری ئەقڵ بخەنە مێشکیەوە، ئیتر بە پێی ئەقڵ بیرناکاتەوە و دواتریش هەر ڕۆژەی شوێن باوەڕێکی نوێ دەکەوێ.

ئێستا دەبێت بزانین کاری بەسوود چییە

دەبێ منداڵ فێری ئەوە بکرێ، بزانە ئەوەی دەیکا، چ سودێکی هەیە. بەم شێوەیە وای ڕادێنێن، لە خۆڕایی جڵەوی خۆی نەداتە دەستی خەڵك و هەستی داهێنانی خۆی بەهێزتر بکات. هەرکات منداڵ خۆی لەگەڵ منداڵەکانیتر بەراورد کرد دەبێت دوربخرێتەوە، چونکە ئەم بەراوردکرنە جگە لە خۆپەرەستی و ئیرەیی هیچ دەستکەوتێکی نابێ. ئەوندە بەسە خۆی لەگەڵ خۆی بەراورد بکات. لەبەرە ئەوە سودی زیاترە. خوێندنەوەی کتێب زیانی هەیە چونکە تەنیا و تەنیا باسی بابەتێك بکات، کە هیچی لێنازانێت.

کتێبی چوارەم قۆناغی گەنجێتی – پەروەردەیی ئایینی

ئەم قۆناغە، قۆناغی سەرهەڵدانی حەز و ئارەزوەکانە، حەز و ئارەزوەکان لە خۆیاندا خراپ نین، چونکە ئەنگێزەی سەرەکی ژیانمانن. ئەم حەزانە ئاکامی حەز و گرۆیی مرۆڤن بۆ پاراستنی هێشتنەوەی خۆی، کە ئەوەش بەشێکە لە وارسکەی ژیان. تەمەنی بالغبون

بە پێی ژینگە و پێکهاتەی جەستەیی و ڕۆحی منداڵەکە جیاوازی هەیە. شێوەی پەروەردەی منداڵەکەش کاریگەری هەیە لەسەر دواکەوتن یان پێشکەوتنی.

پرسیارێك دێتە گۆڕێ، ئاخۆ دەبێت منداڵ زۆر زوو لەگەڵ نهێنیەکانی سەرجێیکردن و جوتبون ئاشنا بکرێن؟ ڕۆسۆ پێی باشترە، هەتا پێش هەستی کونجکۆڵی منداڵان بگیردرێ و ئەگەر پرسیارێکیان کرد وەڵامیان نەدرێتەوە، بەڵام درۆشیان لەگەڵ نەکرێ. ئەگەر پێویست بوو، هێندەی شتیان بۆ ڕوونبکێتەوە دەبێ بە ڕاوێژێکی شێلگیرانە و ماقووڵ قسەیان لەگەڵ بکرێ. هیچ نابێ بە بێتاوانی و ساویلکەییان پێبکەنین. ئەو قسانەی لە ڕووی گاڵتە و سوعبەتەوە دەکرێن دەبنە هۆی گەندەڵبوونی ئەخلاق.

لە سایەی لاوازیەوە مرۆڤ دەبێتە بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی، ئەگەر مرۆڤ نەبواین هیچ ئەرکێکمان دەرهەق بە مرۆڤەکان نەدەبوو، دەکرێت بڵێین بەختەوەری کاتییە، کەسێك بەڕاستی بەختەوەرە، کە لە دورەپەرێزدا دەژی. چونکە پێویستی بە هیچ کەسێك نییە. کەواتە تەنیا خودای جیهان خاوەن بەختەوەرە ڕەهایە.

ئەگەر ئەتانەوێت گەرای هەستەوەری و سۆز لە دڵی گەنجێکدا دروستبکەن و بەهێزی بکەن و سەرنجی بەرەو چاکە و چاکەکاری ڕاکێشن، نەکەونە بیری ئەوەی بەخستنە رووی دیمەنی فریودەر و درۆینەیی بەختەوەری مرۆیی، بەرزەدەماغی و خۆپەرەستی و پەژارە لە ناخیدا بپشکوێنن. لە پێشدا گەورەیی و مەزنیی کۆشك و جوانی دیمەنەکانی مەهێنە پێش چاوی، مەیبەنە نێو کۆڕ و کۆبونەوە ڕازاوەکان و ڕواڵەتی فریودەری کۆمەڵگەی دەوڵەمەندەکانی پیشان مەدەن، مەگەر ئەوکاتەی لە بێهودەیی و پوچی ئەوانە تێگەشتبێ. هەتا یەکێك خۆی ئازاری نەچەشتبێ، نازانێ ئازار یانی چی. منداڵ ناتوانێ ئەو شتە بێنێتە پێشچاوی خۆی کە خەڵك هەستی پێدەکەن، لەبەر ئەوە جیا لە ژانی خۆی هیچ ژانێك ناناسێ. بەڵام ئەگەر لەگەل یەکەمین گەشەکردن هەستەکان خۆی لە ئاوێنەی مرۆڤەکانیتردا بناسێ، ئەوا بە ناڵەیان خەفەت دایدەگرێ و بە خەم و ئازاریانەوە دەتلێتەوە.

خوێندنی مێژوو

زۆر سروشتیە ئێمیل ئەو دەمەی پێدەێتە نێو کۆمەڵگەوە، حەزدەکا پلەی یەکەم وەدەست بهێنێت. ئەگەر تێینەگەیەنین چ پێگە و شوێنێك شیاوی ئەوە زێدخواز دەبێت، کەوابوو ئێستا کاتی ئەوەیە جیاوازی چینایەتی پێبناسرێ. واتە پلەوپێگەی کۆمەڵایەتی پێنیشانبدرێ.

کتێبی سێیەم: دەربارەی هونەری پەروەردە. - نوسینی: ئیمانوێل کانت.
وەرگێڕان: ئەحمەد کەریم و کۆسار عەبدوڵا.

مرۆڤ تاکە بونەوەرێکە دەبێت پەروەردە بکرێت، مەبەستمان لە پەروەردە ئاگالێبون و دیسپلین و فێرکردن و پێگەیاندنە، بەم شێوەیە مرۆڤ کە ساوایە پێویستی بە سەرپەرشت و فێرخوازە.

ئاژەڵەکان ژیانیان بە غەریزە ڕێکدەخەن، غەریزەکان ئەو زیرەکیە پەنهانەن کە چاودێری هەموو شتێکیان بۆ دەکات، بەڵام مرۆڤ بۆ ڕێکخستنی ژیانی نابێت تەنها پشت بە غەریزە ببەستێت بەڵکو پێویستە بە زیرەکی خۆی شێوازی ڕەفتاری خۆی دیاری بکات. هەرچەندە مرۆڤ کاتێك لە دایك دەبێت و دێتە دونیاوە لە دۆخێکی خامدایەو پێویستە ئەوانیتر ئەمکارەی بۆ بکەن.

هەمیشە نەوەیەك نەوەیەك پەروەردە دەکات. ڕاهێنان ڕێگە دەگرێت لەوەی هەوەسە ئاژەڵییەکان مرۆڤ لە ئامانجەکانی خۆی لایدەبەن کە ئەو ئامانجەش مرۆڤبونە. کێیویبون پابەندنەبونە بە یاساوە، مرۆڤ لە ڕێگەی دیسپلینەوە پابەند دەبێت بە یاساکانی مرۆڤبونەوە. مرۆڤ بە سروشتی خۆی مەیلێکی بەهێزی بۆ ئازادی هەیە و کاتێك لەگەڵ ئازادیدا ڕاهات، هەموو شتێکی بۆ دەکات بە قوربانی، هەر لەبەر ئەمەشە دەبێت دیسپلین لە قۆناغێکی زوودا پەیڕەو بکات، چونکە ئەگەر ئەمە زوو ڕونەدات، ئەستەمە دواتر مرۆڤ بگۆڕێت و ئەوکاتە دوای هەموو ئارەزویەك دەکەوێت. لەبەرئەوە مرۆڤ پێویستە خۆی بخاتە ژێر فەرمانی عەقڵەوە.

دیسپلین هیچ سودێك بەو منداڵانە ناگەیەنێت کە زۆر نازی دایکانەیان دەدرێتێ. ئەو منداڵانە کاتێك بەر جیهانی دەرەوە دەکەون، هەر زوو ڕوبەڕووی بەرهەڵەستی زۆر دەبنەوە و لە هەموو لایەکەوە لێیان دەدرێت. بەتایبەت ئەمجۆرە پەروەردە بۆ شازادەکان زۆر خراپە لەبەر ئەوە ئەوان ئامادە دەکرێن بۆ ئەوەی ببن بە فەرمانڕەوا.

هیچ کەسێك نیە لە گەنجیدا پشتگوێ خرابێت و لە گەورەییدا نەزانێت لە چیدا پشتگوێخراوە، جا پشتگوێخستنەکەی لە دیسپلیندا بێت یان لە کلتوردا. ئەو مرۆڤەی کلتوری نەبێت لە دۆخێکی خامدایە، بەڵام ئەوەی دیسپلینی نەبێت کێویە. نەبونی دیسپلین خراپەیەکی گەورەترە لە نەبونی دیسپلین، دەکرێت ئەو کەسە لە داهاتوودا کلتوری بۆ دروست ببێت بەڵام ئەو کەسەی کێویە ڕزگاربونی بۆ نییە و هەرگیز نەبونی دیسپلین قەرەبوی بۆ ناکاتەوە.

بەم پەروەردەی ئێستاوە مرۆڤ بەتەواوەتی ناگاتە ئامانجی بونی خۆی، مرۆڤەکان هەرچەندە بە شێوەی جیاواز دەژین بەڵام دەکرێت یەکدەستییەك هەبێت لە نێوانیاندا.

ئاژەڵان خۆکارانە و نائاگایانە ئەرکە ڕاستەقینەکەی خۆیان بەجێدەهێنن، مرۆڤەکان پێویستە بەدوای ئەرکە ڕاستەقینەکەی خۆیاندا بگەڕێن، بەڵام ئەمە ڕوونادات ئەگەر تێگەشتنێکی ڕوونیان بۆ ئەرکە ڕاستەقینەکەیان نەبێت.

پەروەردە هونەرە؛ کردەیەکە کە دەبێت بەدرێژایی چەندین نەوە بەرەو کامڵبوون بچێت نەوەیەك کە هەڵگری مەعریفەی نەوەکانی پێش خۆیەتی، زیاتر دەتوانێت پەروەردەیەك سەرپێبخات کە گەشە بە هەموو توانا سروشتیەکان مرۆڤ بە شێوەیەکی دروست و ئامانجدارانە بدات.

ئەوە مرۆڤ خۆیەتی کە پێویستە تواناکانی بەرەو چاکە پەرەپێبدات. پێویستە مرۆڤ خۆی باشتر بکات و خۆی پەروەردە بکات، ئەگەر شەڕانگێزیش بێت، دەبێت ئەخلاق لە خۆیدا دەرکەوت پێبکات. ئەگەر کەسێك لەمە ڕابمێنێت دەزانێت ئەمە کارێکی زۆر قورسە. لە بەر ئەمەشە کە پەروەردە مەزنترین و ئاڵۆزترین گرفتە کە ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە. چونکە بەسیرەت پشتبەستوە بە پەروەردە و پەروەردەش پشت بەستوە بە بەسیرەت. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە پەروەردە هەنگاو بە هەنگاو بە شێوەیەکی خاو بەرەو پێشەوە دەڕوات، چەمکێکی دروستیش لە بارەی شێوازی پەروەردە تەنها لە کاتێکدا سەرهەڵدەدات کە هەر نەوەیەك ئەزمون و مەعریفەی خۆی بۆ نەوەی داهاتوو بگوازێتەوە، هەرکامیشیان پێشئەوەی بیدات بە نەوەی دوای خۆی لەلای خۆیەوە شتێکی بۆ زیاد بکات. ئەوەی لێرەشدا لە هەمووی قورسترە، ئەوەیە کە دەبێت ئەوان شتێك بۆ نەوەکانی داهاتوو دەستەبەر بکەن کە زیاتر بێت لەوەی خۆیان بەدەستیان هێناوە.

پرسیارێك دێتە ئاراوە، ئایا پەروەردەی تاکێك دوبارەکردنەوەی پەروەردەی ڕابردووە؟ لە کوێوە دەست بە گەشەپێدانی تواناکانی مرۆڤ بکەین؟ ئایا لە دۆخە خامەکەوە دەستپێبکەین یان لە دۆخە گەشەکدوەکەوە؟ قورسە وێنای ئەوە بکەین کە چۆن گەشەکردن لە دۆخێکی خامەوە دەستپێکردوە.

لەو ڕوەووە گەشەی توانا سروشتیەکان لە مرۆڤدا خۆبەخۆ ڕونادات بەڵکو هەموو پەروەردە و هونەر سروشت بە غەریزە ئەمەی لە مرۆڤدا چاندووە. یەکێك لە بنەماکانی هونەری پەروەردە کە دەبێت ئەو کەسانەی دەبنە داڕێژەری پلانی پەروەردەیی

لەبەرچاویان بێت، پێویستە منداڵان بۆ دۆخی ئێستا پەروەردە نەکرێن، بەڵکو بۆ دۆخێکی باشتر لە مرۆڤبوون پەروەردە بکرێن. واتە بە شێوازێك بێت لەگەڵ ئایدیای مرۆڤبوون و تەواوی ئەرکە ڕاستەقینەکەیدا گونجاو بێت.

لەمەودوا ڕوبەڕووی دوو ئاستەنگ دەبینەوە:

١- زۆرجار دایباب تەنها گرنگی بەوە دەدەن کە منداڵەکانیان ڕابێنن سەرکەوتووبن.
٢- حوکمەتەکان هاوڵاتیەکانیان وەك ئامرازێك بۆ ئامانجەکانی خۆیان تەماشا دەکەن.

دایباب تەنها گرنگی بە منداڵەکانیان دەدەن، حوکمەتەکانیش بە دەوڵەتەکانیان، هیچیان باشەی جیهان و ئەوکامڵبونەی کە ئامانجی مرۆڤایەتیە بە ئامانج ناگرن. پرسیارێك دێتە ئاراوە، ئتیا ئەو ئایدیایەی کە بۆ جیهان باشترینە، دەکرێت بۆ باشترکردنی ژیانی ئێمە زیانبەخش بێت؟ ئەزمون ئەوەمان فێردەکات کە فەرمانڕەواکان لە هۆشیاندا گرنگی بە باشەی بۆ جیهان نادەن و پش هەموو شتێك بەرژەوەندی دەوڵەتەکەی خۆیان دەوێت ئەوەش بۆ ئامانجی کەسی خۆیانە، ئەگەر بێت پارە بۆ پەروەردە دابینبکەن ئەوە دەبێت لە ژێر ویست و هەژمونی ئەواندا پلانی کارەکە بەڕێوە بچێت. لە باشترین دۆخدا فەرمانڕەواکان تەنها داوای لێهاتووی لە ژێردەستەکانیان دەکەن، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە بتوانێت ژێردەستەکانی باشتر بۆ مەبەستەکانی خۆی بەکاربهێنێت.

پارەو هێز پەروەردەیەکی باش دروستناکەن، بەڵکو لە باشترین دۆخدا تەنها ئاسانکاری بۆ دەکەن. بۆیە دەبێت لە پەروەردەی مرۆڤ ڕەچاوی ئەمخاڵانە بکرێت:

١-دیسپلین بکرێت: ڕێگری لێبکرێت لەوەی دیوە ئاژەڵیەکەی زیان بە مرۆڤایەتی بگەیەنێت.

٢-کلتوری تێدا بچێنرێت: کلتوریش فێرکردن و ڕێنیشاندانە، ئەمەش پەیداکردنی لێزانیە؛ لێزانی بونی توانایەکە کە وادەکات مرۆڤ بتوانت هەموو ئامانجەکانی ڕاپەڕێنێت.

٣-مرۆڤ بکرێتە کەسێکی دانا: ببێتە کەسێکی باش بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی.

٤-فێرکردنی ئەخلاق: مرۆڤ نابێت تەنها فێری لێزانی بۆ هەموو ئامانجەکان بکرێت، بەڵکو دەبێت ئەو توانایەش بەدەست بهێنێت کە بتوانێت تەنها ئامانجە باشەکان هەڵبژێرێت، ئامانجە باشەکایش ئەو ئامانجانەن لای هەمووان پەسەند بێت. لای

زۆربەی خەڵك بابەتی ئەخلاق پشتگوێ دەخرێت. پێویستە منداڵ لە سەرەتاوە فێربکرێت ڕقی لە خراپە بێت، لەبەر ئەوەی خۆی لە خۆیدا شتێکی دزێوە. خودا پیرۆزترین بوونە و تونها ویستی چاکی هەیە. بۆیە داوامان لێدەکات کە چاکەبکەین لەبەر خودی چاکە نەك لەبەر ئەوەی ئەو داوای دەکات. ئێمە کە لە سەردەمی ڕاهێنانی دیسپلینکەر وکلتور و شارستانیەتە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك سەردەمی فێرکردنی ئەخلاق نییە، لەم دۆخەیە هەنوکەییەی مرۆڤەکاندا دەتوانین بڵیین (بەختەوەری دەوڵەتەکان هاوکات لەگەڵ نەهامەتیی مرۆڤەکاندا گەشە دەکات).

ئەوەی زۆر گرنگە تەنها ڕاهێنانی منداڵان گرنگ نییە، بەڵکە ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە فێری بیرکردنەوە بکرێن. تێڕوانینێکی باو هەیە کە پێی وایە شت تاقیکردنەوە لە پەروەردەدا گرنگ نییە و دەتوانین لە ڕێگەی عەقڵەوە حوکم لەسە باشی و خراپی بدەین، بەڵام ئەمە زۆر هەڵەیە ئەزمون ئەومان فێردەکات کە زۆرجار تاقیکردنەوەکان دەرئەنجامێکی تەواو جیاواز لە پێشبینەکانمان نیشاندەدەن. یەکێکیتر لە شتە بێسودەکان ئەوەیە کە هەموو ئەو شتانەی فێری دەبێت، تەنها بۆ تاقیکردنەوە بێت لە داهاتوودا بیری بچێتەوە. مرۆڤ پێویستە تەنها یادگەی بەوشتانەوە سەرقاڵ بکات کە گرنگنگن و پەیوەندیان بەشتە ڕاستەقینەکانی نێو ژیانی ڕۆژانەوە هەیە.

پەروەردە ئاگالێبون و پێگەیاندن لەخۆ دەگرێت" پێگەیاندن دوو دیوی هەیە: ١- نەرێنیەکەی: بریتیە لە دیسپلینێك کە تەنها ڕێگە لە هەڵە دەگرێت. ٢- ئەرێنیەکەی: ئەوەیە کە فێرکردن و ڕێنیشاندان تا ئاستێك دەبن بە دروستکەری بەشێك لە کلتور.

جیاوازی هەیە لە نێوان مامۆستا و پەروەردەکار؛ مامۆستا تەنها ئیشی فێرکردنە، پەروەردەکار ڕێنیشاندەرە، یەکەمیان تەنها بۆ قوتابخانە پەروەردە دەکات، دووەمیان بۆ هەموو ژیان. پەروەردەش دووجۆرە یەکەمیان تایبەت (خێزان)، دووەمیان گشتیە (قوتابخانە). ئەگەر تەنها دایبابان باش منداڵانیان پەروەردە بکردایە، ئەوە پێویستمان بەوە نەدەبوو پارە لەفێرگە گشتیەکاندا خەرجبکەین. زۆرجار پەروەردەی گشتی لە پەروەردەی تایبەت باشترە نەك تەنها لە ڕووی کارامەیەوە بەڵکو لە ڕووی بونیاتی کەسایەتیشەوە، چون زۆرجار دایباب هەڵەکانیان بۆ منداڵەکانیان دەگوازنەوە.

پرسیارێك دێتە ئاراوە، ئایا پێویستە پەروەردە تاکەی بخایەنێت؟ مرۆڤ لەسەر پێی خۆی بوەستێت یان تا کاتێك باڵغ دەبێت یان ا ئەوکاتەی دەبێتە دایباب یان تا ئەوکاتەی تەمەنی منداڵەکەی دەگاتە شانزە ساڵان.

ملکەچبوون یان ئەرێنیە یان نەرێنی. ئەرێنیەکە ئەوەیە کەسێك دەبێت ئەوە بکات کە پێیگوتراوە، چونکە خۆی توانای حوکمدانی نییە و هێشتا تەنها لاسایی ئەوانیتر دەکاتەوە، نەرێنیەکەشی ئەوەیە کە ئەو کارە بکات کە ئەوایتر دەیانەوێت، بۆ ئەوەی ئەوانیتریش بۆی بکەنەوە. یەکێك لە گەورەترین کێشەکانی پەروەردە ئەوەیە چۆن بتوانین ملکەچبوون بۆ کۆتوبەندی یاساکان لەگەل ئازادی تاك کۆ بکەینەوە.

چەند خالێك هەیە دەبێت ڕەچاوی بکەین:

١-منداڵ دەبێت لە سەرەتایی منداڵییەوە ڕێپێبدرێت لە هەموو بابەتەکاندا ئازاد بێت. جگە لەو شتانەی زیان بە خۆی دەگەیەنێت.

٢-دەبێت منداڵ فێربکرێن ئەو کاتە بە ئامانجەکانیان خۆیان دەگەن، کە ڕێگە بەوانیتریش بدەن بە ئامانجەکانیان بگەن.

٣-دەبێت منداڵ فێری ئەوە بکرێت ئەو کۆتوبەندەی بۆیدانراوە، بۆ ئەوەیە بە شێوازێکی تەندروست ئازادیەکەی خۆی بەکاربهێنێت. پاشان بەرپرسیارێتی هەڵبگرێت و بزانێت پێویست ناکات چیتر پشت بە ئاگابونی ئەوانیتر ئەوانیدیکە ببەستێت. منداڵان وابیردەکەنەوە هەروەك ماڵی دایبابیان دەخۆن و دەخۆنەوە بەبێ ئەوەی بەرپرسیارێتی هەڵبگرن.

ڕێبازی پەروەردە دوو جۆرە: جەستەیی و کردەیی.

پەروەردەیی جەستەیی ئەو بەشەی پەروەردەیە کە لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا هاوبەشە.

بیگومان پەروەردەی جەستەی تەنها بۆ پاراستنە. ئەمە دایباب یا خزمەتکار دەیکەن، باشترین کاریش ئەوەیە دایك شیری خۆی بدات بە منداڵەکەی. پاشان قوماتەکردن لە نەتەوە کۆنەکان نابینرێت، ئێمە تەنها لەبەر ئاسودەی خۆمان منداڵ وەك مۆمیاکراوێك قوماتە دەکەین، بۆ ئەوەی شتێکیان لێنەیەت و جەستەیان توشی شێواوی نەبێت، لەکاتێکدا خودی قوماتە کردن دەبیتە هۆی شێواندنی جەستەی منداڵ. هەروەها قوماتەکردن وا دەکات منداڵ بترسێت و کەسێکی داماوی لێدەربچێت. پێویستە لە قۆناغەکانی سەرەتا تەنها پەروەردەی نەرێنی بەکاربهێنرێت و هیچ شتێکی تازە بۆ سروشتی منداڵ زیادنەکەین. پاشان ڕاژەنین بە گشتی کارێکی باش نییە بۆ منداڵ چونکە هۆکارێکە بۆ گێژبوون و ڕشانەوە.

پەروەردەی کردەیی ئەو پەروەردەیە کە مرۆڤ بونیاد دەنێت بۆ ئەوەی بتوانێت وەك هەبویەکی بکەری ئازاد بژی. پەروەردەی کردەیی پەروەردەیەکە بەرەو پێگەیاندنی کەسایەتی. بەم پێیە بێت پەروەرەی کردەیی پێکدێت لە:

پێگەیاندنی میکانیکی: کە گرنگی دەدات بە لێزانی، لەبەر ئەمە ئەوە ئەمە دیداکتیکە و کاری مامۆستایانە.

پێگەیاندنی پراگماتیکی (واقیعی): کە گرنگی دەدات بە دانایی، ئەمەش پەیوەندی بە کاری پەروەردەکارانەو هەیە.

پێگەیاندنی ئەخلاقی: گرنگی بە ئاکار دەدات:

لە یەکەمدا مرۆڤ پێویستی بە فێرگەیە تاوەکو لێزان بێت، لە دووەمیاندا لە ڕێگەی پێگەیاندنەوە دەبێتە هاونیشتیمانی وای لێدەکات لەگەڵ کۆمەڵگە خۆی بگونجێنێ. لە سێەمدا لە ڕێگەی پێگەیاندنی ئەخلاقەوە ئەو بەهایە وەردەگرێت کە ڕەچاوی تەواوی مرۆڤایەتی بکات.

گومانی تێدا نییە و ڕاستیەکەی ئەوەیە کە منداڵی خەڵکانی ئاسایی زیاتر لە منداڵی خانەدانەکان خویان خراپ دەبێت لەبەر ئەوەی خەڵکانی ئاسایی زیاتر بە دەوروخولی منداڵەکانیان دێن، بەردەوام لە ئامێزیان دەگرن و ماچیان دەکەن و گۆرانیان بۆ دەڵێن، ئەوان پێیان وایە بەمە کارێکی باش لەگەڵ ئەو منداڵانەدا دەکەن بەڵام ئەمە بەس گریانیان بۆ زیاد دەکەن.

بە دڵنیایەوە لە تەمەنی بچوکیدا هێشتا چەمکی ڕەوشت لەلای منداڵ گەشەی نەکردوە. خاڵێکی دیکە ئەوەیە دایباب وا بکات منداڵەکەی لە جێی خۆیدا نەجوڵێت، بەڵام ئەمە تەنها ڕق ئەستورێکەی منداڵەکە زیاد دەکات و تورەی لە ناخیدا دروست دەکات. زۆر سەیرە دایباب پاش ئەوەی بە شوڵێك لە منداڵەکەیان دەدەن پاشان داوا لە منداڵەکەیان دەکەن دەستیان ماچ بکەن- ئەمەش هۆکارێکە وا دەکات منداڵەکان بە ساختەکردن و درۆکردن ڕابێن. پێویستە پەروەردە ڕێگە لە ناسکبونی منداڵان بگرێت، توندوتۆڵیش پێچەوانەی ناسکیە. جێیەکی ڕەق و توندوتۆل لە جێیەکی نەرموشل. لاواندنەوە و نازهەڵگرتنی زۆریش هیچ باشتر نییە لەو پەروەردە ڕەقە ئەمە سەرەڕۆی منداڵەکە زۆرتر دەکات و فێری فێڵبازی دەکات.

هیچ گرنگی بە گریانی منداڵان مەدەن و لەو کاتانەدا مەچن بە دەمیانەوە کە دەیانەوێت شتێك بە گریان و هاوار بەدەست بهێنن. ئەوە شتێکی زۆر باوە کە بە منداڵان دەگوترێت عەیبە، ئەوە کارێکی باش نییە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك لە قۆناغی یەکەمی منداڵدا نابێت ئەم وشانە بە منداڵ بگوترێت.

یەکێکیتر لە ڕەخنەکان، کانت لەبری ئەو توانا سروشتیەی کە منداڵکە هەیەتی سود لە ئامرازی دەستکرد وەرگیراوە ئەمەش زیان بە توانای منداڵەکە دەگەیەنێت. پێویستە پەروەردە ڕێگە لە ناسکبوونی منداڵ بگرێت.

ڕۆسۆ دەت: هەرگیز پیاوێکی مەزنت نابێت هەتاوەکو منداڵێکی چەقاوەسوت نەبێت. ڕەنگە کوڕێکی سەرەڕۆ زیات توانای ئەوەی هەبێت کە ببێتە پیاوێکی باش هەتاوەکو منداڵێکی زیرەك.

پێگەیادتی فیزکی و پێگەیاندنی ڕۆحی: پێگەیاندنی ئەخلاقی ڕۆح تەنها ئازادی بە ئامانج دەگرێت، بەڵام پێگەیاندنە فیزیکیەکە سروشت بە ئامانج دەگرێت. دەکرێت منداڵ لە ڕووی فیزیکیەوە زۆر گەشەکردوو بێت و ڕۆحێکی باشی هەبێت بەڵام لە ڕوی ئەخلاقیەوە باش گەشەی نەکردبێت، بونەوەرێکی شەڕخواز بێت.

دەکرێت تۆ سەرقاڵبیت ب یاریکردنەوە ئەمەش پێیدەوترێت پشوو، بەڵام دەکرێت لەژێر کۆتوبەندیشدا سەرقاڵ بیت ئەمەیان پێیدەگوترێت کار. چەندین پلانی جۆراوجۆر پەروەردەیی بە ئامانجی دڵنیابونەوە لە ناسینیی باشترین ڕێگە بۆ پەروەردەکردن دارێژراون، لە نێو ئەو ڕێگانەشدا یەکێکیان ئەوەیە ڕێگە بە منداڵ بدەین هەموو شتێك لە ڕێگەی یاریکردنەوە فێربێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا منداڵ دەبێت فێری کارکردن بێت. خۆ لە خۆیدا کارکردن چالاکیەیکی چێژبەخش نییە بەڵکو ئێمە لە پێناوی ئامانجێکیتردا کاردەکەین، زۆر پێویستە منداڵ فێری کارکردن بێت، چونکە مرۆڤ تاکە گیانەوەرێکە کاربکات. مرۆڤیش دەبێت ئەوەنە سەرقاڵ بێت بە هیچ شێوەیەك ئاگای لە خۆی نەمێنێت، باشترین حەسانەوە حەسانەوەی دوای کارکردنە.

توانا نزمەکان هیچ بەهایەکیان نییە، بۆ نمونە ئەو مرۆڤەی یادگەی بەهێزی هەی، بەڵام توانای حوکمدانی نییە تەنها فەرهەنگێك زیاتر هیچیتر نییە. تێگەشتن مەعریفەیەکی هەمەکییە بەڵام توانای حوکمدان بەکارهێنانی مەعریفەی هەمەکییە بۆ دۆخە هەندەکیەکان. بۆ نمونە ناچارکردنی فێرخوازەکان بۆ لەبەرکردنی وتارەکان کارێکی بێسودە. خراپترین شت ئەوەیە منداڵان ڕۆمان بخوێننەوە ئەمەش بە دیاریکراوی لەبەر ئەوەی

بۆ هیچ شتێك بەكاریناهێنن. هەروەها منداڵ كاتێك ڕۆمان دەخوێنێتەوە لە نێو ڕوداوی ڕۆمانەكەدا كۆمەڵێك هەلومەرج و ڕوداووی دیكە بۆ خۆیان دروستدەكەن بەمەش دەكەونە ناو داڵغە لێدان و ئاگاییان نامێنێت.

توانای یادگە بەمجۆرە بەهێز دەبێت:

١- بیركردنەوەی ناوی نێو چیرۆكەكان.
٢- نوسین و خوێندنەوە بەڵام دەبێت خوێندنەوە هاوكات بێت لەگەل تێگەشتن.
٣- لە ڕێگەی فێربونی زمانەوە.

لە گوتنەوەی وانە بە منداڵان پێویستە هەنگاو بە هەنگاو مەعریفە ئاوێتە بە تواناتكان بكرێت. پاشان دەبێت مەعریفە و قسەكردن پێكەوە ئاوێتە بكرێن، هەروەها پێویستە منداڵ مەعریفە لە بیروبۆچون جیابكاتەوە. بەمجۆرە ڕێگە بە تێگەشتن و سەلیقەی دروست خۆشدەبێت.

ئایا پێویستە سەرەتا بواری كرداریی یاساكان فێر ببین لە پێش فێربونی پوختەی یاساكانەوە، یان پوختەی یاساكان پێش تاقیكردنەوە كردەیەكەوە فێر ببین. یان پێویستە هەردووكیان پێكەوە فێربین؟

ئەو ڕێگانە بۆ ئەم مەبەستە پێویستە دەخەینە ڕوو:

١-گەشەپێدانی گشتی تواناكانی ڕۆح كە لە گەشەپێدانی تایبەتی تواناكانی ڕۆح جیاوازە.

أ-فیزیكی: لێرەدا هەموو شتێك لەسەر بنەمای ڕاهێنان و دیسپلینە، منداڵ پێویست ناكات هیچ ماكسیكێك بزانێت.

ب-ئەخلاقی: لەم حاڵەتدا لەسەر بنەمای دیسپلین دانەمەزراوە، بەڵكو لەسەر بنەمای ماكسیمە، هەموو شتێك دەشێوێت ئەگەر تەنها لەسەر بنەمای نمونە هێنانەوە و هەڕەشە و سزادان و شتی لەوجۆرانە بێت، تەنها دیسپلینێك دەبێت ئێمە هەوڵبدەین فێرخواز كردەوەكانی لەسەر بنەمای ماكسیمەكانی خۆی بێت نەك لە خوەكانیەوە.

٢-گەشەپێدانی تایبەتی تواناكانی ڕۆح: ئەم بەشە گەشەپێدانی توانای زانین. هەستەوەرەكان، خەیاڵ، یادگە، بەهێزكردنی سەرنجلێدان و دانایی لەخۆ دەگرێت، بە كورتی ئەو شتانە دەگرێتەوە كە بەسەر توانا نزمترەكانی تێگەشتن. منداڵان لە ڕادەبەدەر

توانای خەیاڵیان بەهێزە، لەبەر ئەوە پێویست ناکات بە چیرۆکی پەریان خەیاڵیان فراوانتر بکەین.

بەڵام ئەوەی پەیوەندیدارە بە توانا بالاکانی تێگەشتنەوە، گەشەپێدانی تێگەشتن و توانای حوکمدان و عەقڵ دەگرێتەوە. سەرەتا تێگەشتن بە ناچالاکی دروستدەبێت، ئەویش بە هێنانەوەی نمونەیە بۆ یاسایەك. توانای حوکمدان ئەوە ڕۆشندەکاتەوە کە چۆن تێگەشتن بەکاربهێنین. ئەم توانایە پێویستە بۆ ئەوەی لەوە تێبگەین کە چی فێردەبین و چی دەڵێین. باشتر شت بۆ تێگەشتن ئەوەیە ئەو شتانەی کەسێك دەیەوێت فێریببێت، خۆی بیکات، یان خۆی بەرهەی بهێنێت. بۆ منداڵان پێویست ناکات مەعریفەی عەقڵیان بۆ بگوازینەوە، بەڵکو دەبێت وابکەین خۆیان زانست هەڵبگۆزن.

ئەگەر نازی زۆر بە منداڵ نەدرێت ئەوا چێژ لە چالاکیانە وەردەگرێت کە ئیشی قورسی تێدا نییە، شتانێك بۆ کردنیان پێویستیان بە بەکارهێنانی هێز و بازوە، نابێت منداڵ زۆر ناسك ڕابهێنین. هەروەها نابێت ڕێگە بەین تەنها شتە چێژبەخشەکان هەڵبژێرێت. زۆرجار منداڵان باوکیان ویاتر لە دایکیان خۆشتر دەوێت، ئەویش لەبەر ئەوەی دایکان نازی زیاتر بە منداڵەکانیان دەدەن ئەوەش لە پێناو ئەوەی نەکا لە کاتی بازبازێن و یاریکردن بریندار ببن، بەڵام باوکیان لەگەڵ ئەوەی توندن بەڵام مۆڵەتیان پێدەدەن بازبازێن و ڕاکەڕاکبەن زۆر گوێ بە نارێکی نادەن.

ئارامگرت دوو دیوی هەیە؛ ئارامگرتن یان وازهێنانە لە هیواکان، یان بەدەستهێنانی بوێرێکی نوێیە بۆ ڕوبەڕوبوونەوە. نابێت وا بکەین منداڵان شەرمەزاربن، منداڵان کاتێك شەرمن دەردەچن کە بە وشەی سەرزەنشتکارانە هاواریان بەسەردا بکەین. تەنها لە کاتی درۆکردندا نەبێت نابێت وشەی عەیبە بەکاربهێنن، خودا ئوەو هەستی شەرمەزاریەی بە مرۆڤ بەخشیوە کە دەستبەجێ دوا درۆکردن هەست بکات خیانەتی لە خۆی کردووە، لەبەر ئەگەر دایباب بەردەوام وا بکەن منداڵەکانیان هەست شەرمەزاری بکەن ئەوا هەستی شەرمنی و خۆ بەکەمزانینان تێدا دروستدەبێت.

ئەگەر ڕێگە بە منداڵ بدەین هەموو شتێك بە گریان بەدەستبهێنێت، ئەوا شەڕەنگێز دەبێت، بەڵام ئەگەر لە ڕێگەی پاڕانەوەوە بەدەست بهێنێت ئەوا لاواز دەردەچێت. منداڵ کرۆز دەبن ئەگەر ملکەچی هەموو داواکاریەکانیان بیت، هەروەها زۆر خراپیش پەروەردە دەبن ئەگەر بەردەوام دژی ویست و خواستەکانیان بوەستیتەوە.

گەشەپێدانی ئەخلاق دەبێت لەسەر بنەمای ماکسیمەکان بێت نەك دیسپلین، دیسپلین ڕێگرە لە خووە خراپەکان بەڵام ماکسیمەکان چۆنیەتی بیرکردنەوەمان دیاریدەکەن. بۆ نمونە کاتێك منداڵ درۆدەکات نابێت لەسەر ئەوە سزابدرێت بەڵکو دەبێت سەرزەنشت بکرێت و پێبگوترێت جارێکیتر کەس باوەڕی پێناکات، ئەگەر منداڵ کاری باشی کرد پاداشت بکرێت و کاری خراپیکرد سزابدرێت، فێری ئەوە دەبێت تەنها لەبەر بەرژەوەندی خۆی شتی باش بکات. پێویستە ئەو بیرۆکانەی دەربارەی باش و خراپە هەن هەر لە منداڵیەوە فێری منداڵان بکرێن، ئەگەر کەسێك بیەوێت ئەخلاق بکات بە نمونە نابێت سزا بەکاربهێنێت، لەبەر ئەوە ئەخلاق ئەوەندە بەرز و بالایە کە نابێت بخرێتە استی دیسپلینەوە.

ئەگەر کەسێك بیەوێت کەسایەتی لە منداڵدا دروستبکات، زۆر گرنگە سەرنجیان بۆ پلانێکی دیاریکراو و کۆمەڵێك یاسا ڕابکێشن کە بۆ ئەوان زانراون و پێویستە بە وردی پەیڕەوی بکەن. بۆ نمونە کاتێك بۆ یاریکردن و خەو دیاری دەکرێت، نابێت نە درێژبکرێتەوە نە کورت. ئەو مرۆڤانەی کە یاسایەکی دیاریکراویان بۆ خۆیان دانەناوە کەسانێکی جێمتمانە نین.

بۆ پێگەیاندنی کەسایەتی منداڵ، بەتایبەت فێرخواز، پێش هەموو شتێك گێرایەڵی پێویستە، ئەمەش دوو ڕووی هەیە: یەکەمیان ملکەچبونە بە ویستی ڕەهای سەرکردەیەك. دووەمیان ملکەچبونە بە ویستی سەرکردەیەك کە بە چاك و عەقڵانی ناسراوە. گەر ملکەچبون لە زەبر و زۆنگەوە سەرچاو بگرێت ئەوە ملکەچبونی ڕەهایە، یان دەکرێت لە متمانەوە سەرچاوە بگرێت ئەمەش گوێڕایەڵی خۆویستانەیە. هەندێکجار ملکەچبونی ڕهاش بۆ منداڵ پێویستە. نابێت مامۆستا زیاتر گرنگی بە منداڵێك بدات لەچاو ئەوانیتردا یان مافی زیاتری پێبدات چونکە گەر وابکات ئەوا یاساکە لە گەردونیبون دەکەوێت.

ئەو سزایانەی کە توڕەییان پێوە دیارە، کاریگەریەکی نەخوازراویان هەیە. منداڵان وا تەماشای ئەو سزایە دەکەن کەسزایەکی شەخسیە، ئەمان قوربانی ئەو هەستە کەسیەن. یان دەستماچکردنی دایباب لەوکاتەدا و شتی لەو جۆرە زۆر گەمژانەیە و خووی کۆیلایلاەتی لە منداڵاندا دەچێنێت. ئەگەر سزایەکی فیویکی زۆر دوبارە بکرێتەوە منداڵ کەلەڕەق دەبێت. ئەگەر دایباب لەسەر لاساری سزای منداڵەکانیان بدەن کەلەڕەقتر دەبن. بەڵام کاتێك بە میهرەبانی گلەییان لێبکرێت میهرەبانتر دەبن. ڕەنگە منداڵ تەنها

غەریزە ئاڕاستەی بکات، بەڵام کاتێك گەورە دەبێت دەستبەجێ چەمکی ئەرك لەلای مانا وەردەگرێت.

دووەم بنەمای گرنگ لە بونیادنانی کەسایەتی منداڵدا ڕاستگۆییە، ئەوە تایبەتمەندیەکی بنەڕەتیە و خاڵێکی بنچینەییە بۆ کەسایەتی. ئەو مرۆڤەی درۆ دەکات هەر کەسایەتی نییە و ئەگەر شتێکی باشیشی تێدا بێت هی ئەوەیە خووی پێوە گرتووە. هەندێك منداڵ بە هۆی زیندە چالاکی خەیاڵیانەوە مەیلیان بۆ درۆکردن هەیە. هەرگیز نابێت هەوڵی ئەوە بدەین لە ڕێگەی سزادانەوە وا لە منداڵ بکەین ڕاستیمان پێبڵێت. بێبەشکردنی منداڵ لە ڕێزی خۆت باشترین سزایە بۆ درۆکردن. سزاش دووجۆرە ئەرێنی و نەرێنی. ئەرێنی کەمکردنەوەی ڕێز و خۆشەویستیە، نەرێنیش دەکرێت بۆ تەمبەڵی و نائەخلاقیبوون دابنرێت.

سێیەم بنەما بۆ کەسایەتی منداڵ کۆمەڵایەتیبوونە. منداڵ پێویستە هاوڕێیەتی ئەوانیتر بکات و نابێت هەموو کات بە تەنیا بێت، منداڵ دەبێت خۆیان بۆ شیرینترین چێژی ژیان ئامادە بکەن. مامۆستا نابێت فەزڵی منداڵێك بەسەر منداڵێکیتردا بدەن لەبەر بەهرەکانی. بەڵکو ئەو فەزڵە تەنها لەبەر کەسایەتییەکەی بێت، ئەگەر نا ڕق لە نێوان منداڵەکاندا دروستدەکات کە ئەوەش دژی دروستبوونی هاوڕێیەتیە.

پێویستە منداڵان میهرەبانبن و لە دەربڕیندکانیاندا گەشاوەبن، تەنها دڵێکی شاد دەتوانێت بە چاکە بگەشێتەوە. ئاینێك مرۆڤ خەمبار بکات ناڕاستە، مرۆڤ پێویستە بە دڵێکی شادەوە خودا پەرەست بێت نەك بە ناچاری.

دەبێتس منداڵان تەنها ئەو شتانە فێر بکرێن کە بۆ تەمەنیان گونجاوە، هەندێك لە دایبابن دڵخۆشن بەوەی کە منداڵەکانیان لە تەمەنێکی کەم قسەی لە خۆی گەورەتر دەکات. بەڵام ئەم منداڵانە نابن بە یچ. منداڵ دەبێت وەك منداڵ زیرەك بێت پێویست ناکات کوێرانە لاسایی هەموو شتێك بکاتەوە، منداڵ کە قسەیەکی ئەخلاقیانە بکات کە هی تەمەنی خۆی نەبێت بە تەواوەتی لەسەروو ئەوشتانەوەیە کە ئەو تەمەن دەخوازێت، ئەو منداڵە خەیکی لاسایکردنەوەی ناشیانەی ئەوانی دیکەیە. دەبێ منداڵ تێگەشتنی منداڵانەی هەبێت نابێت هەر زوو لە شوێنی گشتیدا دەربکەوێت، ئەو منداڵانەی بەو شێوەیەن هەرگیز بەسیرەت و تێگەیشتنی ڕوونیان نابێت.

زۆر شتێکی بێمانایە منداڵ بیەوێت بە پێی مۆدێلە تازەکان بڕوات، نابێت بهێڵین مرۆڤ ڕوکەشپەرەست و پوچ بێت و شانازی بە ڕواڵەتیەوە بکات، منداڵ بەوە ڕوکەشپەرەست دەبن کە لە منداڵیەوە بەردەوام پێیان بوترێت زۆر جوانن و جلوبەرگیان زۆر کەشخەیە.

دەربارەی پەروەردەی پراکتیکی:

پەروەردەی پراکتیکی ١- لێزانی. ٢- داناییەکی واقعی. ٣- ئەخلاق دەگرێتەوە.

هەرچی پەیوەندی بە لێزانینەوە هەیە دەبێت لەوە دڵنیاببینەوە کە دەبێت لێزانینێکی وردمان هەبێت نەك ڕووکەش. نابێت وا خۆمان بنوێنین کە شتانێك دەزانین بەڵام دواتر ناتوانین بیکەین.

هەرچی پەیوەندی بە دانایی واقیعیەوە هەیە بریتییە لە هونەری بەکارهێنانی لێزانینمان بە شێوەیەکی کاریگەر. ئەوەی چۆن مرۆڤەکان بەکاربهێنین بۆ ئامانجی خۆمان. شتێکتریش گرنگە هونەری شاردنەوەی خالە لاوازەکانی خۆمان. خۆشاردنەوە لەگەل ناڕاستگۆبوندا مویەکیان بەینە، خۆشاردنەوە شتێکە بە ناچاری هەڵیدەبژێرین. نابێت مرۆڤ شەڕانی بێت بەڵام دەبێت سەر ڕاست و بەهەڵوێست بێت. مرۆڤی بە هەڵوێست دلخۆشە بە جێبەجێکردنی ویستەکانی.

ئەخلاق پەیوەندی بە کەسێتی مرۆڤەوە هەیە (بەرگە بگرە و دانبەخۆتدا بگرە). ئەمە خۆ ئامادەکردنە بۆ میانڕەویەکی ژیرانە. ئەگەر یەکێك دەیەوێت کەسایەتیەکی باشی هەبێت، پێویستە خۆی بەتاڵبکاتەوە لە هەڵچونەکانی، سەبارەت بە بابەتی ئارەزوەکانی مرۆڤ، پێویستە مرۆڤ ئەوە فێربێت کە ڕێگە نەدات ئارەزوەکانی نەگات بە هەڵچون. دەبێت فێری ئەوە ببێت کە بەرگەی نەبوونی شتێك بگرێت کە لێیگیراوەتەوە و نییەتی. بەرگەگرتن واتە خۆڕاگرتن و خۆڕاهێنان لەسەر ئارامگرتن. مرۆڤ پێویستە ڕابێت لەسەر ئەوەی داخوازیەکانی ڕەتبکرێتەوە و بەرهەڵەستی بکرێت و بەو جۆرانە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

عاتیفەبوون بەشێکە لە مەزاج، دەبێت منداڵان خۆیان لە چاوبرسێتی و بێتاقەتی و عاتیفەبوون بپارێزن، عاتیفەبوون هەستیاریە ئەمە تەنها لەو کەسانەدا دەبینرێت کە زۆر هەستیارن، عاتیفەبوون لە دلسۆزی جیاوازە. منداڵان پێویستە لە پارەی خۆیان ببەخشن بە هەژاران ئەگەر لە پارەی خۆیان ببەخشن ئەوە دڵسۆزن بەڵام ئەگەر لەپارەی دایبابیان ببەخشن ئەوە دڵسۆز نین.

ئەو قسەیە دەڵێت (بە هێواشی پەلە بکە) ئاماژەکردنە بۆ چالاکیەکی بێوچان، لەوێدا کەسەکە پەلە بکات بۆ ئەوەی شتێکی زۆرتر فێر ببێت. ئەو پرسیار دێتە پێشەوە ئایا باشتر وایە ئێمە بڕێکی زۆر مەعریفەی جیاوازمان هەبێت، یان بڕێکی کەممان هەبێت، وەڵامەکەی ئەوەیە کەمبزانین بەڵام ئەو کەمە بە وردی بیزانین، نەك زۆر و ڕووکەش بێت.

کۆتا شت دەربارەی دەدوێین، بونیاتنانی کەسایەتیە، ئەمە بریتیی لە خۆیەکلاکردنەوەی ویستەکانمان بۆ کردنی شتێك و پاشان بە ڕاستی جێبەجێکردنی ئەو شتەیە، هۆراس دەڵێت: پیاو ئەوەیە لەسەر بڕیارەکانی سور بێت. کەسێك لە ڕۆژدا بە ڕۆژوو بێت و شەوەکەی لەوە زیاتر بە چێژبردن بباتە سەر ، چۆن دەکرێت بەرەو باشتربوون هەنگاو بنێت. یان کەسێك سزای جەستەیی کەسێك بدات چۆن دەتوانین گۆڕانکاری لە ڕۆحیدا بکەین.

بۆ ئەوەی کەسایەتیەکی ئەخلاقی لە منداڵدا بونیات بنێین، پێویستە ڕەچاوی ئەم سەرنجانە بکەین:

أ: ئەرکەکانی بەرامبەر بە خۆی: پێویستە خۆی لە نێو خۆیدا خاوەنی جۆرێك لە کەرامەت بێت کە دەیکات بە سەرداری بونەوەران، ئەوە ئەرکە لە سەر مرۆڤدا کە ئەو کەرامەتە مرۆییە لە نێو خۆیدا پێشێل نەکات. بەڵام کاتێك مرۆڤ ئەلکهول دەخواتەوە و گوناهی سروشتی دەکات یان لادانی سێکسی دەکات ئەوا ئەو کەرامەتە لە خۆی دادەماڵێت، ئەمەش ئاستی ئاستی مرۆڤ دەهێنێتە خوار ئاستی ئاژەلانەوە، یان کاتێك مرۆڤ چاپلوسی و موجامەلەی ئەوانی دیکە دەکات و هەمیشە ستایشیان دەکات، چونکە بە عەقلی خۆی وا دەزانێت لە ڕێگەی ئەم ڕەفتارە دوور لە کەرامەتەوە خۆی لایان شیرین دەکات، ئەمەش هەر دژ بە کەرامەتی مرۆیی دەوەستێتەوە.

ب: ئەرکەکانی بەرامبەر ئەوانی دیکە: دەبێت ڕێز و حورمەت بۆ مافەکانی مرۆڤ وردە وردە لە تەمەنێکی کەمەوە لە منداڵدا بچێنرێت، ئاگاشمان لەوە بێت کە منداڵ بە کردەیی جێبەجێی بکات. ئەگەر منداڵێك سوکایەتی بە منداڵێکیتر بکات نابێت پێی بڵێین وا مەکە بەلکو پێویستە بە هەمان شێوە ڕەفتاری لەگەڵ بکەین.

پرسیارێك هەیە ئەگەر کەسێك قەرزار بێت ئایا دەکرێت لەبری ئەوە پارەکە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، پارەکە ببەخشێت؟ نەخێر ئەمە دروست نییە، چونکە مرۆڤ ئەگەر بیەوێت شتێکی خێرخوازی بکات دەبێت ئازاد بێت، چەنکە کاتێك یارمەتی هەژارێك

دەدەم ئەوە کارێك دەکەم جێگای ستایشە، بەڵام کاتێك قەرزی کەسێك دەدەمەوە ئەوا ئەرکێك جێبەجێدەکەم.

پرسیارێکی دیکە هەیە ئەوەیە، ئایا هیچ کاتێك درۆی سپی ڕێگەپێدراوە؟ نەخێر هیچ حاڵەتێك نییە کە تێیدا بتوانین وێنای ئەوە بکەین کە پاساو هێنانەوەی بۆ درۆکردن تێیدا شیاوە بە تایبەتیش لەبەر چاوی منداڵاندا.

منداڵ نابێت پڕ لە سۆز و عاتیفە بێت بەڵکو چاك بێت و دەبێت پڕ بێت لە ئایدیای ئەرك. لە ڕاستیدا زۆرکەس هەن بەوە دڵڕەق بوون کە زۆرجار لەبەر میهرەبانییان هەڵخەڵتێنراون. ئەوە بێسودە کە هەوڵی ئەوە بدەین منداڵان لە سروشتی فەزیلەتمەند ببون بگەن، ئەوە گرنگە لەلای خودا ئەوەیە تەنها پێویستە ئەرکەکانی سەرشانمان جێبەجێبکەین، چاکبونیشمان لەگەل هەژاران تەنها ئەرکێکە.

ئیرەیی کاتێك دروست دەبێت کە هانی منداڵەکانمان بدەین کە بەهای خۆیان لە ڕێگەی بەراوردکردنی خۆیان بە کەسانیتر هەڵبسەنگێنن لەبری ئەوە بەهاکانیان هەبێت کە لە چەمکەکانی عەقڵی خۆیانەوە سەرچاوەی گرتبێت. ئەوە هەڵەیە کە خاکەڕایی لەلامان بریتیە لەوەی خۆمان لە کەسانی دیکە بە کەمتر بزانن. جیاوازی نێوان زەلیلی کە مرۆڤ سەرشۆردەکات و خاکەرایی مرۆڤ سەربەرز دەکات.

نابێت لە هیچ بارێکدا ڕێگە بەوە بدات کە منداڵێکیتر تەریقبکاتەوە و شەرمەزاری بکات. هەموو خواستەکانی مرۆڤ یان ناوەکین یان مادیین کە ئەمەی دووەمیان خواستە بۆ وەهم یان چێژ.

خواستەکان بریتین لە: بەرزەفری، تینوێتی بۆ دەسەلات، چاوتێرنەبوون. جۆری دووەم خواستەکان بریتین لە: چێژی سێکس، چێژ بۆ شت، چێژ بۆ ژیانێکی شاهانە. جۆری سێیەم لە خواستەکان بریتین لە: خۆشویستنی ژیان و تەندوستی و پشوو.

بەڵام ڕەزیلەتەکان ئەمانەن: کینە لەدڵی، نزمخوازی، بیرتەسکی.

کینە لەدڵی بریتیە لە: ئیرەیی و ناسوپاسگوزاری و دڵخۆشبوون بۆ نەهامەتی ئەوانیتر. نزمخوازی بریتیە لە : ناعەدالەتی، پەیمانشکێنی، زیادەڕەوی دەگرێتەوە. بیرتەسکیش بریتیە لە: نامیهرەبانی، ڕەزیلی، تەمبەڵی دەگرێتەوە.

فەزیلەتەکانیش سێ جۆرن: یان خۆشتویستراون، یان لە ئەرکەوەن، یان لە پاکێتین.

خۆشویستراوەکان بریتین لە: جوامێری و چاکەخوازی و زاڵبیوون بەسەر خۆدا. ئەرکەکانیش بریتین لە: پاکێتی و لێهاتووی و ئاشتیخوازی دەگرێتەوە. پاکێتیش بریتیە لە: شەرەفمەندی و خاکەڕایی و بەفیرۆنەدان دەگرێتەوە.

ئێستا دێینە سەر ئەو پرسیارەی کە ئایا مرۆڤ بە سروشت لە ڕووی ئەخلاقیەوە باشە یان خراپ؟ وەلام هیچکامیان نییە، چونکە لە رووی سروشتیەوە بە هیچ شێوەیەك مرۆڤ بونەوەرێکی ئەخلاق نییە، تەنها لەو کات بونەوەرێکی ئەخلاق کە عەقڵی بگاتە ئاستی چەمکەکانی ئەرك و یاسا. هەرچەندە مرۆڤ لە بنەڕەتدا هەوەسی بۆ هەموو ڕەزیلیەکان هەیە، بەڵام عەقڵ ئەو بەرەو ئاڕەستەیەکی پێچەوانە دەبات، لەبەر ئەوە مرۆڤ دەبێت لە ڕێی فەزیلەتەوە باش بێت، واتە لە ڕێگەی خۆگرتنەوە، هەرچەندە مرۆڤ بەبێ ئەو هەوەسانە دەبێتە کەسێکی بێگوناه.

منداڵان ناتوانن لە هەموو چەمکە ئایینیەکان تێبگەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا پێویستە فێری هەندێك چەمکی ئاینی بکرێن، پێویستە چەمکەکان نەرێنی بن نەوەك ئەرێنی، ئەوەی وا لە منداڵ دەکات وەك توتی شتەکان بڵێنەوە سودی نییە و تەنها دەبێتە هۆ دروستکردنی تێگەشتنێکی شێویو لە خواپەرەستی. پەرەستنی ڕاستەقینە بۆ خودا بریتیە لە کارکردن بە پێی ویستی ئەو، پێویستە ئاگاداری ئەوەش بین ناوی خودا بەردەوام بە خراپ بەکارنەهێنین، هەروەها چەمکی خودا پڕ بکرێت لە قەدر و ڕێز. دەگێڕنەوە نیوتن هەرکات ناوی خودایان دەهێنا بۆ ماوەیەك دەوەستا و تێڕادەما.

وەرگێڕانی: عەباس جوامێری

چاپی یەکەم : ٢٠٢٣

وەرزی یەکەم

تێڕوانینی مامۆستایانی زانکۆ سەبارەت بە فێرکاری

زۆر لە مێژە کەسانی متمانەپێکراو هاوارینە کە پەروەردەمان بێبەرهەمە و گونجاو نییە، هەموو هەوڵێکیش بۆ چاکسازیدرا، بەڵام هیچی لێبەرهەم نەهات، تەنها گەندەڵی نەبێت. لەم کتێبەدا هۆکارەکانی ئەم تێکشکانە دەبیننەوە. لیپمان و ئاپێڵ هاوڕابوون لە لاوازی پرۆسەی پەروەردە. لیپمان وتارێکی پێشکەشکرد لەسەر لاوازبونی پەروەردە گوتی: پەروەردەکەمان لە هەموو پلە جیاوازەکاندا لە دابەزیندا گەیشتوەتە ئاستێك ئیدی لە دوای ئەوە ڕێگایەك نەماتەوە بۆ دابەزین. ئاپێڵیش ڕایگەیاند کە پەروەردەکەمان ناتوانێت گەشە بە ئاوەز بدات؛ لەبەر ئەوەی تاقیکردنەوە لە هەموو پلەکانیدا جگە لە تاقیکردنەوەی یادەوەری هیچی دیکە نییە.ئاپڵجەخیتیکردوەکە: یەکەمین چاکسازی، ڕێکخستنی ماددەکانی بەرنامەکانە بە پێی بەها زانستیەکان. دووەمیان؛ جێبەجێکردنی ئەم ڕێسایەیە لە زانکۆکان و فەرمانگەکان.

دەبینی کە هیچ مامۆستایەکی زانا تا ئێستاش ئەوەی نەکردووە کە سەرچاوەی خراپیەکە، میتۆدەکانی خوێندنە نەك بەرنامەکانی. بێگومان فێرخواز هیچ لەو شتە پروپوچانە تێناگات کە بەناوی زانست یان ئەدەبەوە پێدەگات، بەشێکی لێوەردەگرێت، دەرخی دەکات و بۆ تاقیکردنەوە ئامادەی دەکات، لە تاقیکردنەوەکە دەینوسێتەوە وەڵامی پرسیارەکانی پێدەداتەوە، دوای تێپەڕبونی سێ مانگ ئەم لەبەرکردنە هەروەك ئەوە وایە هەر نەبوبێت. زانکۆکان مردارەوبوون، مردارەوبوش زیندوو نابێتەوە.

پەروەردە بە واتا گشتیەکەی؛ فێرکاری و پێکهێنانی توانا ئەخلاقی و ئاوازیەکان دەگرێتەوە. زانکۆ بە هیچ شێوەیەك گرنگی بەلایەنی ئەخلاقی نادات، بەڵام لە توای ئاوەزیشدا تەنها گرنگی بە لایەنێك دەدات ئەویش یادگەیە. بیرکردنەوە و هونەری سەرنجدان و شێوازەکانی لێکۆڵینەوە بە تەواوی فەرامۆشکراون، لەبەر ئەوە لە تاقیکردنەوە گرنگی پێنادرێت. هەموو فێرکاری دواناوەندی لە کتێب و هیواکانی فێرگەدا پەستێوراون کە فێرخواز لەبەریان دەکات و بە لەبەر دەیانڵێتەوە. فێرخواز بە ناچاری لەسەر کۆمەڵێك

کتێبی قورس ڕادێت کە لەگەڵ خۆی دەیانهێنێتەوە، بەمەش هەموو دەرگاکانی لەبەردەم دەکرێتەوە، بەڵام ناتوانێت هیچ کارێکی کەسی ئەنجامبدات، هەموو تواناکانی سەبارەت بە لێکۆڵینەوە و داهێنانی لە خۆیدا کوژاندوەتەوە، لە تاقیگەمان کەم نییە بەڵام زۆرجار بە بەتاڵی دەمێنێتەوە.

هەزاران کەس دەبینی کە هەست بە کەموکوری لە پەروەردەدا بکەن، بەڵام باوەڕناکەم بتوانی دە کەس بدۆزیتەوە بەرنامەیەکی ڕاستودروست و بە کەڵك بۆ چاکسازی دابنێت.

وەزیرێکی کۆن کە لە ئەکادیمیای فەڕەنسا ئەندامبووە، دەنوسێت: چەند ساڵێکی کەمی بەسبوو تا گەندەڵی سیستەمەی دابەشکردنی خوێندن دەرکەوت، پێویستە ئەم ڕاستیەی لە ئارادایە قبوڵی بکەین کە سەردەمی وشەکاری کەڵکی ژیانی پێوە نامێنێ، نەوەی ئێستامانکرد بە گەلێکی فێرخواز و خاوەن بڕوانامە، ئەوانیانکرد بە ڕۆبۆت، بەوەش دەڵێن پێشکەوتنی ئاوەز و کۆمەڵایەتی. سی ساڵ زیاترە، بەم وشە کۆن و بێکەڵکنە فریویان داوین: دەرخکردن، لەبەرگرتنەوە، دوبارەکردنەوە، وایلێهات بووە بە هێزێکی نیشتیمانی لەدەستچوو. نوسەر وەك زۆربەی ئەوانیتر نەخۆشیەکەی دەستنیشانکرد، بەڵام بەداخەوە دەرمانی بۆ دیارینەکرد.

دوای ئەوەی بەڕێوبەری کۆلیجی ئیتۆن لەلایەن خۆیان پێشنیاری شێوازی تاقیکاری کردووە، دەڵێت: سودەکانی ئەوەیە کە پێویستی بە مەشقێکی بەردەوام ئاوەز، سەبر و ئارامی، وردبینی، توانای سەرنجدان و زۆربەی توانا بەنرخەکان خەیاڵ هەیە.

بەڕێوبەری ئەو گۆڤارە بڵاویکردەوە، ئەم وتارەی کورتکردوەتەوە و دەڵێ: ئەگەر پرۆگرامی فێرکاری دروستە، ئێمە مەبەستمان نییە باری فێرخوازگران بکەین، ئێستا خەڵك لەسەر ئەوە کۆکن کە چارەی پەروەردەی کۆنیان ناوێت، ئەوەی کە یادگە بە وشەی ئەدەبی و زانستی بارگاوی دەکات.

ئەنجام ئەوەیە ئەگەر میتۆد و پرۆگرامەکان نەگۆڕین، ناکرێ داوا لە مامۆستایان بکەیت ملکەچی پەروەردەیەکی تایبەتبن، مەزاجی ئاوەزیان بگۆڕن.

کامیان بەسودترە، فێرکارییەك لەسەر فێرخوازان خەرجی کەمبێت بەڵام هیچ کەڵکێکی نەبێت، یان فێرکارییەك خەرجی زۆری تێبچێت بەڵام چەند سودێکی هەبێت؟

پەروەردە نزیکەی تاکە ئامرازی پەرەپێدانی کۆمەڵایەتیە کە لەبەردەستی مرۆڤدایە. ئەزمونی جۆراوجۆری زۆر لە وڵاتان ئەو ئەنجامەی نیشانداوە کە پەروەردە دەتوانێت چ

بەرهەمێکی هەبێت، کەواتە ئێمە بێهەستکردن بە خەمێکی قوڵ، ناتەوانین ئەم تاکە هۆکارە ببینین کە ڕێگە بە پێشکەوتنی نەتەوییمان دەدات، بە بەرزکردنەوەی زیرەکی و ئەخلاق، خزمەت بە دابەزاندنی یەکێك و چەواشەکردنی ئەویتر دەدەین. دەبینین چ بەڵایەك بەسەر خوێندندا هاتووە بەراورد بەو چالاکیەی دەتوانێت ئەنجامی بدات.

لێکۆڵینەوەی پەڕلەمان سەبارەت بە چاکسازی لە پەروەردەدا

بۆچی چاکسازی ئەستەم بووە

ئەو لێکۆڵینەوە پەرلەمانییەی چەند ساڵێك بەر لە ئێستا بۆ چاکسازی لە خوێندنی دواناوەندیدا بڵاوکرایەوە، دەیسەلمێنێت هێشتا ئەم بیرمەندانە هەمیشە لە بازنەیەکدا دەسوڕێنەوە و ناتوانن ڕۆحی لاتین تێپەڕێنن.

دەروونناسان لە دوارِۆژدا توشی سەرسوڕمان دەبن، کاتێك دەبینن کۆمەڵێك زانا و خاوەن ئەزمون کۆبونەوەتەوە بۆ ڕاوێژ لەسەر پرسی چاکسازی، کەچی بەبیری هیچکامێکیان نەهاتووە، ئەم پرسە بکات، بە چ ڕێگایەك زانیاریەکان دەگەنە ئاوەز؟

لەم کتێبەدا دەریدەخەین پەروەردە شتێك نییە، تەنیا ئەو هونەرەیە کە دەتوانێت هەست بگوازێتەوە بۆ نەست. هەموو چاکسازیەك لە پەروەردە (زانکۆدا) لەوەدا کورتدەکرێتەوە کە وشە لە جێی وشە دابنرێت. زۆر بە ڕاشکاوی دەڵێم کە زانکۆ بەرەو سیستەمی بەرەو نەزانیەکمان دەبا کە وێنەی نەبووە. ئەگەر سەرپێی چاوێك بەو ڕێگایانەدا بخشێنی کە بۆ چاکسازی خراونەتەڕوو بۆت دەردەکەوێ کە لە جێبەجێکردندا چەن ناکردەیین.

مامۆستایانی زانکۆ زمانە زیندووەکان هەورەك زمانە مردووەکان فێری فێرخوازان دەکەن، تەنیا گرنگیان بە وردەکاری زمان دەدا، زانستەکانیان لەسەر کتێبەکانی خوێندن دەگوتەوە ئەنجامەکەشی هەروەك ئوەبوو کە دەبینن چەند خراپە.

منداڵان ئەرك و ماندوبونی یادگەیان سەروی توانای خۆیان دەوێ، ئەمە وایکردوە هیچ زانیاریەکیان لەسەر ژیان نییە: چونکە هەرگیز کارێکی کەسی و بڕیارێکی کەسی و ویستێکی کەسییان پێنەدراوە.

پرسی چاکسازی پەروەردە زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە ئەندامانی لیژنەی پەڕلەمان گومانیان لێیبوو، ئێمە بانگەشەی ئەوە ناکەیەن کە ئەم چاکسازیە ئەستەمە، لە بەرامبەر ویستی

بەهێز هیچ شتێك ئەستەم نییە. بەڵام پێش ئەوەی بەرێکەوت چاکسازی بکەین، پێویستە یەکەمجار ڕاستی ئەو شتانە بزانین کە دەمانەوێت چاکسازی تێدا بکەین.

ئەڵمانەکان زۆر بە وردبینانە بیریان لیم قسانەی لیبینز کرد کە دەڵێت: پەروەردەیەکی دروستم پێبدە، ڕوکاری ئەوروپات بە کەمتر لە سەدەیەك بۆ دەگۆڕم.

فێرکاری و پەروەردە لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا

لە دیدگای کتێبە مەزن و شکۆدارە (پرۆگرامەکانی پەروەردەی ئەمریکا) بایز بەڕێوبەری قوتابخانەی چارلیۆ دایناوە باس لە پەروەردەی ئەمریکی دەکەین.

مامۆستایان پێیان وایە؛ فێرکاری بەهایەکی نابێت ئەگەر فێرخواز بە کردار ڕاهێنانی پێنەکرێت. ئەزمونی فێرخواز بنچینەی وانەکەیە، کاری مامۆستا ڕێنمایکردنی فێرخوازەکانییەتی بێ ئەوەی حوکمیان بەسەردا بدات، هەموو خەمەکەی ئەوەیە فێرخوازان ئاواتە تایبەتەکان، توانا ئاوەزیەکان، ئەو زیرەکی و بەهرە کەسیەی هەیانە نیشانی بدەن.

لە پشت هەموو ئەمریکیەك کرێکارێك دەبینیتەوە، ئەمریکی بە توانای بەرهەمهێنان و ئەفراندنیاندا بڕیار بەسەر مرۆڤدا دەدەن، بڕوایان وایە بڕوانامە هیچ شەرەفێك بە خاوەنەکەی ببەخشێت.

بیرکردنەوە بەبێ کردار دەتوانێت پەرەر بە خەیاڵبدات، بەڵام ئیرادە فەرامۆش دەکات، ئیراد تەنها لەڕێی کردارەوە دەتوانێت گەشە بکات. ئەمریکیەکان وایدەبینن ئەو کارەی فێرخواز دەیکات بەهایەکی نابێت ئەگەر پێشتر وێنای نەکردبێ و لێیتێنگەشتبێت.

ئەوروپیەکان منداڵەکانیان دەنێرنە فێرگە بۆ ئەوەی شتێك فێربن، بەڵام ئەمریکیەکان دەیانەوێت فێرگە بە تەواوەتی منداڵەکەیان پەروەردە بکات و پێبگەیەنێت، پەروەردەی کار و ئەقڵی ڕەوشتی بکرێن. ئەمریکییەك بە ڕوونی هەست دەکات کە داهاتووی وڵاتەکەی هەموو لە نێو دەستی ئەو ژنەدایە کە سیستم و شێوازەکانی پەروەردە بە منداڵەکەی دەگەیەنێت.

خوێندنی زانکۆ لە فەرەنسا

لە سەردەمی کۆندا  خوێندن لە وانەی لاتینی و یۆنانی هەبوو، ئەویش ب باشی و لەبەرکردنی سەرەتاکانی ئەو زانستانەی ئەوکاتە هەبوون سنوردارکرابوو. فێرخوازان تا

ڕادەیەکی باش لاتینیان دەنوسی و پێویستیان بە هەوڵی گەورە یادگە نەبوو. بەڵام وردە وردە زانستی نوێی بۆ زیادکرا، زانکۆ پێوابوو دەبێ منداڵ ئەم برە زۆرەی زانست لە بیریاندا کۆبکاتەوە پێش ئەوەی بچێتە ناو ژیانەوە، دەرکەوت کە ئەم برە زەبەلاحە منداڵ فێری هیچ ناکات.

لێکۆڵینەوەی پەرلەمان دەریخست نۆ لەسەر دەی فێرخوازان بە بێ پەنابردن بۆ فەرهەنگ ناتوانن ئاسانترین کتێب وەربگێرن.

لە وانەی زانستدا هەمان رێگا پەیرەو دەکرێت، وشە و کتێبە ئاڵۆزە وردەکان لە توێی دڵدا لەبەردەکرێن، لە جیاتی ئەوەی لە وانەی کیمیا فێرخواز وانەیەکی ڕاستەقینەی بەرهەمبهێنن. یادگە لە هەموو جۆرە فێرکاریەك بەکاردەهێنرێت، ئەوە سەرچاوەی تێشکانی ئێمە و سەرکەوتنی بیانییە بەسەرماندا، گەنجەکانمان بە جیاوازی پلەی زانستیانەوە ئەونەیان شت دەرخکردبێت کە زۆر لەوەی بیانیەکان دەرخیانکردووە، بەڵام لە ژیانی واقعیدا زانستیان کەمتر و توانای کاردنیشیان لەوان کەمترە، چونکە تەنها یادگەیان بەکار هێناوە.

بۆچونی زانکۆ لەسەر بەهای گشتی خوێندنەکە

فێرخواز لە فێرگە دەردەچێت  شتی کورتکراوەی زۆری بینیوە وەك مەلزەمەی لای خۆمان، کەم تا زۆر برێکی کەڵەکەبوی جیاوازی بینیوە کە بۆی لێکنەدراوەتەوە، بە گشتی نە دەتوانن بنوسن و نە دەتوانن بخوێنەوە، زۆر بە زەحمەتیش دەتوانن لە مانای جوانی دەقی ئەدەبی کۆن تێبگەن. یەکێکیتر لە کاریگەریە خراپیەکانی ئەم پەروەردەیە، بێباکیە بەرامبەر ژیانی دەرەوە، بە جۆریك فێرخوازان ناتوانن گرنگی بە شارستانیەت بدەن، هەموو شت لە تاقیکردنەوە بترازی بونی نییە.

خوێندنگە ئامادەییەکان

گومانی تێدا نییە کە خوێندنگە ئامادەییەکان سەربازگەیەکی ناچارین، جەستە و ڕوح و ڕەوشتی گەنجانی تێدا شێواوە.

کارگێڕی خوێندنگە ئامادەییەکان: بەڕێوبەر

بەهای شوێنە بازرگانی و پیشەسازیەکان پەیوەستە بە بەهای سەرپەرەشتارەکانیەوە، بۆ خوێندنگەش هەمان شتە، ئەبێ بڕوامان بەوە هەبێت کە بەهای هەر خوێندنگەیەك

پەیوەستە بە بەهای بەڕێوەبەرەکەیەوە، زۆرجار بەڕێوبەرەکان فەرمانی سەروو خۆیان جێبەجێدەکەن و هیچ دەسەڵاتێکیان نییە، مامۆستایان سوکایەتیان پێدەکەن و فێرخوازانیش شەرمیان لێناکەن.

مامۆستایان

زۆربەی زۆری مامۆستایان هونەری وانەوتنەوە نازانن، هەموو شتێك دەزانن تەنها پیشەکەیان یان بەشێك لە زانستی ئەم بەشەیە نەبێت، چاکە لەوەدا نییە کەللەی بە پرسیاری زانستی پڕبکەی، بێئەوەی هۆکارەکانی بزانن، پێویستە فێری بیرکردنەوەیان بکەی نەك تەنها ڕاهێنان بە یادگەیان بکەی، بەڵکو دەبێت بڕیاردان و ئاوەزیشیان لەگەڵیدا بەکاربخەیت. بە ڕاستی مامۆستایان بەشێکی دیاریکراون، وەك سەربارزان و کەسانی یاسایی، ئەوانە لەڕادەبەدەر کۆنەپارێزن؛ شتی نوێیان پێ قەبوڵناکرێت، تەنیا مەگەر لەسەر خۆیانەوە بڕیاری لەسەر بدرێت، چونکە ئەوانە لاسایکەرەوەن، هیچ داهێنانێکیان پێناکرێت تەنیا شتەکان ئاڵۆز دەکەن، ئەگەر یەکێك بیەوێت لەوان جیابێت زۆر بە خراپی لە شتی بێکەڵك تێوەدەگلێت.

خوێندن لە فێرگە ئاینیەکاندا

لێکۆڵینەوە پەرلەمانیەکە  بۆی دەرکەوتووە لەسەرەتاوە فێرگە ئایینیەکان لە خوێندنی سەرەتاییەکانی ئاستیان زۆر دابەزییوە، بەڵام لەم دوایانەدا ئامارەکان سەلماندیان نۆ لەسەر دەی ئەوانەی لە فێرگەکانیانەوە داواکاری بۆ ناوەندی پێشکەش دەکەن لەو فێرگانە وەردەگیرێن. جگە لەوەش تاکە فێرگە کشتوکاڵی لە فەرەنسادا لە دەست ئەواندایە کە وانەی پراکتیکی بەرهەمداریان تێدا دەگوتەوە و سەرجەم خەڵاتەکانیانی پێشبڕکێیان بەدەست دەهێنن.

وەرزی دووەم

چاکسازیخوازان – چاککردنی مامۆستاکان – کەمکردنەوەی کاتژمێرەکانی کار – پەروەردەی ئینگلیزی

چاکسازیخوازان

زۆربەی ئەوانەی لەبەردەم لێکۆڵینەوەدا وتەیاندا، کاتێك داوایان لێکرا کە ڕێگاکانی چارەسەرکردنی ئەم خوێندنە چیە ڕەوانبێژیان نەما. دەرکەوت زۆربەیان توانای

پێشنیاریان بۆ ئەم چاکسازییە نییە و پڕۆژەیەکی گونجاویان پێ نییە. تێبینی دەکرێت ئەو ڕەخنەگرانەی بە توندی ڕەخنەیان لە پەروەردە دەگرت و ناڕازی بوون، لە چاکسازی پەروەردەدا بێتواناترین کەس دەرچوون.

زەحمەتە بە دوای پێشنیارەکەی ژول لیمیتەر بکەون کە ئازادی تەواو لە فێرکاریدا بۆ مامۆستا جێدەهێڵێت. بەشێك لە مامۆستایان ئاواتەخوازن پێشنیاری چاکسازیان بۆ نەکرێت و گۆڕانکاری نەبێت. ناتوانین گۆڕانکاری لە سیستەمی پەروەردەدا بکەین تەنیا ئەو کاتە دەتوانین گۆڕانکاری بکەین کە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی یان بیروڕا ئاینیەکان یان ئەدەب و زمان بگۆڕین.

چاکسازی لە مامۆستایان

گۆڕینی دەستەی مامۆستایان بۆ سەرجەم مامۆستایان پێویستە، بۆ ئەوەی بە دوبارەونەوەدا تێپەڕبن و گۆڕانکاری ڕووبدات.  دو شت هەیە پێویستە بگۆڕدرێت. یەکەمیان لابردنی بڕوانامەی پڕۆفیسۆر، لەبەر ئەوە کێبڕکێ بۆ بەدەستهێنانی ئەم بڕوانامە کاری مامۆستایانی گەندەڵ کردوە، لەوانە پسپۆڕ دروستدەکات، لە کاتێکدا فێرکاری بنەڕەتی و ئامادەیی پێویستی بە پسپۆڕ نییە کتێب لەبەربکات و دوبارەی بکاتەوە، بەڵکو پێویستی بە پەروەردەکارە، باشتر وایە ئەم بڕوانامەیە نەمێنێ مەگەر بۆ کێبڕکێکردنی وانەوتنەووە لە فاکەڵتیەکانی خوێندنی باڵا بیپارێزێت.

کەمکردنەوەی کاتژمێرەکانی کار

ئەم چاکسازیە بە کەڵکە؛ لەبەر ئەوەی بە دڵنیایەوە کە فێرخوازان دوازدە کاتژمێر لە وانەدا دەمێننەوە بێ ئەوەی لە هەموو ئەو کاتەدا کاربکەن، چونکە ئەستەمە دوازدە کاتژمێری بەردەوام ئەقل کاربکات. هۆکاری زۆر مانەوەی فێرخوازان لە ژورەکانی پۆلدا بۆ ئەو ماوە درێژە، تونها لەبەر ئەوەیە دایباب و مامۆستا و سەرپەرەشتیکاران نازانن ژیان لێبکەن و هەوڵی ڕزگاربوون دەدەن لێیان. ئەمەش تاکە هۆکارەبۆ بەندکردنیان لەناو پۆلەکاندا.

پرسی خوێندنی نوێ و خوێندنی پیشەیی

چاکسازی کارێکی ئاسان نابێت ئەگەر گۆڕینی ڕاوبۆچون وبیروڕاکانی پێشنەکەوێت. یەکێك لە وەزیرەکانی پەروەردەی فەرەنسا لیۆن بۆرژوا ویستی چاکسازی بنەڕەتی بکات لە سیستەمی پەروەردەدا، لەگەڵ فێرکاری کۆن فێرکاری نوێی داهێنا ناوی لێنا فێرکاری

نویێ؛ فێرکاری لاتینی و یۆنانی لابرد، لەبری ئەو فێرکاری زمانە زیندوەکانی دانا و وانەی زانستی فراوانکرد، مەبەستی بووکۆمەڵێك گەنج بۆ ژیانی کردەیی بەرهەمهێن ئامادەبکات، بەڵام ئەم خوێندنە نوێیە بە تەواوەتی شکستی هێنا، لەبەر دوو هۆکار، یەکەمیان زانکۆ ئامادکاری نەکردبوو، لەسەر ڕێڕەوی پرۆگرامە کۆنەکە دەڕۆشت، خوێندنی نویێ هەر فێرکارییە کۆنەکە بوو تەنها لاتینی و یۆنانی کەمبوو. دووەمیان مامۆستا کۆنەکان بە تەواوەتی دژایەتیان دەکرد، نەیاندەویست جێگیر بێت. زۆربەی خێزانەکانیش دەیانزانی سیستەمە کۆنەکە گەندەڵ و خراپ بوو بەڵام حەزیشیان لە خوێندنەوە نوێیەکەش نەبوو.

جێی نیگەرانیە کاتێك دەبینین بەشێك لە چینی ناوەڕاست زیاتر و زیاتر پیشەسازی و کارگەکان بەجێدەهێڵن و ڕوو لە پۆستی کارگێڕی دەکەن، بەڕاستی بەداخەوە حاڵی ئەو گەلانە وایە کە پەروەردە تەنها ئەو هۆکارە دەبینین کە لێیەوە منداڵەکانیان بگەیەنەپلەوپایەکانی حکومەت و بیانکەن بە کارمەندی دەوڵەت، توێژەران لەسەر تێبینی ئەم شکست و داخ و پەژارەیە کۆکبوون؛ لەبەر ئەوە وڵات پێویستی بەوانە نییە بە تەنیا لە پلەوپایەکانی دەوڵەتدا کاردەکەن، بەڵکو پێویستی بەوانەیە کە لە ژیانی ئابووری، بازرگانی، کشتوکاڵ و پیشەسازیدا کاردەکەن.

ژێردەستەکان لە ئەنجامی فێرکاری تیۆری و فەرامۆشکردنی خوێندنی پیشەیەوە چیان بەسەردا هاتووە. وڵات پێویستی بە کرێکاری زیرەك و لێهاتووە، نەوەك ڕێزمازان و زمانزان، زانکۆ ئاگای لەوە نییە دونیا گەشەی سەندووە و بەرەو پێش دەچێت. سامان پێشکەوتن بە توێژینەوەی تیۆری تیۆری پەیدا نابێت، بەڵکو بەکارکردن و تێکۆشان دەستدەکەوێت.

پرسی پەروەردە

پرسی پەروەردە زۆر لە پرسی فێرکرای گرنگترە، ئەخلاق و ڕەوشت لە ژیاندا کریگەریەکەیان زۆر لە زانست زیاترە، زانکۆ لە پەروەردەدا شکستی هێناوە هەروەك چۆن لە زانستدا تێکشکاوە. پێویستە ئەو کاتانەی کە فێرخوازان بە دانیشتن لە شارەکاندا بەسەری دەبەن بە شێوەیەکی بەرچاو کەمبکرێتەوە، فێرخوازان پێویستە کاتێکی زۆر لە دەرەوە لە شوێنێکی کراوەدا بەسەربەرن. ئەوەی بیەوێت فەرمانبکات گۆڕایەڵ دەبێتو پێویستە لەسەری یەکەمجار خۆی ملکەچ بێت ئەوجا فەرمان دەربکات.

فێرخوازی ئینگلیز ئازادە، کەی بیەوێت ئەرکەکەی ئەنجامدەدات، هەرچۆنێکی بیەوێت لە فێرگەدا دێت و دەچێت، بەڵام لە ژێر چاودێریدایە. ئەگەر ئەرکەکەی بە خراپی ئینجامدا، ناچارە ئەنجامیبداتەوە. ئەگەر بتەوێت گەنجێك لە ژیاندا پشت بە خۆی ببەستێت، پێویستە تاڕادەیەك بەشێك لە ئازادی پێبدەیت.

پەروەردە لە ئیستادا

لیۆن بۆرژوا کاتێك وەزیری پەروەردە بوو لە ساڵی ١٨٩٠ کتێبێکی بڵاوکردەوە لەسەر پەروەردە. تیایدا ڕێنمای مامۆستایان دەکات: لە پەروەردەدا پشت بە دەروونی منداڵ، لە فێرکاریشدا پشت بە دەروونی گەنج بەستین.

کانت دەڵێت: کاتێك منداڵێك یاسایەکی ڕێزمان بەکارناهێنێت، گرنگ نییە کە دەیخوێنێتەوە یان نا؛ چونکە ئەو نایزانێت. باشترین ڕێگە بۆ تێگەشتن، ئەوەیە کارییێبکەیت.

گەنجی لاتینی بە خوێندنی کتێبەکانی ڕێزمان و فەرهەنگەکان فێری زمانێك دەبێت بەڵام ناتوانێت قسەی پێبکات، بە کتێب فێری فیزیا یان هەندێك زانستیتر دەبێت، بەڵام هەرگیز نازانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ ئامێرێکی فیزیکی بکات. پێویستە لە تاقیگە فێری فیزیابن نەك لە دوو توێ کتێبەکان.

ئامانجی پەروەردە

ئامانجی دروست لە پەروەردەدا پەرەپێدانی ئەخلاق، هەندێك سیفەتی کەسێتی، وەك: داهێنان، گرنگیپێدان، بیرکردنەوە، بڕیاردان، دەستپێشخەری، دیسپلین، ڕۆحی هاوکاری، کۆڵنەدان، ئیرادەو...هتدە. کەواتە کاری پەروەردە ئەوەیە باشیەکان بەهێزتر بکات، دژایەتی خراپیەکان بکات. ئەخلاق و هاوڕێیەتی و خۆشەویستی بە لۆژیك لە کتێبەوە فێرنابن، بەڵکو بە مەشقکردن و ڕاهێنان وەدەستدێن. بلاکی دەڵێت: کەسانێك هەن بە چاوی کراوەوە بە ژیاندا تێدەپەڕ دەبن بەڵام هیچ نابینن، زۆر سەیرە تەماشا بکەین و نەبینین.

پەروەردەی مۆراڵ

پرسێکی سەرەکی کە کاریگەری دوور مەودای لە پەروەردەدا هەیە، بە جۆرێك ناتوانین گرنگی پێنەدەین، کاتێك باس لە پەروەردە و میتۆد و بنەماکانی دەکەین، بەڵکو ناچار دەبین کە وەرزێکی تایبەتی بۆ تەرخان بکەین، ئەویش پرسی پەروەردەی مۆراڵە؛ پێگەی ڕەفتار و سروشت، ئەو پێوەرەیە کە گەلان لە پێشکەوتن و هێزدا پێیدەگەن. گومانی تێدا نییە کە ڕەفتار و ئەخلاق بە پێی کاتەکان و گەلەکان دەگۆڕێت. ڕەنگە یاساکانی ڕەفتار لە ڕەگەزێکەوە بۆ ڕەگەزێکیتر جارجار جیاوازبن، بەم بۆ کاتێکی دیاریکراو و گەلێکی دیاریکراو دەبێت نەگۆڕبن. خێزانی فەڕەنسی لە سەرپەرەشتیکردنی منداڵەکانیدا زۆر لاوازن، خۆشیاندەوێن و سۆزیان لەسەریانە، ئەم سۆز و خۆشەویستیەیان ڕێگرە لەوەی کە بتوانن وەك پێویست بەسەریاندا زاڵبن.

زانستی بیرکاری توانای بیرکردنەوەی ورد بەهێز دەکات، بەڵام توانای بڕیاردانی دروست بەهێز ناکات. ناپلیۆن لاپلاسی کارامەترین بیرکانیزانی سەردەمەکەی خۆی ئەرکدارکرد کە ئیش لە کاروباری کارگێڕیدا بکات، بەڵام سەرکەتوو نەبوو.

پەروەردەکردنی منداڵانی وڵاتە ژێردەستەکان

وڵاتە کۆڵۆنیەکان پڕۆگرامە فێرکاریە خراپەکەمان گواستەوە بۆ ئەو وڵاتە ژێردەستانەی حوکمیان دەکەن. ئەم پڕۆگرامانە ناشرینترین و خراپترین بەرهەمیان هەبوو. پۆل جوبران فەرمانڕەوای هیندی چینی دەڵێت: ئەزمون دەریدەخات کە گەلانی داگیرکەر بە تایبەت گەلی فەڕەنسی، لە پەروەردەکردنی گەلانی ژێردەستە شکستیان خواردووە، لەبەر ئەوە پەروەردەکرنی نەتەوەیەك بۆ نەتەوەیەکیتر کاتێك سەرکەوتوو دەبێت، ئەگەر نەتەوەی

پەروەردەکار توانی نمونە باڵا تایبەتیەکانی خۆی لەبیربەرێتەوە، لە بەرامبەر نەتەوەی فێرخوازدا نمونەیەکی کەمێك باڵاتر لەو نمونە باڵایەی خۆی پێی ئاشنایە دابنێت. زانکۆی هیندی چینی تەنیا گەنجی سەرلێتێکچوی مەترسیداری بۆ سەر ئێمە و نەتەوەکەشی لێدەردەچێت. ئێمە گەشتوینەتە قۆناغێکی ژیان کە گرنگی ئەخلاق لە گرنگی زیرەکی زۆرترە، زیرەکی هیچ بەهایەکی نییە ئەگەر پشت بە هێز و ئیرادە و خۆکۆنترۆڵکردن نەبەستێت.

کتێبی پێنجەم: دەربارەی پەروەردەکردن. - نوسینی بێرتراند ڕەسڵ.
وەرگێڕانی جیهاد محەمەد

چاپی دووەم ٢٠١٩

بەشی یەکەم:

دیکۆرگەرا: واتە بەدوای کەشخەی خۆنواندنەوە و خۆفشکردنەوەیە، هەروەها بە گوێرەی مۆدێلی چینی بەگزادەی خۆیان جلوبەرگیان دەپۆشی، ئەیانزانی کام زۆرانبازی و کام پێشڕكێ ناوبانگیان بۆ دروستبکات.

سودگەرا: ئەم چینە تەنها چاویان لەسەر قازانجە مادییەکانەوەیە.

ئامانجی پرۆسەی پەروەردە کرانەوە و هۆشیارکردنەوەی بیری ناو مێشكی فێرخوازی مۆدێرنە.

دیموکراتەکان باوەڕیان، فێرکردن تەنها لە خزمەتی چینی خۆیانە و لە خزمەتی چینیتریشدا نابن، پێشیان وایە نابێت پەروەردە ڕویەکی ئەبستراکتی هەبێت.

ناکۆکیەك لە نێوان ئەو کەسانەدا هەیە کە بە دوای قازانجی مادیەوەن و ئەوانەشی بەدوای قازانجی هۆشیاریەوەن.

ئایا چەمکی پەروەردە بە واتای پڕکردنی مێشکی فێرخوتز بە ئاوەز و زانینە، یان ئەوەیە کە هۆشمەندییەکیان پێببەحشرێت کە سودمەند بێت. ئامانجی پرۆسەی پەروەردەکردن هۆشیارکردنەوەی بیر و مێشکی فێرخوازە.

بە گوێرەی خواستی سەردەم، هەر نەوەیەك پێویستی بەوەیە لە بواری فێرخوازیدا میتۆدی نوێ بگیرێتەبەر، لە هەمان کاتدا لە پێناو هاوسەنگیدا میتۆدی کۆنیش پەراوێز نەخات.

باس لە دوو چیرۆك دەکات:

چیرۆکی خێزانی منداڵی تارمایی: باس لە منداڵێك دەکات نایەوێت فێری زمانی لاتینی ببێت، دایبابی لە ژورێکدا ئەیبەستنەوە و زیندانی ئەکەن، نان و ئاویشی پێنادەن. یەکێك لە براکانی بە نهێنی نان و ئاوی بۆدەبات، یەکێك لە کارەکەرەکان ئەو نهێنیە دەزانێت و

بۆ باوکی منداڵەکانی دەگێڕیتەوە ئەویش منداڵەکەی سزا دەدات، ئیتر منداڵەکە بۆ ئەوەی لە زیندانی ڕزگاری ببێت بە ناچاری فێری زمانی لاتینی دەبێت.

چیرۆکی چیهۆف: چیهۆف منداڵێکەو دەگێڕێتەوە کە مامی ویستوێتی بەچکە پشیلەکەی فێری ڕاوکردنی مشك بکات، لەبەر ئەوە ڕۆژێکیان مشکێکی بچوکی هێناوەتە بەردەم بێچوە پشیلەکە لەناو ژورێکدا، بەڵام مشکەکە نەگەشتوەتە ئەو دۆخەی خۆڕسکی ڕاوکردنی مشکی لا پەیدا بێت، هیچ ئاوڕێکی لێناداتەوە، مامی چیهۆف سزای بێچوە پشیلەکە دەدات بەڵام بێچوە پشیلەکە فێری ڕاوە مشك نابێت، لەبەر ئەوە مامی دەگاتە ئەو باوەڕەی مشکەکە دەبەنگە. بەڵام پشیلەکە بە گەورەبونی خۆی فێری ڕاوکردنی مشك بوو، هەر مشکێکی دیتبایە چنگ لەسەر شان بە دوایدا ڕایدەکرد. لە کۆتایدا چیهۆف دەڵێت مامم ئەیویست منیش بە زۆر فێری زمانی لاتینی بکات.

بنەمای ڕەتکردنەوەی گوناهی مەسیحی: کاریگەری گەورەی دەبێت لەسەر ڕەوتی گۆڕینی میتۆدی نوێی پەروەردە. بیرۆکەکە ئەوەیە مرۆڤ کە لەدایك دەبێت بە گوناهباری لە دایك دەبێت، مرۆڤ دێتە ژێر بار کە هەر لە بنەڕەتەوە تاوانبار و گوناهبارە. بە پێی ئەم بیرۆکەیەش مرۆڤ بۆ ئەوەی لە گوناە و هەڵەکانی پاك ببێتەوە ئەبێت بەردەوام ئازار و سزای بدەین.

ئەرکی پەروەردە لە بنەڕەتدا بەختەوەرکردنی منداڵ و ڕویەکی گەشی هەبێت بۆ ئایندە، نەك ببێتە ئامڕازێکی پۆلیسی. بە واتایەکیتر پەروەردەکردنی منداڵ بە ڕێگەیەکی پۆلیسیانە ئەبێتە هۆی زیادکردنی ژمارەی پۆلیسەکان لە نێو سیستەمی هەر کۆمەڵگەیەك بە ئامانجی ترساندن و تۆقاندنی مرۆڤەکان، مرۆڤە تاوانبارەکانیش بە میتۆدی پەروەردەی گونجاو ڕەنگە ڕێگە چارەیان بۆ فەراهەم بکرێت. منداڵ سروشتی وایە زوو دەکەوێتە ژێر کاریگەری هاوڕێکانی یان کەسانی لە خۆی گەورەتر.

مۆدێلی کۆنباو سەبارەت بە پەروەردەکردنی منداڵ تەنها جڵەوکردنی حەز و ئارەزوەکانی منداڵ بووە بۆ ئەوەی مرۆڤێکی خاوەن ڕەوشتی باشیان لێببێتە بەرهەم، ئەمە لە ڕاستیدا ڕێگەیەك بووە، هیچ سودێکی بە منداڵ نەبەخشیوە، تەنها ئەوە نەبێت فێری دیسپلینی کردوە بۆ دورکەوتنەووە لە بەدڕەفتاری، بەڵام ئەم ڕێگایە هەرگیز سەرکەوتوو نەبووە بۆ نەهێشتنی دیاردەی بەدڕەفتار و بەدڕەوشتی لای منداڵ. لەبەر ئەوە لە زیهنی منداڵدا هەمیشە حەزی کردوە ئەگەر بەخێوکار و پەروەردەکارەکەی بکوژێت ڕزگار دەبێت لەوەی ڕێگەی لێبگرێت.

٢- ئامانجی پەروەردە:

لای دکتۆر ئەرنۆڵد هەموو ئامانجی پەروەردە لغاوکردنی عەقڵ بووە. بەڵام لای مەسیحیەکان ئامانجی پەروەردە خۆشەویستییە، بەڵام کانت باوەڕی وایە تەنها بە خۆشەویستی، هیچ کردارێك سەد لە سەد نابێت بە بنەمای چاکە. هەروەها پرۆتۆس لای وابووە کە پەروەردە ئەبێت لەسەر بنەمای بەجێهێنانی ئەرك بێت بەرامبەر دەوڵەت، هەڵبەت کۆنفۆشیۆس فەلسەفەکەی وابووە، میهرەبانی یەکەم ئەرك بووە کە ببێتە پێوەر بۆ چاکە.

خاڵی هاوبەشی شارستانێتی گریکی و چاینی:

گریکە کۆنەکان لەسەردەمی زێڕیندا قوتابەکانیان داستانی ئیلیادەی هۆمیرۆسیان لە یەکەم دێڕەوە تا دوا دێڕ لەبەر کردوە.

گریکی و چاینیەکان ڕوانیان بۆ چێژوەرگرتن لە ژیان و جوانی و پیرۆزی یەك چەشن بووە. بەڵام جیاوازیان هەبوە لە ڕووی شارستانێتەوە، گریکەکان چالاکتربون لە چاینەکان بەتایبەت لە لایەنەوە کە بەردەوام لە هونەر و زانستدا تازەگەریانکردوە لەم ڕێگەوە گەشەیەکی باشیان ئەنجامداوە.

شارستانێتی گریك لەسەر کۆیلایەتی هەڵنراوە و شارستانێتی چاینیش گیرۆدەی کەمینەییك بوە لە زانستوانان و زانستپەروەران.

شارستانێتی گریکی دواجار هەر خۆیان لە ناوەوە شارستانێتی خۆیان لەناوبردە بەڵام چاینیەکان لە دەرەوە هێرشیان بۆ براوەوە شارستانیەکەیان وێرانکراوە.

وڵاتی ژاپۆن نیشتیمانپەروەریان کردوەتە ئامانجی بەرزی سیستەمی پەروەردەیان. ئەو کاتەی کەشتی ئەستۆڵی کۆمپرادۆر پردی ڕێگەی چوون بۆ ژاپۆنی دۆزیەوە، ژاپۆنیەکان کەوتنە حاڵەتێکی سەختەوە بۆ برگریکردن لە خۆیان و نیشتمانەکەیان ناچار ئەو میتۆدەیان هەڵبژارد کە لە نیشتیمانپەروەریدا چڕببێتەوە.

یەسوعیە نوێەکان وەك ژاپۆنیەکان کەوتنە هەڵەوە، ئەوەیش ئەوەبوو پەروەردەیان ملکەچی بەرژەوەندی کەنیسەی کاسۆلیکی کردبوو، یەکەم ئامانجیان چاکەی فێرخواز نەبوو، بەڵکو چاکەی فێرخوازیان کردووە بە ئامڕازێك بۆ کەنیسە. زۆرجار بۆ ئەوەی مەبەستی پەروەدە بەدی بهێنن، هونەریشیان خستبوە ژێر سۆزەوە.

لە دوای جەنگی واترلۆوە جیهانی نویٚ پێویستی بە جۆرێکیتر لە مرۆڤ هەبوو، کە زیاتر لە ئەندێشە بەبەزەییبن، زیاتر لە تێگەشتن نەرمبن، کەمتر بڕوایان بە ئازایەتی دەبەنگانە هەبێت بەڵکو زیاتر بڕوایان بە زانین و هونەر هەبێت.

مرۆڤی بە ئیرادە، ئەو مرۆڤەی کە لە پاشەڕۆژدا ببێت بە خزمەتکاری مرۆڤە ئازادەکان، نەك ببێت بە حاکمێکی نایاب بۆ سەرسامبونی کۆیلەکان، حاکمی بە ئیرادە خزمەتی ئازادی دەکات حاکمی بێئیرادەش سەرسامبونی کۆیلەکانی مەبەستە.

ڕاسڵ پێیوایە لە پەروەردەدا پێویستە فێرخواز ببێت بە مەبەست نەك ئامڕاز. چونکە مرۆڤ کە بوو بە مەبەست لە مردنیدا ئەو مەبەستە نامێنێت، بەڵام کە بوو بە ئامراز لە مردنیشدا بە نەمری دەمێنێتەوە. زیرەکی و زانست و فەزیلەت بە بیٚ بوونی خۆشەویستی نامانگەینن بە ئاستی پێگەشتن و گەورەبونێکی باش و ئازاد لە منداڵ و فێرخوازدا. (کیٚ دەیەوێت خۆشەویستی وەك ئامراز بەکار بهێنێت  کێش دەیەوێت وەك مەبەست بهێنێت).

ئێمە پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان ئەو ئاکارانەی بۆ گروپێك لە خەڵك پەسەندە ئەو ئاکارانەش بۆ هەموو خەڵك پەسەندە.

بناغەی ڕەوشتجوانی لای ڕەسڵ چواردانەیە:

ئازایەتی: چەند جۆرێکی هەیە هەموشیان ئاڵۆزن، نەترسانی ڕووت شتێکە و توانای بەسەر جڵەوکردنی ترسا شتێکیتر، خۆ قوتارکردنیش لە ترس شتێکیترە. ئازایەتی بە سەرکوتکردن نایەتەدی، بەڵکو نەرمی و کارامەیی دوو فاکتۆری گرنگن بۆ ئازایەتی. خۆپاراستن و بەکارهێنانی هەندێك ئامڕاز ترسنۆکی نییە بەڵکو جۆرێکە لە حیکمەت، بەڵام ترسنۆکی هەمووی جۆرێکە لە کۆیلایەتی؛ ئەگەر هەر نەتوانی خۆت دوربخەیتەوە لە ترس هەوڵبدە بە ڕوخسارتەوە دیار نەبێت.

هەستیاری: ئەو کەسەی هەستیارە و هەستەکانی بۆ هەموو شتێك دەبزوێت، ئەمە ئاکارێکی باش نییە، بۆ ئەوەی هەستیاری  بە ئاکارێکی باش پەسن بکرێت، پێویستە تەنها وروژانی بۆ شتێك هەبێت کە شایستە بێت. خەڵك کاتێك کەسێکی نزیکیان لە جەنگدا توشی قاچبڕینەوە یان دەستبڕینەوە دەبێت، ئەوکات جەنگ بە کاولکاری و ماڵوێرانی دەزانێت، بەڵام بە ملیۆنان لە مرۆڤەکان قاچ و دەستیان لە جەنگەکان ببڕێتەوە بە ئەندێشەیاندا نایەت. هەندێکەس تژین لە سۆز و هەستیاری و میهرەبانی و نەرمونیانی

لەگەڵ خەڵکدا کەچی بەلایانەوە ئاساییە دنەی جەنگ بدەن بۆ ئەوەی بیکات بەدەستکەوت لەسەری بژی.

گرنگ نییە پرنسیبەکانت لەگەڵ پرنسیپی گشتی یەکبگرێتەو، بەڵکو پێویستە بە حیکمەتی کەسی خۆت کار بکەیت هەروەها لە بوارەکەی خۆت کاریتێدا دەکەیت پەنا بۆ بابەتە زانستیەکان بەریت، باشتریشە گوێ لە بۆچونە جیاوازەکان بگریت، لەبەر ئەوە نابێت مرۆڤ وەك ژێژك دەورە خۆی بە درِك بتەنێت پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤەکان نەمێنێت. ترسنۆکەکان ڕەشبین و باوخوازن، ئازاکانیش گەشبین و نوێخوازن.

بەشی دووەم:

خۆشەویستی و زۆری سۆز پێکەوە هەڵناکەن، دایبابێك کە منداڵەکەی خۆشدەوێت ناچارە زیرەك بێت بۆ باش پەروەردەکردنی منداڵەکەی، چون دەشێت باش پەروەردەکردن ناکۆك بێت لەگەڵ سۆزدا. لەبەر ئەوەشە ئەو کەسانەی منداڵیان نییە سۆزیان بۆ منداڵ زۆر بەرزترە لەوانەی کە منداڵیان هەیە، لە بەخێوکردنیاندا زانستی بەخێوکردنیان زاڵە بەسەر سۆزیاندا. زیادەڕەوی لە سۆز کارێکی ژیرانە نییە. ئاشکرایە منداڵی تازە لەدایکبوو هیچ خویەکی نییە بەڵام ئەوەی هەیەتی ڕەنگدانەوەی غەریزەکانێتی.

ئەو خووە خێرایانەی ساوا فێری دەبێت زۆرجێگای سەرسوڕمانە، منداڵی ساوا هەر خویەك کە وەریگرتووە لە پێناو فێربون و خۆڕاهێنان بۆ خوی باشتر بەکاری دەهێنێت، لەبەر ئەوە ئەو خوانەی کە لەساوایی کە لەسەر ڕادەهێنرێت زۆر بە بایەخە.

گەر منداڵی ساوا باش ڕاهێنرا و باش پەروەردەکرا ئەوا لە تەمەنەکانی دواتر هێندە ماندووبون بۆ فێرکردن و پەروەردەکردنی پێویست نییە. ئەگەر شیرەخۆر زانی بە گریان ئەوەی دابین دەکرێت، گریان دەکات بەو چەکە بەهێزەی دەستی خۆی بۆ دابینکرد داواکانی، ئەم خووەی تێدا گەورە دەبێت. پێویستە تای ترازوی پشتگوێخستن و نازپێدان هاوسەنگ بکەین، پێویستە گرنگی زۆری پێنەدەین و هەموو شتێکی بە قسە نەکەین.

منداڵ هێزێکی بچوك و زانیاریەکی سنورداری هەیە بەڵام زیرەکیەکەی هێندەی کەسێکی گەورەیە؛ بە گشتی وا مامەڵە لەگەڵ منداڵ بکە و ڕێزی بگرە وەك ئەوەی پێگەیەکی گەورەی هەیە لەم دونیایەدا.

بەلای ڕەسڵەوە بەکارهێنانی زەبروزەنگ کارێکی ناپەسەندە بەڵام بەکارهێنانی بۆ سەرکەوتن بەسەر ترسدا کارێکی بەسودە.

ئەو کەسانەی ئاوڕ لە ڕابردوو دەدەنەوە و پاشەڕۆژیش وەك ڕابردوو تەماشا دەکەن، ئەوا ژیانی منداڵەکانیان وێران دەکەن.

هەندێك لە دەروناسان دەیانەوێت سیمبولی سێکسی بدەن بە یاری منداڵان، بەڵام من وام لایە ئەم بیربۆچونە لە وەهم زیاتر نییە. پاڵنەری خۆڕسکی و بناغەی لە منداڵدا سێکس نییە، بەڵکو ئارەزویەکی منداڵانەیە کە دەیانەوێت لە تەمەنی خۆیان گەورەتر دەربکەون و یان هەندێکجار هێزی خۆیان بنوێنن.

چیرۆکی جاك کە باس لەوە دەکات ئەم چیرۆکەی بۆ دەگێڕێتەوە کە ژۆن جاك وەحشە زەبەلاحەکەی کوشتوە. یان لەکاتی یاریکردندا سزای ژنەکەی بدات، فرۆیدەکان بڕوایان وایە ئەمە شێتیەکی دڵڕەقانەیە بەرامبەر بە ژنان، بەڵام خۆ منداڵەکەی من چێژی لەوە دەبینی ببێت بە زەبەلاحێك و منداڵەکەی خۆی بخوات، ئەوەی تێبینیم کردووە هێزی سەرەکی ئەم چیرۆکانە داڵغەلێدانە نەك سێکس و دڵڕەقی بەرامبەر منداڵان. ئەو شتە ڕاست نییە کە کە دەڵێت هێزی پەیوەستبوون لە کوڕدا زیاترە بۆ دایك و لە کچیشدا بۆ باوکی، مەگەر لە دۆخی دەگمەنی نەخۆشیدا ئمە ڕوبدات. فرۆیدیەکان دەڵێن پێویسات ناکات دایباب منداڵەکانیان لە ئامێز بگرن و هۆگریان بکەن، منداڵ مافی لەسەر دایبابە کە سۆز و خۆشەویستیان بۆ دەردەبڕن، چونکە ئەمە وایان لێدەکات بە دیدگایەکی گەشبینەوە سەیری دونیا و ژیان بکات و دوربن لە خەم و پەژارەوە. پاشان غەریزەی دایکایەتی لە ناوەڕۆکدا جیاوازە لە غەریزەی سێکسی.

لە یاریکردندا منداڵان دوو جۆر ئیرادەیان هەیە بۆ هێز: یەکەمیان – فێربونی ئەو کارانەی بە کردەیی دەیانکات. دوەمیان – شێوەی دووەم ئەندێشە و داڵغە لێدانە. منداڵانی سروشتی حەزیان بۆ هێز هەیە نەوەك سێکس.

منداڵەکان بە ئەندێشەکانیان خۆشی لە یاریکردن بە کەرەستەکانی بەردەستیانەوە دەبینن، بەڵام لەگەڵ خۆشیەکانیاندا کەرەستەکان دەبن بە ئامرازگەلێك بۆ فێربونیان. واتە خۆشی و ڕابواردنەکانیان لە پێناو فێربوندایە. بەڵام کاتێك یاریەکان لە واقیعدا لەبەردەستیاندا بوو ئەوا مەبەستەکە دەبێت بە بەدەستهێنانی شتەکان و زاڵبون بەسەریاندا. واتە چیتر ناتوانن ئەندێشەیان پێوە بکەن.

لام وایە نە بڕوا کۆنەکان هەڵەیەکی بنەڕەتی بوون و نە بڕوای ڕۆسۆ بەوەی کە ئاکارچاکی لە منداڵدا خۆرسکیە و گونجاویشە لەگەڵ واقیعدا، بەڵام بەڕای من مادده خۆڕسکیە پەتییەکان لە منداڵیدا هەڵگری خوویەکی زگماکی پەسەند نییە. بەڵکو بە کاریگەری ژینگە و بارودۆخ خووی چاکە و نابەجێی لێوە دروست دەبێت.

دروستکردن و ڕووخاندن هەردوکیان ویستی هێز ڕازی دەکەن، بەڵام دروستکردن خۆی لە خۆیدا سەختره لە ڕوخان.

دڵسۆزی مەرج نییە بە تەنها بەڵکو پێش دڵسۆزی لێزانین گرنگە. ئێمە داهێنان دەکەین کاتێك نهێنی داهێنانی پێشووترمان تێپەڕێنین، دەشڕوخێنین کاتێك گۆڕانکاری لە داهێنانەکانی پێشوتردا دەکەین بێئەوەی گرنگ بێت لامان دروستکراوی نوێمان لەسەر چی دروست دەکەین.

ئاسانترین ڕێگا بۆ لە ڕیشکێشکردنی دڵڕەقی کوێرانە، دزینەوەی گرنگیپێدانی منداڵە بە دروستکردن و پەرەسەندن؛ واتە ئەوە بدۆزینەوە کە منداڵ گرنگی پێدەدات و دەخوازێت دروستی بکات.

لە خێزانە چینە بەرزەکانی ئینگلیزدا کوشتنی باڵندە بە بابەتێك دادەنرێت کە جێگەی ڕێزە، هەروەها کوشتن و خوێنڕشتن لە جەنگدا بە شەرەف دادەنرێت. نا مرۆڤبوونی ئەمانە پەیوەستە بە سیستەمی پەروەردەکردنیان. گەر سەرەتای تەمەنیان فێری ڕێزگرتن بکرانایە لە ژیان و ڕۆڵیان هەبوایە لە  چاودێریکردنی شتە باشەکانی ژیان، یان فێری کارامەی بکرانایە بۆ بونیادنان، یان فێری ئەوە بکرانایە کە زۆر بە ئاگادارییەوە سەیری ترسناکی ڕوخاندنی بەرهەمەکانی مێژووی مرۆڤایەتی بکەن، ئامادە نەبوون بۆ دڵڕەقی و کوشتن و کاولکاری.

خراپی فێربونی ئەدەبی کۆن ئەوەبووە کە هەمووی لەسەر ڕەخنە وەستاوە، هەوڵیان دەدا منداڵ دوربخەنەوە لە هەڵە لەبەر ئەوە ڕقیان لەو منداڵانە دەبوەوە کە هەڵەیاندەکرد. پەروەردەی کۆن میتۆدێکی نابەجێی هەبوو بۆ چاندنی خووی باش لە منداڵدا، مەبەستی دایباب چاندنی هەر ئەوەندە بوو، منداڵەکانیان شەرمیان لێبکەن و خۆشیان بوێن، لە ڕاستیدا ئەو خۆشەویستیە ڕووکەشبوو چونکە لە ترسەوە سەرچاوەی گرتبوو. وتەیەکی هیگڵ هەیە دەڵێت: هەتاوەکو سەرچڵێتی نەکەیت سەرکەوتن بەدەست ناهێنیت.

پێویستە لە بیر و هۆشی منداڵدا دادپەروەری بچێنرێت و سەوزبکرێت، نەك فێری ئەوە بکرێت قوربانی بە بەشەکەی خۆیبدات.

منداڵ حەزدەکات

منداڵی تەنیا یان چەپێنراو و گۆشەگیر دەردەچێت، یان خۆویست و خود خۆشەویست دەردەچێت، منداڵی تەنیا یان سەلار و بەستەزمانە یان ناسەلار و بەڵا و ماندووکەرە.

هەستی خاوەندارێتی لای منداڵ پەیوەندی بە دادپەروەریەوە هەیە، ئەم هەستە بابەتێکی ئاڵۆزە پێویستی بە بیرێکی دیبلۆماسی و ژیرانە هەیە، کەواتە بەزۆر سەندنەوەی هەستی خاوەندارێتی لە منداڵ کارێکی حەکیمانە نییە.

ئامانجی پەروەردەی مۆدێرن پێکهێنانی خووی ڕاستگۆییە، مەبەستم تەنها ڕاستگۆی نییە لە قسەکردندا، بەڵکو لە هزرو بیریشدا، وەك دەردەکەوێت ئەوەی دووەمیان گرنگترە.

کارکردن بە ناڕاستگۆیانە بەزۆری دەگەڕێتەوە بۆ ترس، واتە ئەوە ترسە بوە بە سەرچاوەی ناڕاستگۆیی. منداڵی نەترسێنراو ڕاستگۆ دەبێت. نەك بەهۆی هەوڵەکانیەوە بۆ پیشاندانی ئاکاری جوان. منداڵ کاتێك زانی گەورەکان ناڕاستی لەگەڵ دەڵێن وا بەبیردا دێت ترسێك هەیە لە پشت ئەوەی کە ڕاستگۆبن لەبەر ئەوە پەنا دەباتە بەر ناڕاستی.

نابەجێترین هەڕەشە لە منداڵ ئەوەیە بوترێت ڕادەستی پۆلیست دەکەم، یان بە پزیشکەکە دەڵێم دەرزیەکت لێبدات.

بەبۆچونی من پێویستە لە هەموو قوتابخانەیەك ژورێك هەبێت بۆ ئەو فێرخوازانەی وەڕسن، نایەنەوێت فێربن تا کاتی خۆیان لەو ژورەدا بەرتەسەر، پێویست ناکات هەر فێرخوازێك چوە ئەو ژورە جارێکیتر بگەڕێتەوە بۆ وانەکەی.

منداڵ فێریبکە ژیاندۆست بێت و ڕێز لە ژیان بگرێت، بە هیچ جۆرێك ڕێگە مەدە بتبینێت کە ئازاری کەسێك یان ئاژەڵێك دەدەیت یان کاتێك مارێك یان زەردەواڵەیەك دەکوژیت.

گەر بتەوێت وانەیەکی فێربونی بەکارهێنانی مشار بە منداڵەکەت بڵێیتەوە بەڵام لەوەوپێش تۆ تەورت بەکارهێنابێت، ئەوە وای لێناکات وای لێبکەیت فێری بەکارهێنانی مشار بێت.

ڕێزگرتن لە خود بەبێ خۆسەپاندن و ڕێزگرتنیش لە بەرامبەر بەبێ نوشتانەوە باشترین ئامرازی فێربونە بۆ مامەڵەی هاوتەمەنەکان و هاوپۆلەکان پێکەوە. لەبەر ئەوە هیچ ئاگاداری و چاودێریەکی دایباب بۆ منداڵەکانیان، هێندەی ئەوە نییە کە لە قوتابخانە چێژی لێدەبینن.

گەر هاتوو منداڵ سەیری ڕوداوێکی کرد کە هیچ بەزەیەکی نەبوو یان دڵڕەق بوو بەرامبەری پێویست لەسەرخۆ دیالۆگی بەسوود ئەنجامبدرێت، هەروەها ئاماژە بەوە بدەین بەوەی ئەو کەسانەی دڵڕەق و توندوتیژن کەسانی گێل و گەمژەن، هیچ شتێکی باشیان لەدەست نایەت.

خۆشەویستی دروستناکرێت بەڵکو دەبزوێنرێت، گەر بە منداڵان بڵێین پێویستە یەکترتان خۆش بوێت ئەوە ڕیسکی دوڕووی و ماستاوکردن دەخەینە بەردەمیان.

دەربارەی پەروەردەی سێکسیش، لەتەمەنی مێردمنداڵیدا کاتێك کوڕ و کچەکان هەست بەو گۆڕانکاریەکانە دەکەن، کە بەسەر جەستەیاندا دێت، پێویستە ئاگاداربکرێنەوە و شارەزایان بدرێتێ دەربارەی ئەو گۆڕانکارییانە، دەنا لەوانەیە ببێتە هۆکاری تێکچونی باری دەرونی و ترس.

کاتێکیش بە تەواوەتی سێکس دەخەملێت لە گیان و هەست و جەستەی نێر و مێدا، ئیتر وەك تەمەنی مێردمنداڵی گوێ ناگرن لە شێوازی زانستیەکەی. زانست بەبێ خۆشەویستی وێراکەرە، خۆشەویستیش بەبێ زانست ناتەواوە. فێربون پێویستە ئاماژە و نیشانە بێت بۆ خۆشەویستی، بە ئامانجی و وروژواندی هەستی خۆشەویستی لە منداڵدا، ئەگین دەبێت بە ئامرازێکی زیانبەخش، خۆشەویستی لەو کۆمەڵانەدا هێزێکی کارایە.

لەبەر نەبونی خۆشەویستیە سیاسیەکان بوێری ئەوە ئەکەن، کە قوربانی بە ژیانی ژمارەیەکی گەورەی بێسنور لە منداڵان بدەن لە پێناو خۆشگوزەرانی خۆیان.

منداڵی بچوك  بە دەگمەن بۆ ماوەی چەند خولێك زیاتر ئەتوانێت بیر لە شتێك بکاتەوە، بیری منداڵ زۆر چەق نابەستێت لەسەر شتێك، تێڕامانی کەمە، لەگەڵ گەورەبونی بیرکردنەوەیان گەشە دەکات.

هێز ی پاڵنەر  پێویستە لە خودی فێرخوازاندا بێت نەك لە دەسەڵاتی مامۆستادا بێت. منداڵ گەر چێژی لە وانەکان وەرنەگرت ئەوە ناتوانێت فێر ببێت. خوێندن لە هەموو قۆناغەکاندا پێویستە شەوقدار و خۆشەویست بێت.

كتێبی شەشەم: ئەزمون و پەروەردە. - نوسینی: جۆن دیوی.
وەرگێڕانی: پەرۆش محەمەد.

چاپی یەکەم ٢٠٢٠

مێژووی فەلسەفە دابەش بووە لە نێوان ئەوانەی باوەڕیان وایە پەروەردە گەشەکردنێکی ناوەکیە لەگەڵ ئەوانەی باوەڕیانوایە پەروەردە پێکهێنان و شێوەپێدانێکە لە دەرەوە. ئێستا ئەم دژایەتیە لە پەیوەندی بە کاروباری پراکتیکی قوتابخانەوە فۆرمی جیاوازیکردنی لە نێوان پەروەردەی نەریتی و پەروەردەی پێشکەوتنخوازدا وەرگرتووە. بیرە سەرەکیەکانی پەروەردەی نەریتی بە گشتی داڕێژراون:

١- بابەتی خوێندنی پەروەردە پێکدێت لە کۆمەڵێ زانیاری و پسپۆڕی کە پێشتر بەرهەم هێنراون، لەبەر ئەوە کاری سەرەکی قوتابخانە ئەوەیە بیانگەیەنێت بە نەوەی نوێ.

٢-لە ڕابردوودا چەندین یاسا و ستاندارد بۆ ڕەفتار بەرهەم هێنراون، پەروەردەی ئەخلاقی بریتیە لە بەرهەمهێنانی خوویەك بۆ کارکردن کە لەگەڵ ئەم ستاندار و یاسایانەدا بگونجێت.

٣-ڕێکخستنی شێوازی پۆل و خشتەی وانەکان و پلەبەندی تاقیکردنەوەکان، قوتابخانەی کردوەتە دامەزراوەیەك بە تەواوەتی جیابوەتەوە لە هەر شێوە دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی.

ئەم سێ تایبەتمەندیە مەبەست و میتۆدەکانی فێرکردن و دیسپلین دیاری دەکات. بابەتی خوێندن و ڕەفتاری درووست پێشتر ئامادەکراوە لەبەر ئەوە هەڵوێستی فێرخواز بە شێوەیەکی گشتی دەبێ ملکەچی و گوێڕایەڵی و وەرگرتنی پاسیڤانە بێت، بەتایبەت کتێبەکانی خوێندن. سەرچاوەکانی سەرەکی زانین کەلەپوری ڕابردوون. پەروەردەی نوێ یان پێشکەوتنخواز ئەنجامی قبوڵنەکردن و ڕەخنەگرتنبوو لە پەروەردەی نەریتی. پەروەردەی نەریتی سەپاندنێکە لە سەرەوە و لە دەرەوە. ئەم شێوازە ستاندارد و پرۆگرامی پێگەشتوان بەسەر کەسانێکدا دەسەپێنن کە تازە و بە هێواشی هەنگاو دەنێن بەرەو پێگەشتن. کە بابەتی خوێندن و ڕێگاکانی فێربوون نامۆن بە تواناکانی منداڵ. لە توانای منداڵدا نییە بەو ئەزمونەی ئێستا و بەردەستی لەو بابەتانە بگات، لە ئەنجامدا دەبێت بسەپێنرێت. بۆشایی نێوان بەرهەمی مرۆڤی کامڵ و پێگەشتتوو لەگەڵ ئەزمون و توانای منداڵ هێندە زۆرە کە ناهێڵێت فێرخواز بەشداری چالاکانەی هەبێت لە فێربوتی ئەو بابەتەی

پێدەوترێت. فێربوون لێرەدا واتای وەرگرتنی ئەو شتانەیە کە پێشتر لە کتێبەکاندا پێکەوەنراون. ئەوەی دەوترێتەوە بەرهەمی کۆمەڵگایەکە کە لای وابووە ئایندەش وەك ڕابردوو دەبێت.

گەر کەسێك بیەوێت فەلسەفەی پەروەردە بەو شێوەیەی کە لە پەروەردەی نوێدا پیادە دەکرێت دابڕێژێت. چەندین پرەنسیب و ڕەگەزی هاوبەش لەو قوتابخانە پێشکەوتنخوازانە دەدۆزیتەوە کە لە ئێستادا هەن. لەبەرامبەر سەپاندن، چاندن و پەروەردەکردنی تۆوی تاکگەرایی هەیە. لەبەرامبەر دیسپلینی دەرەکی، چالاکی ئازاد هەیە. لە جێی فێربوون لە ڕێگەی کتێب و مامۆستاوە، فێربوون لە ڕێگای ئەزمونەوەیە. لەوانەیە فەلسەفەی پەروەردەی نوێ بە گشتی باش بێت، بەڵام تەنها جیاوازی پرەنسیبەکان لە لایەنی تیۆریەوە ئەو ڕێگایە دەستنیشان ناکەن کە دەبێت ئەولەویەتە فیکری و ئەخلاقیەکان فەراهەم بکات لەکاتی پراکتیکدا. هەر بزوتنەوەیەکی نوێ مەترسی ئەوەی هەیە لە کاتی ڕەفزکردنی میتۆدەکانی تردا کە بڕیارە جێگەی بگرێتەوە، پرەنسیبی نەرێنی پێش بخات نەك ئەرێنی و بونیاتنەرانە.

یەکگرتنی بنەڕەتی لە فەلسەفەی نوێدا لەوەدایە کە پەیوەندیەکی پێویست و نزیك لە نێوان پرۆسەی ئەزموونی ڕاستەقینە و پەروەردەدا هەیە. گرفتی پەروەردەی پێشکەوتنخواز ئەوەیە:

واتا و پێگەی بابەتی خوێندن و ڕێکخستن لە ئەزموندا چیە؟

بابەتی خوێندن چۆن کار دەکات؟

ئایا شتێکی خۆڕسك لە ئەزمووندا هەیە کە بوار بدات ببە ڕێکخستنی بەردەوامی پێکهێنەرەکانی؟

چی ڕوودەدات کاتێك کەرەستەکانی ئەزموون بە بەردەوامی ڕێکناخرێن؟

فەلسەفەیەك کە لەسەر ڕەتکردنەوە و ڕەفزکردنەوەی ڕووت بنیاتنرابێت، ئەم پرسیارانە پشتگوێدەخات. پێیوایە لەبەر ئەوەی پەروەردەی کۆن لە سەر ڕێکخستن و ئامادەکردن بنیادنراوون، کەواتە ئەوەندە بەسە پرەنسیبی ڕیکخستن بە تەواوەتی ڕەتبکرێتەوە، هەوڵنەدرێت بزانرێت ڕێکخستن چیە و چۆنە گەر بنەمای ئەزموون بەدەستبهێنرێت. کاتێك کۆنترۆڵی دەرەکی ڕەتدەکەینەوە، گرفتمان ئەوەیە دەبێت هۆکارگەلێکی کۆنترۆڵ بدۆزینەوە کە لە ئەزمون خۆیدا بوونی هەبێت. کاتێك دەسەڵاتی دەرەکی ڕەتدەکرێتەوە،

ئەوە ناگەیەنێت دەسەڵات هەمووی ڕەتبکەینەوە، بەڵو بە واتایەیە دێت کە پێویستە سەرچاوەیەکی کاریگەرتری دەسەڵات پەیدابکرێت. پەروەردەی پێشوو زانیاری و میتۆد و یاسای گەورەکانی دەسەپاند بەسەر منداڵدا، ئەمە بە واتای ئەوە نایەت کە زانیاری و بەهرەی گەورەکان هیچ بەهایەکی پەروەردەیی نابێت بۆ ئەزمونی منداڵ. تەنها فەلسەفەیەکی پەروەردەیی ئەم یان ئەو بەو شێوازە بیردەکاتەوە.

پرەنسیبە گشتیەکانی پەروەردە نوێ لە خۆیاندا هیچ یەکێ لە گرفتە ڕاستەقینەکان و پراکتیکەکانی تایبەت بە بەڕێوبردنی قوتابخانە پێشکەوتن خوازەکان چارەسەر ناکەن، بگرە هەندێکجار کێشەی نوێ دەخولقێنن. قوتابخانە نوێکان هیچ بایەخێك بە ڕێکخستنی بابەتی خوێندن نادەن، وەك ئەوەی هەر چەشنە ئاڕاستەکردن و ڕێنیشاندانێك لەلایەن گەورەکانەوە پێشێلکردنی ئازادییەکانی تاکبێت. واتای وایە ئاشنابوون بە ڕابردوو هیچ ڕۆڵێکی نییە لە پەروەردەدا. پەروەردەی نوێ پەرچەکردارە دژی پەروەردەی کۆن نەکپێشخستنی ئەرێنی و بنیاتنەرانە. فەلسەفەی پەروەردەیەك بانگەشەی ئەوە بکات ئازادی بنەمای سەرەکییەتی، ئەکرێت هێندە توند و دۆگما دەرچێت هەمان شێوەی ئەو پەروەرد نەریتیەی کە دژی دەوەستایەوە، بۆ نمونە پەروەردەی نوێ جەخت دەکاتەوە لە ئازادی فێرخواز، باشە ئێستا کێشەیەك دروست دەبێت، ئازادی واتای چیە؟ هەروەها ئەو هەلومەرجانە چین لە سایەیاندا ئازادی بەدیدێت؟ ڕۆڵی مامۆستا و کتێب چیە لە برەودان بە گەشە پەروەردەییەکانی منداڵ؟ بابەتەکانی پەروەردەی نەریتی ئەوەندەی بایەخ بە ڕابردوو دەدا کە یارمەتیەکی کەمی منداڵی دەدا لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ئایندەدا. پێویستە ئاشنابین بە ڕابردوو بۆ ئەوەی ئامرازێکی کاریگەر بێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئایندەدا. زانیاریەکانی ڕابردوو ئامرازێك بێت یۆ تێگەشتن لە داهاتوو.

ڕەتکردنەوەی فەلسەفە و پراکتیکی پەروەردەی نەریتی جۆرێك لە کیشەی پەروەردەی دیکە دروستدەکات، بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان بە پەروەردەی نوێ هەیە تاوەکو درك بەم ڕاستیە نەکەن دانبەوەدا نەنێن کە تەنها دورکەوتنەوە لە پەروەردەی نەریتی گرفتەکان چارەسەر نابن، بەڵکو تەنها بە شپرزەیی و بە بێبونی هیچ ئاسۆیەك هەنگاو دەنێن. لەناو ئەو هەمووە گومان و دودڵیانەدا چوارچێوەیەکی گشتی هەیە دەتوانین بۆ بگەڕێینەوە، ئەویش پەیوەندی ئۆرگانیە لە نێوان پەروەردە و ئەزمونی کەسیدا.

ئەو بۆچونەە کە پێی وایە پەروەردەی دروست لە ئەزمونەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو ئەزمونێك بە دروستی و یەکسانی پەروەردەیە، ناکرێت

ئەزموون و پەروەردە ڕاستەوخۆ یەکسان بکرێن چونکە هەندێك ئەزمون هەیە ناپەروەردەیین. ئەو ئەزمونەی کە گەشەی ئەزمونی پاشخۆی دەوەستنێت و تێکیدەدات ناپەروەردەییە. ئەزمونێکی دەوڵەمنتر سنوردار بکات، هەندێکجاریش ئەزمونی بەهرەکانی تاك بەرەو هەڵدێر بەرێت، ئەنجامەکەشی بەرتەسکردنەوەی مەودای ئەزمونی زیاترە، ئەزمون لەوانەیە چێژبەخش بێت بەڵام دیدێکی لاواز لە تاکدا بخولقێنێت. ئەم دیدەش جۆری ئەزمونەکان دواتر دەستکاری دەکات و ناهێڵێت ئەم کەسە شتێك لەو ئەزمونانە هەڵهێنجێت. هەر ئەزمونێك دەکرێت زیندوو گەش بێت، بەڵام ترازان و نەبونی پەیوەندی لە نێوان ئەزمونەکان خوو ڕەفتاری پەرتەوازەی لێدەکەوێتەوە.

لە پەروەردەی نەریتیدا ئەزمونەکانی فێرخواز و مامۆستا پێکەوە بە زۆری هەڵەبوون:

١- هەندێك فێرخواز وایان لێکراوە بایەخ بە هیچ بۆچون بیرۆکەیەك نەدەن.
٢- هەندێك خولیای فێربونیان تێدا کوژرا بەرئەنجامی پیادەکردنی ڕێگای هەڵە بۆ فێربوون.
٣- هەندێك بەهۆی ڕاهێنان و دوبارەکردنەوە بوون بە پسپۆڕ بەڵام توانای بڕیاردانیان لە بارودۆخی نوێدا سنوردارە.
٤- هەندك پرۆسەی فێربونیان لێبوە بە شتێکی وەڕسکەر و بێزارکەر.
٥- هەندێك گەشتون بەو باوەڕەی کە ئەوەی لە قوتابخانە فێردەبن زۆر نامۆیە بە دونیای دەرەوەی قوتابخانە.
٦- هەندێکیتریان کتێبیان لێبووە بە بارێکی گران لایان وایە ئەوان بۆ ئەوە ڕاهێنراون چاوێکی پێدا بخشێنن.

ئەم پرسیارانە بۆ سەرکۆنەکردنی پەروەردەی کۆن نییە بەڵکو بۆ مەبەستیترە. زیاتر بۆ پێداگرتنە لەو ڕاستیەی کە منداڵ لە پەروەردەی نەریتیدا ئەزمونی هەبوە، گرفتەکەش نەبونی ئەزمون نییە، بەڵکو بونی کەموکورتی و هەڵەیە لە ئەزموندا.

جۆری ئەزمون دوو لایەنی هەیە:

لایەنی یەکەم: لایەنیکی هەنوکەیمان هەیە کە خۆشبوون یان ناخۆشبوونی ئەزمونە، ڕوون و ئاسانە بڕیاردان لەبارەیەوە کاریگەری ئەزموون پۆشاکێك نییە بپۆشرێت و ببینرێت. هەرلەبەر ئەوەیە گرفت بۆ پەروەردەکار دروستدەکات، ئەوە کاری پەروەردەکارە جۆرێك لە ئەزموون ڕێکبخات بە شێوەیەك فێرخواز بێزار نەکات و زیاتر تێکەڵ بە چلاکیشی بکات.

فەلسەفەی پەروەردە وەکو هەر تیۆرێکیتر پێویستی بەوەیە بە وشە و هێما دابڕژێت. ئەوەی پەروەردەی نەریتی پێویستی پیبوو، تەنها کۆمەڵێ چەمکی ئەبستراکت بووە لە وێنەی کلتور و دیسپلین و میراتە کەلتوریە دەوڵەمەندەکان، لە ڕاستیدا بۆ ڕێنوێنی کردن ئیلهام لە هیچ یەکێك لەمانە وەرنەگیراوە بەڵکو دابونەریت و ڕۆتین ڕێنیشاندەربوون. پەیداکردن و دۆزینەوەی ئەو کەرەستە و میتۆد و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیانەی گونجاون، کارێکی گرانترە لە پەروەردەی نوێدا تاوەکو پەروەردەی کۆن. زۆربەی ڕەخنە و گرفتەکان لێرەوە سەرچاوە دەگرن، لە پەروەردەی نوێدا گرفتەکان قوڵتر و ڕەخنەکان زیاترن. بەڵام پەروەردەی نوێ لە ڕووی پرەنسیبەوە لە پەروەردەی کۆن سادەترە.

پێوەرەکانی ئەزموون

پێویستە ئەو پرەنسیبانە بخەینە ڕوو کە گرنگن لە شێوە پێدانی تیورێکەدا. ئەو هۆکارەی کە وایکرد پەروەردەی نوێ ویستراوبێت، ئەوەبوو میتۆدەکانی مرۆڤانەتر بوو بەراورد بە ڕەقی و توندی کە لە سیاسەتەکانی قوتابخانەی نەریتدا هەبوو، هەروەها ئەم بزوتنەوەیە زیاتر هەڵگری ئایدیاڵە دیموکراتەکانە کە خەڵکی باوەڕیان پێیەتی.

پرۆسەی پەروەردە واتە گەشە، یان گەشەکردن و نەشونماکردن، نەك تەنها نەشونماکردنی جەستەیی، بەڵکو فکری و ئەخلاقی نمونەیەکی پرەنسیی بەردەوامییە. گەشە بە تەنها بەڵکو پێویستە ئەو ئاڕاستەیش دیاریبکەن کە ڤەشەش وەریدەگرێت. ئایا گەشە بەم ئاڕاستەیە هاریکارە یان ڕێگرە لەبەردەم گەشە بە شێوەیەکی گشتی؟

کە منداڵێك فێری قسەکردن دەبێت، توانای نوێ و ئارەزوی نوێتری هەیە. لە هەمانکاتدا هەلومەرجی فێربونی دواتری فراوانتری کردوە، بە هەمان شێوە دەرگای بە ڕووی ژینگەیەکی نوێدا کردوەتەوە. بەڵام جۆری ئەزمونی ئێستا کاریگەری دەبێت لە شێوازی پیادەکردنی پرەنسیبە. لەلایەکیترەوە ئەگەر ئەزمون حەزی زانین بورژێنێت و گیانی دەستپێشخەری بەهێزبکات و مەبەست و ئارەزوگەلێك بینابکات، کە مرۆڤ بۆ سەرکێشی هانبدات لە ئایندەدا، دیارە ئەم ئەزمونە بە شێوازێکی تەواو جیاواز کاردەکات. ئەگەر گەورەکان دوربینی و تێگەشتنەکانیان بۆ ڕێکخستنی بارودۆخی ئەزمونی بچوکەکان بەگەڕ نەخەن، هیچ حیکمەتێك لە گەورەییاندا نییە. کەسی پێگەشتوو ئەو مافەی نییە هاوخەمی و تێگەشتنێك کە بە ئەزموون فێری بووە لە منداڵانی بشارێتەوە لە کاتێکدا منداڵ پێویستی پێیەتی. ئەگەر کەسەکە پەروەردەکار بێت، دەبێت بتوانێت بڕیاربدات کام تێڕوانین یارمەتی گەشەی بەردەوام دەدات و کامە نایدات. ئەزمون هەروا لە خۆوە

له کەسێکدا نایەتەبوون، هەتاوەکو کاریگەری دەبێت لەسەر شێوەگرتن و دروستبونی مەبەست و ئارەزووەکان.

ئێمە لە لەدایکبوونەوە تاوەکو مردن لە جیهانی شتەکان و مرۆڤدا دەژین. لەسەروی هەموو شتێکەوە پەروەردەکان پێویستە بزانن چۆن ژینگە فیزیکی و کۆمەڵایەتیەکان بەکاردەهێنن تاوەکو هەموو ئەو شتانەیان لێوەربگرێت کە لە توانیاندایە پێشکەشی بکەن.پەروەردەی نەریتی پێویستی بە ڕوبەڕوبوونەوەی ئەم کێشەیە نەبوو لەبەر ئەوەی دەیتوانی بە ئاسانی خۆی لێ لابدات. ژینگەی قوتابخانە تەنها لە تەختەڕەش و مێزی دانیشتن و گۆڕەپانێکی بچوك پێکهاتبوو، مامۆستا پێویستی بەوە نەبوو لە نزیکەوە ئاشنای هەلومەرجی فیزکی، مێژوویی، ئابوری و پیشەیی کۆمەڵگە بێت بۆ ئەوەی وەك سەرچاوەی پەروەردەیی بەکاریان بهێنێت. سیستەمێکی پەروەردەیی کە لەسەر هەمانگی نێوان پەروەردە و ئەزموون بنیاتنرابێت، پێویستە ئەم شتانەی سەرەوە بەهەند وەربگرێت.

دەکرێت نەخشەیەکی پەروەردەیی دابنرێت کە بەشێوەیەکی سیستەماتیك هەلومەرجیە بابەتیەکان بکاتە پاشکۆی هەلومەرجیە ناوەکیکانی منداڵ. بەمەرجێك کتێب و پرۆگرام و مامۆستا و ئامێر لە پێگەیەکی خوارتر لە هەست و مەیلە هەنوکیەکانی منداڵ دابنرێن. لە کۆتایدا ئەزموون تەنها ئەوکاتە ئەزموونە، کە هەلومەرجیە بابەتیەکان بکرێن بە پاشکۆی دۆخە کەسی و ناوەکیەکان.

گرفتی پەروەردەی نەریتی ئەوە نەبوو کە جەختێکی زۆری لەسەر هەلومەرجە دەرەکیەکان دەکردەوە، بەڵکو گرفتەکە ئەوە بوو کە بایەخێکی زۆر کەمی بە فاکتەرە خودیی و ناوەکیەکان دەدات. هەردوو پرەنسیپی بەردەوامی و کارلێکردن لەیەك جودانین، بەڵکو بەیەکیش دەگەن و یەکیشدەگرن. یەکگرتنی چالاکی پرەنسیپی بەردەوامی و کارلێکردن پێکەوە دەبێتە پێوەر بۆ بەها و گرنگی پەروەردەیی هەر ئەزمونێك. کاتێك پەروەدەکار کاریگەری لەسەر ئەزمونی کەسانیتر هەبێت  ئەو ژینگە دەستنیشانبکات لەگەڵ پێویستی و حەزەکانی فێرخوازدا بگونجێن بۆ بونیاتنانی ئەزمونێکی شایستە. پەروەردەی نەریتی گونجاندنی بابەتەکان لەگەڵ پێویستی و تواناکانی بە گرنگ نەدەزانی. هەروەها پەروەردەی نەریتی ئێستای دەکردە قوربانی ئایندەیەکی دوور و نادیار.

زۆرجار کەسانێك دەبینین کە بڕێکی زۆر کەیان لە قوتابخانە خوێندووە، بەڵام ئەم نەخوێندنە بە شتێکی باش شکاوەتەوە. ئەم کەسانە هیچ نەبێت توانا خۆڕسکەکەی

خۆیان لە بڕیاردان و هەڵبژاردن هێشتوەتەوە، کەواتە سودی کەسێك چیە زانیاری ئامادەکراو دەربارەی مێژوو و جوگرافیا فێربێت، بەڵام لەم پرۆسەیەدا ڕۆحی بدۆڕێنێت، پێزانینی بۆ شتە بەنرخەکان لە دەستبدات.

کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی

ئەگەر پەروەردە وەکو ئەزمونی ژیان سەیربکەین، ئەوا پێویستمان بە فەلسەفەیەکی ئەزموون هەیە. پەروەردەش دەبێت ئەزمووونی ژیان بێت. کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لە ژیانی ڕۆژانەدا چالاکن، منداڵان دوای قوتابخانە یان لە کاتی بەتاڵیدا یاریدەکەن، ئەم یاریانەش یاسایان هەیە ئەم یاسایانەش هەڵسوکەوتی منداڵ دیاریدەکەن، لەم ڕەوشانەدا چەند تایبەتمەندیەکی کۆنترۆڵکردن هەیە .

١- یاساکان بەشێکن لە یاریەکە، یاسا نەبێت یاری نییە، یاریزانەکان هەستناکەن ملکەچی یاسایەکن لە دەرەوە بەسەریاندا دەسەپێنرێت.
٢- یاریزانێك لە هەندێککاتدا هەستدەکات بڕیارێك نادادپەروەرانەیە و تووڕە دەبێت، یاریزانەکە دژی یاساکە نییە بەڵکو دژی نادادپەروەریە.
٣- یاسای یاریەکە و شێوازەکەی بووە بە ستانداردێك هەمووان پەیڕەوی لێدەکەن. لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە کۆنترۆڵی کارەکانی تاك لە ژێر کاریگەری کۆی ئەو ڕەوشەدایە کە تاکەکانی تێدایە.

لە خێزانێکی تەواو ڕێکخراودا کە متمانەی تەواو هەیە، ئەوە ئیرادە و ئارەزووی تاکەکەسێ نییە کە بارودۆخەکە بە ڕێکی دەپارێزێت، بەڵکو ڕۆحیەتی گروپە وەکو کۆیەك ئەمکارە دەکات. لە قوتابخانە نەریتییەکاندا ڕێکخستن لەسەر مامۆستا بوو ئەمە لە جێی کاری پێکەوەیی بێت هەمووان ئەنجامی بدەن.بەڵام لە قوتابخانە نوێکاندا کارەکان وەك پرۆژەیکی هاوبەش بەڕێوە دەچێت و هەموو تاکێك دەرفەتی هەیە بەشدار بکات، زۆربەی منداڵان بە سرووشتی کۆمەڵایەتین، گۆشەگیری بە زۆری بۆ منداڵان ناخۆشترە نتاوەکو گەورەکان. هەندێك لە منداڵان بەر لە هاتنیان بۆ قوتابخانە قوربانی کۆمەڵێك هەلومەرجی وێرانکەری دەرەوەی قوتابخانەن. هەندێکیشیان ئەزمونی پێشویان خۆسەپێن و لاسار و ڕەنگە تەواو یاخیش بین، لەبەر ئەوە پێویستە مامۆستا لەگەڵ هەر حاڵەتێکدا مامەڵەی تایبەتی بکات. مامۆستا پێویستە هەوڵبدات هۆکاری پشت ئەم سەرپێچی و هەڵگەڕانەوانە بدۆزێتەوە.

تێناگەم پێگەشتووی مامۆستا و زانیاری زیاتر مامۆستا لە بارەی جیهان و بابەتی خوێندن چ سودێکی دەبێت گەر ئەمانە بۆ ئامادەکردنی ڕەوشێك نەخاتەکار، کە یارمەتیدەر بێت بۆ کاری هاوبەش. هەندێکجار هیچ بوارێك بۆ ئازادی بیرکردنەوە و هاوبەشیکردنی ئەزموونی کەسی نەهێشتوەتەوە. دانانی پلان ئەبێت ئەوەندە نەرمبێت بوار بڕەخسێنێت بۆ ئەزمونی تاگەرایی، لە هەمانکاتدا ئەوەندەش توندوتۆڵبێت ئاڕاستەیەك بدات بە گەشەکردنی بەردەوامی تواناکان.

ئەوانەی سەردانی قوتابخانە پێشکەوتوەکانیان کردووە، توشی شۆکبوون لەو کەمیەی ڕەوشتی جوان کە هەستیان پێکردووە، کەسێك کە ئاگاداری بارودۆخەکە بێت دەزانێت کە هۆکارەکەی کە منداڵان زۆر پەرۆشن لەسەر ئەوکارەی کە دەیکەن، کاتێك بەریەکدەکەون داوای لێبوردن ناکەن، هەندێك پێیانوایە ئەمە لەو نمایشە ڕوکەشیانە ڕەوشت جوانترە، بەڵام ئەمە شکستی قوتابخانەیە.

سروشتی ئازادی

لە قوتابخانە نەریتیەکان ڕێکخستنی پۆل پێکهاتبوو لە ڕیزێك مێز، هەروەها فێرخواز وەك ئەوەی لە دامەزراوەیەکی سەربازیدا بێت تەنها لەوکاتەدا دەیتوانی بجوڵێت کە ئاماژەیەکی پێبدرایە، ئەمانە پێکەوە ئازادی فیکری منداڵیان بەرتەسك دەکردەوە. گەر بمانەوێت دەرفەتێك بدەین بە فیکری تاك ئازادانە گەشە بکات دەبێت واز لەو ڕێسا سەربازی و زیندان ئاساییانە بهێنین. بەڵام ئەوە هیچ لەو ڕاستیە ناگۆڕێت کە بەشی زۆری ئازادی جوڵەی دەرەکی تەنها ئامڕازێکە نەك ئامانج. هێمنی و گوێڕایەڵی سەپێندراو ڕێگەنادات فێرخواز سروشتی ڕاستەقینەی خۆی دەربخات، لەمکاتەدا پابەندبونی فێرخواز دەستکردە و ڕواڵەتیان پێش جەوهەریان خستووە. فێرخوازان بایەخی زیاتر بە گوێڕاڵی دەستکرد دەدەن، فێرخوازان کاری فێڵبازانە لە ژێر ڕوخسارێکی ماسکدا دەکەن.

ئایدیاڵی پەروەردە خولقاندنی توانای کۆنترۆڵی خودە، بەڵام تەنها دەرچون لە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتێکی دەرەکی گرەنتی ئەوە ناکات کە کۆنترۆڵی خود فەراهەم بێت. زۆر ئاسانە کە لە کۆنترۆڵی دەسەڵاتێکی دەرەکی قوتاربێت و بکەوێتە ژێر داوی یەکێکیتری لەو ترسناکتر. ئەو حەز و پاڵنەرانەی کە زانین ئاڕاستەیان ناکات لە ژێر حوکمی قەدەردان. ئەوە دۆانە نەك بردنەوە کە لە کۆنترۆڵی کەسێك دەربچیت و بکەویتە داوی دۆخێکەوە هەڵسوکەوتەکان هەواو هەوەسی کاتی بیانسەپێنن.

واتای مەبەست

ئەفلاتون لە شوێنێك کۆیلە پێناسە دەکات کە مەبەستەکانی کەسێکیتر دەهێنێتەدی. کەسێکیش ملکەچی حەزە کوێرەکانی خۆی بێت بەهەمان شێوە کۆیلەیە. هیچ خاڵێك هێندەی ئەوە لە فەلسەفەی پێشکەوتنخوازدا تەندروست نییە کە بایەخی زۆر بە بەشداری فێرخوازان دەدات لە دروستکردنی ئەو مەبەستانەدا کە کاروچالاکی فێرخواز لە پرۆسەی فێربوندا ئاڕاستە دەکات. پاڵنەر و ئارەزوەکان بە تەنها دەرئەنجامەکان دروستناکەن، بەڵکو بە هاوبەشی و کارلێك لەگەڵ بارودۆخی دەوروبەر ئەمکارە دەکەن. ئێمە تەنها ئەوکاتە دەتوانین ئەنجامەکان بزانین کە ئەزمونی پێشترمان هەبێت. دروستبوونی مەبەست کارێکی زیهنی تاڕادەیەك ئاڵۆزە، ئەم پرۆسەیە پێویستی بە:

١-وردبونەوە لە هەلومەرجی دەوروبەر.

٢-هەبونی زانیاری دەربارەی ئەو شتانەی لە ڕابردوودا لە ڕەوشێکی هاوشێوەدا ڕویانداوە.

٣-بڕیارێك بۆ پێکەوە بەستنی ئەو شتەی بە وردبونەوە لەگەڵ بە بیرهاتنەوە بەدەستهاتووە.

ئاروزەکان بە تەنها خەیاڵپڵاوین گەر نەگۆڕێن بۆ ئامرازێك بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە بەدیبهێنرێن. لە پلانی پەروەردەیدا بونی پلان و پاڵنەر نابن بە ئامانجی کۆتایی، بەڵکو ئەمانە دەرفەتێکمن داخوازی پێکهێنانی پلان و میتۆدێك دەکەن بۆ کارکردن. ڕێنمایی مامۆستا لە کاتێکدا فێرخواز بیردەکاتەوە و زانینی بەکاردەهنێت، یارمەتیدانی ئازادیە نەك تەسکردنەوە. دەکریت ڕوبدات مامۆستا کارەکەی خراپ بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی چالاکیەکە وا ئاڕاستەبکات ڕەنگدانەوەی مەبەستەکانی مامۆستا بێت نەك فێرخواز، بۆ ڕێگریکردن لەم دیاردەیە چارەسەر ئەوەیە:

یەکەم: مامۆستا بە ئاگابێت لە توانا و پێویستی و ئەزموونی ابردووی ئەوانەی کە لە پرۆسەی فێربوندان.

دووەم: ڕێگە بدات ئەو پێشنارەی کە کراوە لەگەڵ ئەو پێشنیارەی دیکە کە ئەندامانی گروپەکە ڕێکیانخستووە هەموو پێکەوە بکرێن بە پلانێك و کاریپێبکرێت.

ڕێکخستنی بەردەوامی بابەتی خوێندن

هەر شتێك بۆ خوێندن دابنرێت، زانستی ژمارە، مێژوو، جوگرافیا یان یەکێك بێت لە زانستە سروشتیەکان،دەبێت لە سەرچاوەیەکەوە وەربگیرێت کە سەرەتا هەڵقوڵاوی ژیانی ڕۆژانە بێت.

پەیداکردنی بابەت و کەرەستەکانی فێربوون کە لە ئەزموندابن، هەنگاوی یەکەمە. هەنگاوی دووەم گەشەپێدانێکی بەردەوامە بەوەی لە ئێستادا ئەزمونکراوە بۆ فۆڕمێکی پڕ و دەوڵمەند ڕێکخراوتر. هەر کە منداڵ فێری خۆخشاندن و گەڕان و قسەکردن دەبێت، بابەتەکانی ئەزموونی فراوانتر و قوڵتر دەبێت. بە هەڵەدا چووین گەر لامان وابێت ئەوەندە بەسە ئەزموون گەلێکیتر بخەینە بەردەستی فێرخوازان زیاتر لەوەی هەیانە، ئیتر دڵنیابین کە ئەزموون بەردەوامی هەیە. پێویستە پەروەردەکار ئەوەی بە دەستهاتووە وەکو شتێکی جێگیر چاوی لێنەکات بەڵکو وەکو ناوەند و ئامرازێك لێیان بڕوانێت کە دەرگا دەکەنەوە لەسەر کۆمەڵە بابەتێك کە پێویستیان بە وردبونەوە و بەکارهێنانی زیرەکانتر هەیە.

مامۆستای نەریتی بەوە ڕازیە کە چاوەڕوانی تاقیکردنەوەی دواتر و دەرچونی فێرخواز بۆ پۆلی دواتر بێت. ئەو بۆچونەی لای وایە پەروەردە دەبێت کەرەستە و بابەتەکانی لە ئەزمونی ئێستاوە هەڵبگۆزێت و وابکات فێرخواز توانا ڕوبەڕبونەوەی گرفتەکانی ئێستا و ئایندەی هەبێت بە شێوەیەك لێکدرایەوە کە قوتابخانە پێشکەوتنخوازەکان دەتوان ڕابردوو فەرامۆشبکەن. تا ئێستا خاڵی لاوازی قوتابخانە پێشکەوتنخوازەکان لە پرسی هەڵبژاردن و ڕێکخستنی بابەتەکانی خوێندندایە لە ڕوانگەی فیکریەوە. ئەگەر قوتابخانە پێشکەوتنخوازەکان شکستیان هێنا، ئەوە زەمینە لەبارە و ڕەوایە ڕەخنەی لێبگیرێت. جارێکیتر ئەرکی پەروەردەکارە ئاگای لە دوو شت بێت:

یەکەم: دەبێت کێشەکە هەڵقوڵاوی ئەو هەلومەرجەبێت کە لە ئێستادا ئەزموون دەکرێت.

دووەم: کێشەکە بە جۆرێك بێت کە فێرخواز بۆ گەڕان بە دوای زانیاریی و دروستکردنی بیرۆکەی نوێ هانبدات. ئەم بیرۆکە و زانیاریانە دەبنە بناغە بۆ ئەزموونی نوێ کە تێیدا کێشە و گرفتی زیاتر دەخرێنەڕوو.

ئەگەر پەروەردە لە تیۆری و پراکتیکیدا لەسەر ئەزموون بەند بێت، ئەوە گومانی تێدا نییە کە بابەتی خوێندنی ڕێکخراو لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە ناتوانێت ببێتە خاڵی

دەستپێك،  بەڵكو زیاتر دەبێتە ئامانجێك کە پێویستە پەروەردە بە بەردەوامی بۆی بچێت.

ئەزموون: وەسیلە و ئامانجی پەروەردە

پەروەردە بۆ ئەوەی بە ئامانجەکانی بگات ، بۆ تاك و کۆمەڵگاش، دەبێت پایەکانی لەسەر ئەزموون بنیات بنێت. یان ئەوەتە بۆ دواوە بگەڕێتەوە بۆ ستانداردە فکری و ئەخلاقیەکانی سەردەمی پێشوو. یاخود بۆ پێشەوە بڕوات بەرەو بەکارهێنانی میتۆدی زانستی لە پێناو زیادکردنی ئەگەرەکانی گەشەکردن و فراوانبوونی ئەزموون.

من لایەنگری هیچ میتۆد و ئامانجێك نییم، لەو باوەڕەدام زۆر بە سادەیی بۆ سەرکەوتنی پەروەردە پێویستە ببێتە واقیع نەك هەر درووشم بێت.

کتێبی حەوتەم: کۆمەڵناسی پەروەردە. - نوسینی: مەحمود شارعپور.
وەرگێرانی: سوارە سەباح.

چاپی یەکەم ۲۰۲۲

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، هەوڵێکی زۆر درا بۆ گەشەپێدانی لقێکی نوێ لە کۆمەڵناسیدا بە ناوی کۆمەڵناسی پەروەردەیی. بۆ نمونە لیستەر وارد دامەزرێنەری کۆمەڵناسی ئەمریکا و یەکەمین سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمەڵناسی ئەو وڵاتە، لەو باوەڕەدابوو پەروەردە و فێرکردن سەرچاوەی گەشە و گۆڕانی مرۆڤە، دەتوانێت ببێتە هۆی بەرپرسیارێتی ئەخلاق و گەشەکردنی زانین بۆ باشترکردنی کۆمەڵگە. لە ساڵی ۱۸۲۳ ئەنجومەنی میللی بۆ خوێندنی کۆمەڵناسی پەروەردەی دامەزرا، لە ساڵی ۱۹۲۸ گۆڤاری کۆمەڵناسی پەروەردەیی، گۆڤاری فەرمی ئەم ئەنجومەنە بوو. کۆمەڵناسە سەرەتاکان کۆکبوون بە ئەنجامدانی کاری جیاواز بۆ کۆمەڵناسی پەورەردەیی: هەندێکیان وەك پایەیەك بۆ گەشەی کۆمەڵایەتی و چارەسەری کێشەکانی دەزانن (لیستەر وارد، هەندێکیتریان زیاتر لە هەولی دەستنیشانکدرنی ئامانجدابوون بۆ پەرورەدە و فێرکردن (رۆس فینی و پیتەرز)، هەندێکتریان کۆمەڵناسی پەروەردەییان بۆ چارەسەرکردنی کرفتە پەروەردەییەکان بەکارهێناوە (سمیس و زۆربۆ و کوڵپ) پێشیان وایە کۆمەڵناسی پەروەردەی ناتوانێت زانستێکی بێخەوش بێت بەڵکو زیاتر یەك پیشە و هونەرە. لە کۆتایی ۱۹۲۰ ڕۆبەرت ئەنگێڵ بۆ یەکەمجار چەمکی کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردنی پێشنیارکرد.

پێناسەی کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن

مانای پەروەردە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر جیاوازە، بۆ هەندێك لە دایبابان هۆکارێکە بۆ بەدەستهێنانی ئارەزووە بەدەستنەهاتوەکانیان. بۆ کۆمەڵناسان چەند مانا و پێناسەیەکی هەیە، هەم وەك پرۆسەیەك (کاتێك پەروەردە و فێرکردن بەدەست دێت کە ببینین گۆڕانکاریەك لە رەفتاری جەستەیی یان زیهنی تاك دروستدەکات)، هەم وەك دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی (پێکهاتەیەکە لە قوتابخانەدا بوونی هەیە، تاکەکان بە شێوەی جیاواز لەگەڵ یەکتردا لە کار و کاردانەوەدان). کۆمەڵناسان هەمیشە لە هەوڵی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان ئەم دامەزراوەیە لەگەڵ دامەزراوەکانیتری کۆمەڵگەدان. زۆر لە کۆمەڵناسان پەروەردە و فێرکردن بە مانای بە کۆمەڵایەتیبوون دادەنێن. کۆمەڵناسان دەیانەوێت بزانن منداڵان پێش چونە قوتابخانەوە چ ئەزمونێك لەماڵەوە

بەدەستدەهێنن؟ چۆن گروپە هاوتەمەنەکان کاریگەرییان دەبێ لەسەر سەرکەوتن یان شکستی منداڵان لە پێکهاتەی فەرمی سیستەمی فێرکردندا؟

چوارچێوەی کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن

بە سەرنجدان لە بەر فراوانی بواری کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن، ئەم بەشانە لە خۆ دەگرێت:

١- پەیوەندی سیستەمی پەروەردە لەگەڵ دامەزراوەکانیتری پەروەردە: وەك پەیوەندی لەگەڵ پرۆسەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و کلتوری، ئەرکی لەگەڵ پرۆسەی چاکسازی، پەیوەندی لەگەڵ چینی کۆمەڵایەتی، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ بیرکردنەوەی گشتی.
٢- کولتوری قوتابخانە و پەیوەندی مرۆڤانە: سروشتی کلتوری قوتابخانە لەگەڵ کلتوری دەرەوەی قوتابخانە، پلەبەندی لەناو قوتابخانە، پەیوەندی نێوان مامۆستا و قوتابی، شیکردنەوەی گروپی هاوڕێیان.
٣- پەیوەندی نێوان قوتابخانە و کۆمەڵگە: پەیوەندی نێوان قوتابخانە و گروپە کۆمەڵایەتیەکانیتر، کاریگەری ئەم گروپانە لەسەر قوتابخانە. پێکهاتەی دەسەڵاتی کۆمەڵگا و کاریگەری لەسەر قوتابخانە، پەیوەندی نێوان سیستەمی قوتابخانە و سیستەمە کۆمەڵایەتیەکانیتری نێو کۆمەڵگە.
٤- کاریگەری قوتابخانە لەسەر ڕەفتار و کەسایەتی تاك لە قوتابخانە: ئەم لایەنە زیاتر پەیوەستە بە دەروونناسیەوە، کاریگەری قوتابخانە لەسەر کەسایەتی و ڕەفتاری فێرخوازاندا. گرنگی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی منداڵان لە پەیوەندی لەگەڵ مامۆستا و فێرخوازانیتر لە ژینگەی قوتابخانەدا، هەندێك پەیوەندیتر وەك: ڕۆڵی کۆمەڵایەتی مامۆستا، سروشتی کەسایەتی مامۆستا، کاریگەری لەسەر ڕەفتاری فێرخوازان، تایبەتمەندی ڕەفتارەکان لەسەر ژینگەیەکی ستەمکار یان ئازاد لە قوتابخانە.

دکتۆر لاورێنس ساها لە کتێبی ناوەندی مەعریفی نێودەوڵەتی کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردندا، باس لە دوو ڕۆڵی سەرەکی کۆمەڵناسی پەروەردە دەکات:

١- کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن وەك توێژینەوەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی: دۆرکهایم پێیوابوو کە پەروەردە و فێرکردن لە بنەڕەتدا میکانزمێکە لە ڕێگایەوە ئایدیای گەورەی خۆی بەرهەم دەهێنێتەوە. مارکسیش لەو باوەڕەدابووە کە

پەروەردە و فێرکردن ڕێگایەکە بۆ گەیاندنی ئایدۆلۆژیای باڵادەست بۆ ئەندامانی کۆمەڵگا بەتایبەت بۆ چینی کرێکار. ئاڵتسۆر مارکسیستی فەڕەنسی ئەم پرۆسەیە بە یەکێك لە شێوازەکانی توندوتیژی ڕەمزی وێنا دەکات لە بەرامبەر توندوتیژی سەرکوتکەر و فیزیکی کە هێزی پۆلیس و سەربازی بەکاری دەهێنن. ماکس ڤیبەر لە ڕوانگەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیەوە لە پەروەردە و فێرکردن دەڕوانێت، بڕواشی وایە پەروەردە و فێرکردن ژیانێکی شایستە دەرەخسێنێت.

٢- کۆمەڵناسی پەروەردە وەك توێژینەوەی دەرفەت: پەروەردەو فێرکردن تا چ ڕادەیەك کاریگەری هەیە بۆ ڕەخساندنی دەرفەت لە کۆمەڵگەدا، یان بە پێچەوانە تا چەند نابەرانبەری و نایەکسانی بەرهەم دەهێنێتەوە؟ پەروەردە و فێرکردن نە تەنیا شێوەیەك بە ژیانی تاك دەبەخشێت، بەڵکو لە ڕێگەی تاکەوە دەتوانێت تا قوڵای کۆمەڵگە کاریگەری دابنێت. سروشتی پەروەردە و فێرکردن لە هەر کۆمەڵگەیەکدا لەژێر کاریگەری کلتور و پێکهاتەی دامەزراوەکانیدایە.

باسی دووەم: تیۆرە کلاسیکیەکانی کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن

یەکەم: تیۆری ئەرکگەرایی: بە تیۆری یەکسانی و ئەرکگەرای پێکهاتەیش ناودەبریت. بنەمای تیۆری ئەرکگەرایی گشتێك پێکهاتووە لە بەشەکان و ئەم بەشانە هاوبەشی دەکەن بۆ ماناوەی گشتەکە. گریمانەی ئەم تیۆرە کۆمەڵگە و دامەزراوەکان بەش و یەکەی بەیەکەوە نووساون و هەریەکەیان ڕۆڵی گرنگ لە پاراستن و مانەوەی هەموو کۆمەڵگەدا جێبەجێدەکات.

کاری ئەم تیۆرە ئامادەکردنی لیستی ئەرکەکانی پەروەردە و فێرکردنە لە کۆمەڵگەی تازەدا، گۆسلین سێ ئەرکی بنەڕەتی بۆ پەروەردەو فیرکردن لە کۆمەڵگەدا دیاری دەکات، ئەوانیش: پاراستن و گواستنەوەی کلتور و نوێگەری. بە بڕوای ئەرکگەراکان یەکێك لە ئەرکە سەرەتاییەکانی قوتابخانە، بواری فێرکردنە، چونکە لە قوتابخانەوە منداڵان فێردەبن تا ببنە بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی. ئەم کۆمەلناسان: ئەمیل دۆرکهایم و تاڵکۆت و پارسۆنزە.

ئەمیل دۆرکهایم

لە دیدگای دۆرکهایمەوە پەروەردە و فێرکردن ڕاستیەکی کۆمەڵایەتیە. (نەوەی پێگەشتوو لە ڕێگەی پەروەردە و فێرکردنە کاریگەری لەسەر ئەوکەسانە دادەنێن کە هێشتا ئامادەی ژیانی کۆمەڵایەتین، ئامانجی پەروەردە و فێرکردن بەهێزکردنی لایەنی جەستەیی و فکری

و ئەخلاقی منداڵانە کە هەم کۆمەڵگەی سیاسی و هەم ژینگەکەی پێویستیان پێیەتی).
هەروەها پێی وایە پەروەردە و فێرکردن، هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە ئامانج، بەڵام ئەوە کۆمەڵگەیە ئامانج دیاری دەکات نەك تاکەکان. کەواتە ئەرکی پەروەردە فێرکردن پاراستن و ماناوەی کۆمەڵگە بە کۆمەڵایەتیبوونی تاکە. پۆلی وانە خوێندنیش وەك کۆمەڵگەیەکی بچوك شیدەکاتەوە کە هۆکاری بە کۆمەڵایەتیبوونە. کۆمەڵگە و پەروەردە ڕەنگدانەوەی یەکترن. گۆڕانی پەروەردە هەمیشە گۆڕانی کۆمەڵایەتیە.

ئەو ڕەخنانەی لە دۆرکهایم دەگیرێت ئەوەیە کە وا نیشاندەدات تاك بێتوانا و بێدەسەڵاتە لەوەی کە شێوەیەك بە ژیانی خۆی ببەخشێت، مەگەر کۆمەڵگە ڕێگەی پێبدات. خاڵێکیتر مرۆڤی ئایدیاڵی کۆمەڵگە بگوازێتەوە، بەڵام ئەم مرۆڤە ئایدیالە چیە و لە کوێیە؟ بۆ نمونە مامۆستا، فێرخوازێك کە ڕۆحی هاوکاری هەبێت ستایش دەکات، بەڵام سیستەمی فێرکدن ستایش فێرخوازێك دەکات کە خاوەن بەرزترین نمرەیە. کەواتە ناتوانین بە ئاسانی بڵیین کە سیستەمی پەروەردە چ جۆرە ئایدیایەك بۆ فێرخوازان دەگوازێتەوە.

تاڵکۆت پارسۆنز

هەمیشە هۆگری تیۆرێك بووە کە بتوانێت مرۆڤ و کۆمەڵگە بگرێتە خۆی. پێوابوو مانەوە و بەردەوامبوونی بونیادی کۆمەڵایەتی، پەیوەستە بە دڵنیابوونی ئەم چوار ئەرکە:

١- هاوتایی: سیستەمی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ژینگەی کۆمەڵایەتی و ناکۆمەڵایەتی خۆی بگونجێنێت.
٢- بەدەستهێنانی ئامانج: هەموو سەرچاوەکان لەدەست کۆمەڵگەدا بێت.
٣- یەکپارچەیی: مەبەست لە پاراستنی سیستەمی دەرونیە، ئەمەش بە هۆی ئاین و بەها هاوبەشەکانەوە بەدیدێت.
٤- پاراستنی شێوە، یان بەڕێوبردنی ئاڵۆزی: پارسۆنز هەوڵیدا چەمکی کردار لە ڕەفتار جیابکاتەوە، چونکە ڕەفتار ئاماژەیە بە جۆرە کردەوەیەکی میکانیکی، لە کاتێکدا کردەوە جۆرە پرۆسەیەکی چالاك، داهێنەر و زهنیە. لەبەر ئەوە کردەوە بە پێچەوانەی ڕەفتارەوە، خۆویستە و تاك سەربەستە لە ئەنجامدانی.

پارسۆنز دەڵێت توشی کێشەیەکی دوو لایەن بوینەتەوە:

یەکەم: چۆن قوتابخانە توانا و پێداویستیە دەرونییەکان دابین دەکات، بۆ ئەوەی فێرخوازێکی سەرکەوتوو دروستبکات؟

دووەم: ئەوەی کە چۆن قوتابخانە توانا مرۆییەکان لە ناو بونیادی کۆمەڵگەوە دەهێنێتە ناو کاری جیاوازەوە؟

گریمانەکەی پارسۆنز ئەوەیە کە لە کۆتاییدا هەموو سیستەمە کۆمەڵایەتیەکان، خاوەنی بەهای لەیەکچوو و هاوبەشن و لەگەڵ بوونی جیاوازی وکەش. ڕەخنەگرام ئەم گریمانەیە وەك گەورەترین خاڵی لاوازی ئەم دیدگایە دەبینن، ئەو بەڵگەیەی کە دەکرێ لە کۆمەڵگەدا بەهای ناسازگار بوونی هەبێت. نمونە ئەو بەهایانەی کە پارێزگاری لە ئازادی کەسێکی توندرەو دەکات لەبەرامبەر  ئەو بەهایانەی کە جەخت لە لێپرسراوێتی تاك لە بەرامبەر کۆمەڵ دەکات. خاڵی لاوازی دووەم، ڕونکردنەوە هەر شتێ لەسەر بنەمای ئەرکەکەی، ناتوانرێت بە ڕونکردنەوەیەکی گونجاو دابنرێت. لە کۆمەڵگەی ناتەبا و لەیەك نەچوو، لەوانەیە هەر گروپێکی بچوك بەرنامەی تایبەت بە قوتابخانەی هەبێت و بە دوای بەرژەوەندی خۆیەوە بێت. هەروەها رەخنەیەکیتری لێدەگیرێت لەسەر ئەوەی تیشکی نەخستوەتە سەر ناوەڕۆکی پرۆسەی خوێندن؛ واتە ئەوەی کە چ شتێك فێری منداڵان دەکرێ و چۆن فێر دەکرێ؟

بە بڕوای پارسۆنز ڕزگاربوون لە نایەکسانی کارێکی نەکردەییە، چونکە هەندێك لە تاکەکان بەهایەکی گرنگتریان هەیە بۆ کۆمەڵگە. پارسۆنز پێی وایە کە نایەکسانی تا ڕادەیەك بۆ کۆمەڵگە سودمەندە، چونکە تاکەکان دەجوڵێنێت و هانیان دەدات تا هەوڵبدەن بە پێگەیەکی بەرزتر بگەن.

تا دەیەی ١٩٥٠ ئەرکگەرایی بەسەر کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن لە ئەمریکا باڵادەستبوو. لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیەوە، ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت شەڕی ساردیان دەستپێکرد، هەردوو لایان گرنگیان بە سیستەمی پەروەردە و فێرکردنی خۆیاندا تا بەسەر یەکتردا زاڵبن. ئەرکگەراکان باوەڕیان وایە لە ژینگەی قوتابخانەدا جیاوازی توانای تاکەکاندا هەیە، دەبێە هۆی جیاکردنەوەی منداڵەکان نەك جیاکردنەوەی گروپەکان.

دووەم: ئەزمونگەرایی: لە سەدەی بیستەمدا گفتوگۆ دەربارەی نایەکسانی چینایەتی، نەژادی و ڕەگەزی لە ناوەندە سیاسیەکاندا مشتومڕی دروستکردبوو. لە ئاستی تیۆریدا مارکسیەکان و لایەنگرانی تیۆری ململانێ، گرنگیان بەم بابەتانە دەدا. هەندێ کات ئەو

توێژینەوانە لە بارەی نایەکسانیەوە ئەنجامدراون بە میتۆدۆلۆژی ئەزمونگەرایی ناودبرێن. لەو سەردەمەدا میتۆدۆی ئەزمونگەرایی بە خێرایی لە کۆمەڵناسی پەروەردەیدا برەوی سەند، ڕۆڵی گرنگی لە پێشکەوتنی توێژینەوە دەربارەی خوێندن و نایەکسانی کۆمەڵایەتیدا گێڕاوە.

توێژینەوەی بلاو و دانکان

یەکێك لە کاریگەرترین توێژینەوەکانی بواری ئەزمونگەرایی کتێبی بلاو و دانکان لە ساڵی (١٩٦٧)بوو، بابەتی سەرەکی ئەم کتێبە جوڵەی کار و ڕۆڵی پەروەردە و فێرکردنە لە گواستنەوەی نایەکسانی نێوان نەوە جیاوازەکادا. گرنگی ئەم کتێبە لەبەر نوێگەری میتۆدۆلۆژیەکەیەتی کە میتۆدی شیکردنەوەی ڕێگەبوو.

ڕاپۆرتی کۆلیمان

توێژینەوەکەی کۆلیمان بە ناوی (یەکسانی دەرفەتی پەروەردەیی) زیاتر لایەنی بەکارهێنان و داڕێژەری سیاسەتی لە خۆگرتووە. توێژینەوەکە دەریخستوە ئاسانکاریەکانی قوتابخانە کاریگەری کەمی لەسەر سەرکەوتنی فێرخوازدا هەیە، ئەنجامی چاوەڕوانەکراوی توێژینەوەکە ئەوەبوو کە دابەشکردنی سەرچاوەی ماددی لە سیستەمی فێرکردندا تا ڕادەیەك یەکسانبوو. ئەم توێژینەوە نیشانیداوە کە پێگەی خانەوادە بۆ سەرکەوتنی فێرخواز گرنگترە لە تایبەتمەندیەکانی قوتابخانە. بە مانایەکیتر خێزان پێش قوتابخانە بەرپرسی کەوتن  و بێتوانایی فێرخوازانن.

توێژینەوەی کریستۆڤەر جنکیز

توێژینەوە ئەزمونیەکەی کریستۆڤەر لە ١٩٧٢ ئەنجامدرا، لە توێژینەوەکەی بەو ئەنجامە گەشت کە کۆمەڵگەی ئەمریکی پێش هەر کارێکیتر پێویستی بە یەکسانی هەیە، بەڵام ژیانی ناوەوەی قوتابخانەی لەبەرچاونەگرت.

تیۆری سەرمایەی مرۆیی

تیۆری ئابوری پەروەردە و فێرکردن لە تیۆرەکانی تیۆدۆر شۆڵتزە. شۆڵتز لە ساڵی ١٩٦٠دا ڕایگەیاند کە بەدەستهێنانی بەهرە و زانست لە ڕێگای پەروەردە و فێرکردنەوە نابێ وەك بەکارهێنان بەڵکو وەك وەبەرهێنان دابنرێت. تیۆری شۆڵتز لەگەڵ بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی سەردەمەکەیدا زۆر گونجاوبوو. داڤیس و مۆری لەو باوەڕەدان کە کاری

فێرکاری  پزیشکی لەگەڵ زەحمەتی زۆر و تێچووی زۆر، ئەگەر پیەی پزیشکی پاداشتی گونجاوی  بۆ ئەم گیان بەخشین و سەرمایەگوزاریە لەگەل نەبێت، ئەوا کەس بەدوای ئەم پیشەیە ناکەوێت.

تیۆری سەرمایەی مرۆیی بە شوێن هەمان گریمانەی نۆرمی جمجوڵی ڕکابەریدا دەکەوێت. لەسەر بنەمای ئەم گریمانیە، دامەزراوەی قوتابخانە و کار، دەرفەتێك پێشکەشدەکەن و سەرکەوتنی تاك لەم دەرفەتە پەیوەستە بەوەی تا چەند هەوڵ و کۆششیداوە و تا چەند فێربووە. لەسەر بنەمای ئەم تیۆرە، سێ هۆکار سەرمایەی مرۆیی تا پێکدەهێنن ئەوانیش: توانایی، ڕاهێنان، پەروەردە. لەم تیۆرەدا تاك کەرەستەی یەکەم و سەرەکیە. لە دایکبوونی هەرکەسێك پەیوەستە بە توانا و ڕێژەی سەرمایەگوزاریەکەی. بە بڕوای شۆڵتز، کەمدەرامەتەکان کەسانێکن کە سەرمایەگوزاری زۆریان لە پەروەردە و فێرکردنی تایبەت بە خۆیان نییە.

ڕێکخراوی ئابوری و گەشە لە ١٩١دا کۆنفرانسی خۆی لە واشنطن دەستپێکرد، بەڵگەکانی خستەڕوو کە سەرمایەگوزاری لە پەروەردە و فێرکردندا لە دوو ڕێگەوە گەشەی ئابوری ئاسان دەکات:

١- لە ڕێگەی بەهێزکردن و نوێگەری تەکنەلۆژیا.
٢- لە ڕێگەی زیادبوونی کاری تازەدا.

ڕەخنەی تیۆری سەرمایەی مرۆیی

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥دا  بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە ئەم پرسیارە دروستبوو، ئایا زیادکردنی خەرجیەکانی لە پەروەردە و فێرکردندا، هۆکارێکی کاریگەرە بۆ گەیشتن بە پێشکەوتنی ئابوری و دادپەروەری کۆمەڵایەتی نا؟ توێژینەوەی بلویستن دەریخستوە لەناوبردنی هەژاری زیاتر پەیوەستە بە جۆری کارەکەوە نەك سەرمایەگوزاری لە هێزی مرۆییدایە. هەندێکیتریان ئەم پرسیارەیان کرد ئایا ستراتیژی پەرورەدەیی کاریگەری لەسەر دابەشکردنی داهاتدا هەیە نا یان نا؟ لیستێر سۆرۆ دەڵێت: لە کۆتایی دەیەکاندا لە ئەمریکا سەرکەوتنی فێرخوازان یەکسان وەك یەکبووە، لە کاتێکدا نایەکسانی لە داهات بەهەمان شێوەی پێشوو ماوەتەوە نەگۆڕاوە. خاوەنکار کەسانێکی دەوێت کە خەرجی زیادی لەسەر نەکەوێ.

ماسیۆ پاچی ئابوریناسی ئیتاڵی شیکردنەوەیەکی مێژوویی ئەنجامدا سەبارەت بە پەیوەندی خوێندن و بنەمای کار و پیشە. پاچی دەربارەی قۆناغەکانی گەشەی بازاری کاری سەرمایەداری سێ قۆناغ دیاریدەکات:

قوناغی یەکەم: لە نێوان هێزی کار و توانای مرۆیی نەگونجان هەیە، گەشەی دانیشتوان هێزی کار زیاتر دەکات. قۆناغی دووەم: برەوسەندنی پیشەسازی گەورەیە، لەم قۆناغەدا تا ڕادەیەك پێویستی بە توانای مرۆیی زیاتری هەیە. قۆناغی سێیەم: قۆناغی سەرمایەداری پاوانکراوە و لەم سەردەمەدا گەشەی زۆری سیستەمی پەروەردە و فێرکردن بووە هۆی ناهاوسەنگی لە بازاڕی کار و دروستبونی کێشە و ململانێ لە کۆمەڵگەدا. لەسەر بنەمای ئەم تیۆرەدا، هۆکاری هەژاری وڵاتانی جیهانی سێیەم ئابوری نێودەوڵەتی نییە، بەڵکو سەرچاوەکەی لە ناوخۆدایە، بە تایبەت بە هۆی سەرمایەی مرۆییەوەیە. پێشکەوتنی ئەم کۆمەڵگایانە لە کاتێکدا ڕوودەدات کە بتوانن سەرچاوە مرۆیەکانی خۆیان باشتر بکەن.

تیۆری مارکسیستی

مارکس زیاتر گرنگی بە پەیوەندی نێوان پەروەردە و فێرکردن و کۆمەڵگەداوە نەك بە گەشەی کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن. تێڕوانینی سەرەکی مارکس پەیوەستبووە بەو پەروەردەیەوە کە منداڵانی چینی کرێکار وەریاندەگرت. هەروەها باوەڕی وابوو پەروەردە و فێرکردن لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا، ئامرازێکە چینی باڵادەست بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاریدەهێنێت. چینی باڵادەست پاوانخوازی بەسەر پەروەردە و فێرکردنەوە دەکات و لەم ڕێگەیەوە چینی کرێکارێك دروستدەکات کە لەبەرژەوەندی خۆی بێت. بە سەرنجدان بەو ڕاستیەی کە کۆمەڵناسی زیاتر لە ژێر کاریگەری زەمینە و بارودۆخی کۆمەڵایەتیدایە، تیۆری ئەرکگەرایی زیاتر گونجاوە لەگەڵ بارودۆخی ١٩٥٠ و تیۆری ململانێ لەگەڵ بارودۆخی ١٩٦٠.

مارکسیە بونیادگەرا و ویستگەراکان

بونیادگەرایی مارکسیستی تێکەڵەیەکە لە دوو قوتابخانەی مارکسیزم و بونیادگەرایی. کاری سەرەکیان لەگەڵ بونیادە وەستاوەکانە نەك پرۆسە مێژوییەکان.

لە ساڵانی ١٩٦٠ بۆ ١٩٧٠دا بۆچونیان وایە کە بونیادەکانی کۆمەڵگە و بەتایبەتی بونیادی ئابوری، ڕەفتاری کۆمەڵایەتی دیاری دەکات.

لوی ئاڵتوسێر

به بڕوای ئاڵتوسێر

پایەی ئابوری بونیادی کۆمەڵگە دیاریدەکات.  لە ڕوانگەی ئاڵتوسێرەوە لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا، دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان وەك پەروەردە و فێرکردن، ئاین و هێزی سەربازی لە بەرژەوەندی دەوڵت کاردەکەن، دەوڵەتیش لە ژێر دەستی چینی سەرمایەداریدایە. لە دیدی ئەودا قوتابخانە ڕۆڵی بەرهەمهێنانەوەی کلتور دەبینێت، لەبەر ئەوە قوتابخانە ئامرازێکی بێلایەن نییە، بەڵکو ئامرازێکی ئایدۆلۆژی دەوڵەتە. دەوڵەت بە شێوەیەکی گشتی دەزگایەکی چەوسێنەرە کە دەسەڵاتی چینی فەرمانڕەوا بەسەر چینی کرێکاردا دەسەپێنێت. دەوڵەت بە گشتی دەزگایەکی چەوسێنەرە کە دەسەڵاتی چینی فەرمانڕەوا بەسەر چینی کرێکاردا دەسەپێنێت لە لایەن کۆمەڵێك دەزگای چەوسێنەری وەك پۆلیس و هێزی چەکدار، لەلایەکیتریشەوە کۆمەڵێك دەزگای ئایدۆلۆژیەوە وەك پەروەردە و فێرکردن، قوتابخانە وەك دەزگایەکی سەرمایەداری زیاتر وەك دەزگایەکی ئایدۆلۆژی کاردەکات، لە ڕێگای ئامرازە نابەرجەستەیەکانەوە لە هەوڵی هێشتنەوەی بارودۆخی باودایە.

ڕەخنەگران لەو باوەڕەدان کە لێکچونی زۆر لە نێوان شیکردنەوەی ئاڵتوسێر بۆ قوتابخانە و ئەرکگەرایی پارسۆنز بوونی هەیە. هەردوو دیدگاکە مرۆڤ بە ناچالاك دادەنێن و بڕوایان وایە کە مرۆڤ زیاتر لە ژێر کاریگەریدایە و کەمتر کاریگەری دروستدەکات.

ئەنتۆنیۆ گرامشی (١٨٩١-١٩٣٧)

گرامشی هەوڵیدا تا ڕەنسیبە سەرەکیەکانی تیۆری مارکسیزم سەر لەنوێ پێناسە بکاتەوە. گرامشی باوەڕی وابوو کە ناتوانین دەسەڵات و هەژمونی سەرمایە ببەستینەوە بە زۆرەملێی دەوڵەتی سەرمایەداری. مارکسیەکان جەخت لەسەر ئابوری دەکەنەوە بەسەر لایەنەکانیتردا، بەڵام گرامشی جەخت لە پێشەنگی کولتوری و هەژمونی دەکاتەوە، هەژمونیش دوو مانای هەیە:

یەکەم: هەژمونی پەیوەست بە پرۆسەی ناو کۆمەڵگەی مەدەنی کە بە هۆیەوە چینێك فەرمانڕەوایەتی فکری و ئەخلاقی خۆی بەسەر چینەکانیتردا دەسەپێنێت.

دووەم: لێرەدا هەژمون بە مانای پەیوەندی نێوان چینی باڵادەست و ژینی ژێردەستەیە، هەوڵی چینی باڵادەستە بۆ کۆنترۆڵی سەرچاوەکانی کۆمەڵگە لە ڕێگەی ئامرازەکانی پەیوەندی گشتی و سیستەمی پەروەردە و فێرکردنەوە.

گرامشی باوەڕی وایە کە شێوەکانی دەسەڵات لە کۆمەڵگەی پیشەسازیدا لە حاڵەتی گۆڕاندان. لەگەڵ سەرهەڵدانی تەکنەلۆژیا کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی زیاتر لە ڕێگەی بەها و نۆرمەکانەوە سەرچاوە دەگرێت تا لە ڕێگەی هێزەکانی پۆلیس و سوپاوە، گرامشی ئەمجۆرە کۆنترۆڵکردنە ناو دەنێت هە١موونی ئایدەلۆژیکی، کۆنترۆڵێکە نەك تەنیا ئاگایی بەڵکو ڕەفتاری تاکیش دەگۆڕێت. شیکردنەوەی هەژمونی ئایدۆلۆژیکی بۆیە گرنگە چونکە دەریدەخات کە چۆن دەستەبژێرانی فەرمانڕەوا بۆ بەۆهەمهێنانەوەی دەسەڵاتی سیاسی و ئابوری خۆیان، سود لە هەژمونی کلتوری وەردەگرن. بە بڕوای گرامشی دەسەڵاتی چینی فەرمانڕەوا بە تەواوەتی لە قوتابخانە ڕەنگنەداتەوە لەبەرئەوە قوتابخانە دەتوانێت هۆکارێك بێت بۆ گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە تایبەتی بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتی سیستەمی سەرمایەداری. لەم لایەنەوە تیۆری ویستگەرایانەی گرامشی نزیکە لەگەڵ بۆچونەکانی فرانکفۆرتدا بڕوایان وایە گۆڕانکاری لە سەرمایەدارییەوە بۆ سۆسیالیزم دەکرێ لە ڕێگەی ئامرازەکانیتر جگە لە شۆڕشکێڕییەوە دروست بێت وەك ئاگایی و هۆشیاری ڕەخنەیی.

ماکس ڤیبەر(١٨٦٤-١٩٢٠)

هەرگیز بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هیچی لە بارەی پەروەردە و فێرکردنەوە نەنوسیوە، لە نوسینەکانیدا گرنگی زۆری بە پێشکەوتنی عەقڵانیەت و گەشەی بیرۆکراسیداوە لە کۆمەڵگەی نوێدا.ڤیبەر دەڵێت: هەمیشە خوێندنی زانکۆیی هۆمارێکی بەسود بووە بۆ گەیشتن بە پێگەیەك کە جێی شانازی تاکەکان بووە. ڤیبەر پێی وایە کاری بنەرەتی قوتابخانە فێرکردنی کلتورێکی پێگەیی تایبەتە، چ لە ناو پۆل یان دەرەوەی پۆل پەیوەندی دەسەڵات و ناکۆکی بەرژەوەندی تاك و گروپەکان لە کۆمەڵگەدا کاریگەری لەسەر سیستەمی فێرکردن دادەنێت، چونکە ئەوە ئامانج و سودی گروپە باڵادەستەکانە کە شێوەی قوتابخان دیاری دەکەن. دژایەتی کۆمەڵگەش سێ لایەنە: خاوەندارێتی موڵ، بارودۆخی کلتوری و جیاوازی لە دەسەلات. لای ڤیبەر پرۆسەی پێشکەوتنی بیرۆکراسی لە کۆمەڵگەدا پەیوەستە بە: دەسەڵاتی نەریت (لەسەر بنەمای باوەڕبوون بە پیرۆزی نەریتە)، توانای کاریزمایی (پشت ئەستورە بە تایبەتمەندیەکانی تاك)، دەسەڵاتی عەقڵانی

(لەسەر بنەمای یاساییبوونی بڕیارەکان)ە. گەورەترین تایبەتمەندی ڤیبەر ئەوەیە وەك ڕێکخراو سەیری قوتابخانەی کردووە.

باسی سێیەم

تیۆرە نوێیەکانی کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن

پارادایمی ڕەخنەیی

بێگومان قوتابخانە منداڵان فێری بەهرەی زانستی دەکات و توانای زەینی فێرخوازان زیاتر دەکات، بەڵام نازانرێت ئەم بەهرانە دەتوانن پەیوەندی نێوان پەروەردە و فێرکردن پێگەی کار و داهاتی تاك ڕونبکەنەوە یان نا؟ وا نایەتە بەرچاو کە فرازانبوونی پەروەردە و فێرکردن هەمان ئەنجام بەدەستبهێنێت. پارادایمی ڕەخنەیی لەو باوەڕەدایە کە قوتابخانە پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ کۆمەڵگە هەیە، بەڵام قوتابخانە زیاتر پەیوەندی لەگەل داواکاریەکانی دەستەبژێردا هەیە تا لەگەل پێداویستیەکانی کۆمەڵگە، بۆ سودی دەستەبژێر کاردەکات و جیاوازیەکان بەهێزتر دەکات، تێڕوانینی تایبەت لە تاکدا دروستدەکات تا ئەو بارودۆخەی تیایەتی قبوڵی بکات. پەروەردەی فەرمی زیاتر کار لەسەر گوێڕایەڵی فەرمی دەکاتەوە تا بەدەستهنانی بەهرە زانستیەکان.

پارادایمی ئەرکگەرایی، قوتابخانە بە میکانزمێکی کاریگەر دادەنێت بۆ دیاریکردنی تاکێکی ئامادە و ئامرازێك بۆ دروستکردنی بەهرە زانستیەکان، پارادایمی ئەرکگەرایی کاتێ دروستبوو کە زەمینەی هزری زۆر گەشبینبوو سەبارەت بە تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگەی نوێ و داهاتوو.

لە دوای ساڵانی ١٩٧٠وە تێڕوانینی خۆشبینیەکان سەبارەت بە دونیا خرایە ژێر پرسیارەوە، بەم شێوەیە تەنانەت گومان خرایە سەر قوتابخانە و ئەوەی لە قوتابخانە فێری منداڵان بکرێت. لە جیاتی ئەوەی وا سەیری قوتابخانە بکری کە دامەزراوەیەکە بەها و تێڕوانینی گونجاو فێری منداڵان دەکات بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی دیموکرات و کراوە، بەڵام بە پێچەوانەوە ەك ناوەندێك سەیر دەکرا کە بیروڕاکانی چینی ناوەڕاست فێری منداڵان دەکات. لەبری ئەوەی فێریان بکات لە پێناو خۆیان بیربکەنەوە، فێریان دەکات لەگەل بەها بازرگانیەکان خۆیان بگونجێنن. لەم سیستەمە فیرخوازی سەرکەوتوو ئەوە نەبوو کە لەوانیتر داهێنەرتر و زیرەکتر بێت، بەڵکو دەبێت فێرخواز فێربێت چۆن یاسای یاریەکەیان جێبەجێدەکات و گوێڕایەڵی ئەوان بێت.

لەسەر بنەمای تیۆری لیبراڵی، قوتابخانە ئامرازێکە لە ڕێگەیەوە کەسانی لاواز و بێتوانا دەتوانن پێگەی بەرزتر بەدەستبهێنن، بەڵام نوسەرانی ڕەخنەگر لەو باوەڕەدان کە قوتابخانە دامەزراوەیەکە سەرقاڵی بەرهەمهێنانەوەی ئایدۆلۆژی چینی باڵادەست و هێزی کارە. خاڵی لێکچونی ئەم دوو دیدگایە ئەوەیە لە کۆتایدا پەروەردە و فێرکردن لە ناو سیستەمی سەرمایەداریدا لە خزمەتی دەسەڵاتدایە. لای ڕەخنەگران قوتابخانە ویستی گۆڕانی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی نییە و شوێنکەوتەی ڕێکخستنی سیاسی و ئابوریە.

پاولۆ فرێری

فرێری فەیلەسوف و ڕۆشنبیری بەڕازیلی پاش کودەتای سەربازی لە ١٦٤ لە وڵاتی خۆی دورخرایەوە. لە نوسینەکانیدا زیاتر پابەندی کردەی کلتوری بوو. بە بڕوای فرێری ئەرکی مێژوویی مرۆڤ، گۆڕینی بارودۆخەکان و دروستکردنی بارودۆخێکی تازەیە، چونکە مرۆڤ خۆی ڕاستیەکان دروستدەکات، کاتێکیش مرۆڤ دەگۆڕێت ئەوا گۆڕانی کۆمەڵایەتیشی بەدوادا دێت. بۆسە چەمکی بنەڕەتی لە تیۆری فرێریدا مرۆڤبونی مرۆڤە.

فرێری هەوڵی شیکردنەوەی پەروەردە و فێرکردنی وەك ئامرازێکی کرداری کلتوری داوە، ئامرازێك کە هاودەنگی و دیسپلینی کۆمەڵگە و زەینی نەوەی نوێ بچەسپێنێت. پەروەردەو فێرکردن هەرگیز ناتوانێت بێلایەن بێت (پەروەردە و فێرکردنی بێلایەن بوونی نییە)، سروشتی سیاسی پەروەردە و فێرکردن پەیوەستە بەوەی چ کەسێك بەرهەمی هێناوە ئەم دامەزراوەیە بە سودی کام گروپ کاردەکات؟

کتێبەکەی بە ناوی پێداگۆگی ستەملێکراوان سەرەتا بە شیکردنەوەی پەروەردە و فێرکردنی دەستەمۆ یان پەرورەدەی بانکی دەستپێدەکات. پێیوایە لە سیستەمی دەسەڵاتی ستەمکاریدا، پەروەردە و فێرکردن شێوەیەکی تایبەت وەردەگرێت کە ئەو ناوی ناوە گێڕانەوە ، بە سیستەمی باکی دەیچوێنێ، لێرەدا فێرخواز ڕۆڵی کۆگا و ئەنبارێك دەبینێت کە سنورێکی بۆ دانراوە تا فێری بەدەستهێنان و پاراستن و بەکارهێنانی داتاکان بێت. پەیوەندی مامۆستا و فێرخواز پەیوەندیەکی یەکلایەنانەیە. فێرخواز تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەستە بە بڕیارەکانی مامۆستاوە، لەوها سیستەمێکدا فێرخواز دەبێتە بونەوەرێکی ناچالاك کە توانای نییە تەنانەت هەست بە سروشتی ئەزمونی خۆشی بکات.

فرێری جەخت لەوە دەکاتەوە یەکێك لە مەرجەکانی ئازادبوون لە بارودۆخی خراپی دەسەڵات، جۆرێك چالاکیەکی پەروەردەییە دەبێتە هۆی ئاگایی سیاسی. پەروەردەی نوێیە ئەم پەروەردەیەش پێویستە لەسەر بنەمای گفتوگۆی دولایەنی نێوان مامۆستا و

فێرخواز بێت، مامۆستا دەبێتە فێرخواز و فێرخوازیش دەبێتە مامۆستا. یەکێك لە خاڵە جیاکەرەوەکانی کارەکانی فێرکردن بە مەرجی سەرەکی بۆ گۆڕانی ئابوری دادەنێت، نە یەکێك لە کارتێکەرەکانی گۆڕانی ئابوری.

فرێری بەردەوام جەختی لەوە دەکردەوە کە قوتابخانە پرۆسەیەکی بێلایەن نییە. ڕاگەیاندنی بێلایەنی قوتابخانە، یەك ئایدۆلۆژیای نەریتییە کە ئەرکی سیاسی قوتابخانە دەشارێتەوە. بە مانایەکیتر زانین کۆمەڵە زانیاریەك نییە، بەڵکو زانین سەرچاوەکەی لە کرداری مرۆڤدایە و پەیوەستە بە نۆرم و سوود و ئارەزوەکانی مرۆڤە. فرێری دەڵێت: ئەو کەسانەی کاری پەروەردەی دەکەن، دەبێت بە شێوەکی بەردەوام میتۆدی تازە بدۆزنەوە تا هاوکاری فێرخوازان بکەن کە زانین بابەتێکی کێشەدارە. بە پێچەوانەی پەروەردەی بانکی کە ڕێگری لە داهێنانی فێرخوازان دەکات، پەروەردە و فێرکردنی ڕادیکاڵ بە شوێن پەیوەندی کۆمەڵایەتیەوەیە. فرێری وەك گرامشی زیاتر جەخت لەوە دەکاتەوە ك چۆن ئامرازەکانی ئایدۆلۆژی دەبنە هۆی گوێڕایەڵی و ژێردەستەیی مرۆڤەکان.

ئیڤان ئیلچ

لەدەیەی ١٩٧٠دا لێکۆڵینەوە جیاوازەکان دەریانخستووە ك کاریگەری قوتابخانە لەسەر گۆڕانی کۆمەڵگە زۆر لەوە کەمترە لەوەی کە گریمانە دەکرا، ئەم تێڕوانینەش سەرنجی زۆر کەسی ڕاکێشا.ئیڤان باوەڕی وایە کڵێسا هۆکاری نابودی ئاینە، نەخۆشخانە هۆکاری لاوازی تەندروستیە، قوتابخانە هۆکاری لاوازی پەروەردە و فێرکردن. هەموو ئەم دامەزراوانە بە لاڕێدەر و ئاڵودەبوون ناو دەبات.

بڵابونەوەی کتێبی ئیڤان لە ١٩٦٩دا بە ناوی دەرهێنانی قوتابخانە لە کۆمەڵگە بیرکردنەوەی ڕۆژئاوایی سەبارەت بە پەروەردە و فێرکردنی فەرمی بە تەواوەتی گۆڕی، هەرچەندە پێش ئیڤانیش زۆر لە ڕوناکبیران ڕەخنەیان لە قوتابخانە گرتبوو وەك هێربەرت کۆهل و جۆن جەیمس، بەڵام ئیڤان ویستی سڕینەوەی پەروەردە و فێرکردنی هەبوو، هەروەها دەڵێت کۆمەڵگە نابێت پەروەردە و فێرکردنی زۆرە ملێ بسەپێنێت، پێویستە یاسادانەران یاسایەك دابنێن کە خاوەن کارەکان مافی ئەوەیان نەبێت تاکەکان لەسەر بنەمای ئاستی خوێندن دابمەزرێنن. باوەڕی وایە پەورەدە وفێرکردن منداڵ فێردەکات لە زاتی خۆیدا بونەوەرێکی بێبایەخە.

قوتابخانە جۆرێك لە دیدگای بیرۆکراسی و بازرگانی سەبارەت بە جیهان ئاشنای منداڵان دەکات، قوتابخانە فێرخوازان فێردەکات کە بایەخ بە پێشکەوتنی ئابوری و شتومەکی

ماددی بدەن. زانکۆی ئەم سەردەمە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە زانست و زانیاری لە دەست ئەودایە، قوتابخانەش پەیامی بۆ فێرخوازان ئەوەیە کە بە بێ ئامادەبونیان لە قوتابخانە ناتوانن هیچ شتێکی بایەخدار فێربن. ئیلچ بۆچونی وایە کە پەروەردە و فێرکردنی ناچاری بۆ منداڵان، میتۆدێکی زۆر ناکاریگەرە بۆ زیادکردنی خوێندەواری لە کۆمەڵگە هەژارەکاندا، قوتابخانە لە بڕی زیادکردنی زانین و عەقڵانیەت هەستی سەربەخۆی فکری لای مندال لە ناو دەبات.

تیۆری بەرهەمهێنانەوە

مارکس دەڵێت: سیستەمی پەروەردەیی بەردەوامی بە سیستەمی چینایەتی دەدات لە کۆمەڵگەدا، لەبەر ئەوە گروپە جیاوازەکان هەوڵی کۆنترۆڵی پەروەردە و فێرکدرن دەدەن. هەندێك پێیان وایە کە پەروەردە و فێرکدرن لە ڕاستیدا نایەکسانی کەمدەکاتەوە، بەڵام تیۆردانەرانی ململانێ بۆچونیان وایە ڕاستیدا پەروەردە و فێرکردن لە ڕاستیدا نایەکسانی دەسەڵات بەرهەم دەهێنێتەوە. بەها و دامەزراوەکانی کۆمەڵگە هەموویان ڕەنگدانەوەی سودی گروپی باڵادەست و چینی فەرمانڕەوان و پەروەردە و فێرکردن لەمانە بەدەر نییە. لەسەر بنەمای تیۆری بەرهەمهێنانەوە قوتابخانە بە شێوەیەك ڕێکخراوە کە تایبەتمەندی و سودەکانی تەنیا بۆ ئەو کەسانە بێت کە لە پێگە بەرزەکانی کۆمەڵگەدان. نا یەکسانی بەشێکە لە سیستەمی سەرمایەداری تا کاتێ کە خودی سەرمایەداری بوونی هەبێت، نایەکسانیش بوونی دەبێت. چینە بەرزەکان هەمیشە لە هەوڵی پاراستن و بەردەوامی سودی چینایەتی خۆیاندان. تیۆری بەرهەمهێنانەوە دوو بەشە:

یەکەم: تیۆری بەرهەمهێنانەی کۆمەڵایەتی

بۆلز و جینتیس لەو ڕوناکبیرانەن بۆ شیکردنەوەی سیستەمکانی پەروەردەیی، بەر لە هەموو شتێك سەرنجیان خستوەتە سەر تایبەتمەندی هێز و پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنان. بەهەر شێوەیەك بێت زاڵبونی چینی سەرمایداری بەبێ دژایەتی نابێت، بۆیە سیستەمی پەروەردە، قوتابخانە دەکات بە گۆڕەپانی ململانێ. ئەگەر سیستەمی سەرمایەداری بونی هەبێت نابەرانبەریش بوونی هەیە.لە کتێبە بەناو بانگەکەیان بە ناوی فێرکردنی قوتابخانەیی لە کۆمەڵگەی سەرمایەداری ئەمریکا ڕەخنەیەکی زۆریان لە ئیلچ ئیڤان گرتووە ، ڕەخنەشیان لە قوتابخانە ئەوەیە قوتابخانە پەیوەندیەکی نەپچراوە بە سیستەمی پیشەسازیەوە شتیکە زیاتر لە دەزگای ئایدۆلۆژی. پەروەردە و فێرکردن هۆکاری بەلاڕێدا بردنی سروشتی مرۆڤە دەبێتە هۆی لە خۆنامۆبون و بێ ئاگایی لە کۆمەڵگەدا.

تیۆری هاوشێوەیی: کەواتە شێوەی بەرهەمهێنان کەسایەتی مرۆڤەکان دروستدەکات، سیستەمی فێرکردن گەنجەکان لەگەڵ سیستەمی ئابوری ڕادەهێنێت. ئەم تیۆرە باوەڕی وایە کە فێرخوازانی چینی کرێکار بۆ کاری ئاستنزم و پەروەردە دەکرێن کە پێویستیان بە بەهرەی کەم هەیە، بەڵام فێرخوازانی چینی ناوەند و باڵا خاوەنی بەهرەی دەروونناسی زیاترن. ئەمە لێکچونی نێوان قوتابخانە و بازاڕی کارە.

خاوەن کارگەکان بە توندی لایەنگری قوتابخانە بوون، نەك لەبەر ئەوەی کە قوتابخانە منداڵان فێری خوێندەواری دەکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی خوێندەواری بۆ کاری کارگەکان پێویستە و سوودی هەیە، هەروەها قوتابخانە فێریان دەکات کە گرنگی بە ئامادەبوونی کاتی دیاریکراوی کارکردن بدەن و کاری سەخت بکەن و ڕێزی ئەو کەسانە بگرن کە لە پلەی بەرزدان.

دووەم: تیۆری بەرهەمهێنانەوەی کلتوری

ڕیشەی ئەم تیۆرە لە کارەکانی باسیل بیرنشتاین و پییێر بۆردیۆدا دەبینرێت. پێیان وایە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی سیستەمی فێرکردن وابەستەی ئەم بارودۆخە دەرەکیەیە و ئەرکی پەروەردە و فێرکردن گواستنەوەی میراتی کلتوری کۆمەڵگەیە، لەسەر بنەمای ئەم تیۆرە گرنگە بزانین لە قوتابخانە چ شتێ دەگوازرێتەوە.

باسیل لیرنشتاین ( بانگەشەکاری تێکەڵکردنی نوێ)

بابەتی سەرەکی بیرنشتاین گواستنەوەی گۆڕانی کلتورییە. لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠دا چوار وتاری دەربارەی گۆڕانکاری لە مەعریفە و پێکهاتەی دامەزراوی قوتابخانە نوسیوە هەوڵیداوە ڕێبازی کۆن و نوێی کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن تێکەڵ بکات. بڕوای وابوو توێژینەوەی پەورەردەیی بە شێوەیەك بێت کە هەم لایەنی بونیادی و هەم لایونی کاردانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی لە بەرچاو بگیرێت.

بیرنشتاین لە هەنگاوی یەکەمدا بونیادی کۆمەڵایەتی بە سیستەمێك لە نایەکسانی چینایەتی دەزانێت بڕوای وایە خێزان میکانزمی سەرەکسە لە ڕێگەیەوە کاریگەری ئەم بونیادە دەگوازرێتەوە.

پێگەی چینایەتی خێزان هۆکاری بنەڕەتی دیاریکردنی یاسای زمانناسی، ئەگەر ئاخاوتنی کرێکارێك لەگەڵ ئاخاوتنی خێزانێکی خاوەن پێگەی بەرز بەراورد بکەین جیاوازیەکان ئاشکرا دەبن، بابەتی ئاخاوتنەکەیان ڕەنگە یەك بابەت بێت، بەڵام جیاوازی نێوانیان لەو

وشانەی بەکاری دەهێنن زۆر جیاوازە، هەروەها لە شێوەی ڕێکخستن و زمانەوانییەوە لەو ڕستانەی دەریدەبڕن، ئەم دوو جیاوازیە بنەمای سەرەکی تیۆرەکەی بێرنشتاینە. شێوەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی کاریگەری لەسەر شێوەی ئاخاوتن هەیە و خودی ئاخاوتنیش کاریگەری لەسەر پەیوەندی کۆمەڵایەتی دادەنێت. منداڵی چینی کرێکار سود لە ڕێسای سوردا وەردەگرن کە سەرچاوەکەی بۆ دایکیان دەگەڕێتەوە بە تایبەت لە کاتی بە کۆمەڵایەتیبوونی منداڵەکە. ڕستەکان سادە و کورتن، بەڵام منداڵانی چینی ناوەڕاست سود لە زمانی فەرمی وەردەگرن ڕستەکانیان ئاڵۆز و درێژن هەروەها کۆد و تێروستەسەلی هەیە لە سەرمایەی کلتوری سودمەندترن، ئارەزووی فراوانکردنی پرسیار و وەڵامەکان دەکات. دواکەوتووی چینی کرێکار لە خوێندن تا ڕادەیەك پەیوەستە بە گواستنەوەی پرۆسەی زمانناسیەوە. ئەم جیاوازیە لەگەڵ هاتنی منداڵ بۆ قوتابخانە، گرنگی پەیدا دەکات، چونکە جۆری زمانناسی قبوڵکراو لە قوتابخانە هەمان یاسای تێروتەسەلیە. دوو ڕەخنەی سەرەکی لی بێرنشتاین: یەکەم: بابەتی سەرەکی بێرنشتاین زیاتر شێوەی گواستنەوەی زانینە نەوەك شێوەی بەدەستهێنانی. دووەم: پەیوەستە بە شێوەی تێکەشتنی ئەو بۆ دەسەڵات. بە بڕوای ئەو دەسەڵات هیچ پایەیەکی ماددی نییە، چونکە پێکهاتەی قوتابخانەی یەکسان کردووە بە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی.

پێیر بۆردیۆ

کارەکانی بۆردیۆ بە درێژکراوەی کارەکانی بێرنشتاین دادەنرێت. بە بڕوای هەردووکیان سەرچاوەی نابەرابەری لە کۆمەڵگادا زیاتر سروشتی کلتوری هەیە تا ئابوری. بۆردیۆ سودی لە چەمکی توندوتیژی ڕەمزی وەرگرتووە. بە ڕای بۆردیۆ چینی باڵادەست بە هۆی کۆنترۆڵکردنی پەروەردە و فێرکردنەوە، بەرهەمهێنانەوەی کلتوری تایبەت بە خۆیان دەپارێزن. کەواتە کلتورێك قوتابخانە دەیگوازێتەوە میراتی کلتوری گشتی نییە بەڵکو کلتوری چینی باڵادەستە، بۆیە قوتابخانە شێوەیەکە لە توندوتیژی ڕەمزی. قوتابخانە خاوەنی دوو ئەرکی سەرەکییە:

یەکەم: پارێزگاری لە کلتور، دووەم: بەرهەمهێنانەوەی کلتور. بە بڕوای بۆردیۆ تاك لە ڕێگەی خانەوادەکەیەوە فێری لێهاتووی کۆمەڵایەتی و زمانناسی و هەروەها تایبەتمەندی وەك شێوە و ڕێگە و میتۆدی کاردەبێت. ئەوە خێزانە کە چاوەڕوانی دەبەخشێت بە منداڵ دەربارەی ئایندەی و پێوەرەکانی سەرکەوتنی فێردەکات، زانیاری تایبەت بە بەهاکانی لەبارەی بەهاکانی قوتابخانە بۆ دەگوازێتەوە. چینی باڵادەست خاوەنی ڕەمزی وەك زمان و ئەدەب و نەریتە کە لە ڕێگەیانەوە شێوەی بیرکردنەو و مۆدێل یان نەۆیتی خۆی وەك

ڕێکخستنی سروشتی دەناسێنێ. بۆردیۆ دەریخستووە کە چینی فەرمانڕەوا بە پێی کات وردە وردە گرنگی بڕوانامەی خوێندن بۆ بەرهەمهێنانەوەی کلتوری خۆیانیان بۆ دەرکەوتووە، بە مانایەکیتر لە جیاتی گواستنەوەی موڵك و ماڵ بۆ منداڵەکانیان ناچاریان دەکەن تا بڕۆن بۆ زانکۆ تا بتوانن بڕوانامەی پێویست بۆ چونە بازاڕی کار بەدەست بهێنن.

ئەو زمانەی کە لەلایەن خێزانەوە فێری منداڵان دەکرێت وا لێکدەدرێتەوە کە منداڵان لە ڕووی کلتوریەوە تا چ ئاستێك لە قوتابخانە دوردەخاتەوە. ئەو زمانەی کە خێزان سودی لێوەردەگرێت گرنگترین بەربەستە بە تایبەت لە ساڵەکانی سەرەتای چوون بۆ قوتابخانە. زمانی هەر خێزانێك ناسێنەری بەشێك لە سەرمایەی کلتوری ئەوانە.

بە بڕوای تیۆرداڕێژەرانی تیۆری بەرهەمهێنانەوە، قوتابخانە بە شێوەیەکی نافەرمی لە ژێر کاریگەری هێزی ئابوری و سیاسیدایە. لەم ڕێگایەوە چینی فەرمانڕەوا خەریکی بەرهەمهێنانەوەی پەیوەندی کلتوریە لە کۆمەڵگەدا. شیکردنەوەی قەدەرێتی ئەم ڕوناکبیرانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤ هیچ ڕۆڵێکی لە گۆڕینی بارودۆخدا نییە.

جیرۆ و تیۆری بەرگری

لایەنگرانی دیگای لیبراڵی، بەرگری و ناڕەزایەتی وەك ڕەفتارێکی توندوتیژی بە نێگەتیڤ دەبینن. لە لایەکیتریشەوە لایەنگرانی دیدگای ڕەخنەیی هۆکاری ناوەوەی قوتابخانە لە بەرچاو ناگرن. بە شێوەیەکی گشتی تیۆری بەرهەمهێنانەوە باوەڕی وایە کە قوتابخانە لە ڕێگەی بەرهەمهێنانەوەی پەیوەندی نێوان گروپە جیاوازەکان ڕۆڵی گرنگ دەگێڕێت لە هێشتنەوەی بارودۆخی باو، چونکە وا دەکات منداڵی چینی کرێکار و چینی باڵادەست لە هەمان پێگەی  چینایەتی خۆیاندا بمێننەوە.

جیرۆر یەکێکە لە نوێنەرانی تیۆری بەرگری کە لە ڕێگەی کتێبەکەیەوە بە ناوی تیۆری بەرگری لە پەروەردە و فێرکردن، پێی وایە قوتابخانە سیستەمێکی چەوسێنەرە و تا ئاستێك لە سەربەخۆیی بەهرەمەندە. هەروەها ڕای وایە کە لە نێوان قوتابخانە و سیستەمی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەدا، هەم نەگونجان و هەم لەیەکچوون هەیە. لە ڕوانگەی تیۆری بەرگریەوە، قوتابخانە دامەزراوەیەکی تا ڕاڕادەیەك سەربەخۆیە کە نە تەنیا ئەگەری سەرهەڵدانی ڕەفتاری سەرپێچیکردن دەرەخسێنێت، بەڵکو بە جۆرێکیش سەرچاوەی ناتەباییە. قوتابخانە دامەزراوەیەکی ئابوری و سیاسی و کلتوری و ئایدۆلۆژیە. جیرۆ جەخت لەوە دەکاتەوە کە بەرنامەی پەروەردەیی جۆرێك لە گوتارە کە هەم

دەتوانێت دەسەڵات بێت و لە هەمان کاتدا ببێتە هۆکاریکێش بۆ ئازادی و سەربەخۆیی. ئەم تیۆرە جەخت لەوە دەکاتەوە کە پێویستە مامۆستا لە جیاتی پەیوەندی ڕەخنەیی لەگەڵ فێرخوازاندا هەبێت. بە بڕوای جیرۆ ئێمە پێویستمان بە خوێندەواری ڕەخنەیی و دەسەڵاتی کلتورییە. قوتابخانە دەرفەتی سنوردار بۆ قوتابیانی چینی خوارەوە دەرەخسێنێ. فێرخوازان زیاتر سەیری شێوەی ڕوکەشی قوتابخانە دەکەن تا ناوەڕۆك و سروشتەکەی. بەڵام ڕەخنە لەم تیۆرە گیراوە کە پەیوەندی قوتابخانە و کلتور و کۆمەڵگەی زۆر سادە نیشانداوە.

ڕاندال کۆلێنز و تیۆری ناکۆکی ڤیبەری نوێ

بە برِوای کۆلێنز قوتابخانە زیاتر وەك ئامرازێکە بۆ پاراستن و بەردەوامیدان بۆ پاراستن و بەردەوامیدان بە جیاوازیە کلتوریەکانی نێوان تاکەکان، نەك ئامرازێکی سەرمایەداری. کۆلێنز بۆچونی وایە فراوانبوونی سیستەمی پەروەردەیی بە تایبەت پەروەردەی باڵا، ئاماژەیە بە ڕکابەرایەتی گروپە بنەڕەتیەکان و کەمتر پەیوەستە بە نیاز و مەبەستە کۆمەڵایەتییەکان یان داواکاری کاروپیشە. بە بڕوای کۆلێنز کاری سەرەکی قوتابخانە فێرکردنی کلتوری تایبەتی هەندێ لە پێگە کۆمەڵایەتیەکانە. شەڕی نێوان گروپە باڵادەستەکان هەوڵی مۆنۆپۆلکردنی پێگە گرنگەکان دەدەن و گروپەکانی خوارەوە لە هەوڵی بەکارهێنانی ئەم پێگانەدان.

کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردنی نوێ

میکایل یۆنگ و تیۆری ڕاڤەکردن

بیرۆکەی پاردایمی کۆهین لە ساڵی ١٩٧٠دا بوو بە ئامرازی سودبەخش بۆ هەڵسەنگاندنی گۆرانکارییە سەرکیەکانی شێوازی بیرکردنەوە. بە برِزای کۆهین کۆمەڵێك لە باوەرەکان بەهاکان و هونەر کە لە نێوان ئەندامانی کۆمەلەیەکی پیشەییدا بڵاو و هاوبەشن، ئەوا شێوازی پەورەردە و توێژینەوەی ئەو کۆمەڵگەیە کۆنترۆل دەکەن.

کۆمەڵناسی پەرورەدە و فێرکردنی نوێ دیدگای ئەرکگەرایی دەربارەی کۆمەڵگە و مەعریفە و ڕەفتاری مرۆڤ ڕەتدەکاتەوە. بە برِوای زۆرکەس سەرهەڵدانی کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردنی نوێ بە بڵاوکردنەوەی کتێبی زانین و کۆنترۆلی میکایل یۆنگ لە ساڵی ١٩٧١دا دەستپێکردوە. لایەنگرانی پارادایمی نوێ باوەڕیان وایە کە ڕووداوە کۆمەڵایەتیەکان، ئەنجامی پرۆسەیەکی دیالیکتیکیە کە زیاتر لەسەر بنەمای بەها دژ بەیەکەکانن نەك

لەسەر بنەمای یەکترگرتن. یەکێك لە خاڵە ئەرێنیەکانی ئەم تیۆرە ئەوەیە کە مامۆستایان و فێرخوازان وەك بەرهەمهێنەر و بەکاربەری زانین دەبینێ.

توێژەرە لاوە گەنجەکانی بەریتانیا لایەنگری تیۆری ڕاڤەکردن بوون لەبەر ئەوەی شۆڕشەکان دژی کلتور بوون، بەڵام لە ئەمریکا توێژەرەکان زیاتر ڕێبازی ململانێیان بە گونجاو دادەنا لەبەر ئەوەی لە ئەمریکا زیاتر ڕادیکالیزمی سیاسی بوون.

بابەتە سەرەکیەکان لە ڕێبازی ڕاڤەکردندا:

توێژینەوەی ژینگەیی فێربوون: ئەو ژینگەیەی کە فێربوون تیایدا ئەنجامدەدرێت سێ لایەنە: پەیوەندی نێوان مامۆستا و فێرخواز، پەیوەندی ڕەمزی نێوان مامۆستا و فێرخواز، زانینێك کە پەیوەندی نێوانیان.

ڕەفتارکردن لە پۆلی وانە خوێندندا:

زمانی بەکارهێنراو لە پۆلی وانەوتنەوەدا: گرنگی زمان لە توێژینەوەی ئەرکی خوێندندا بە تەواوی ئاشکرایە. یەکێك لە دەستکەوتەکانی پارادایمی نوێ، هەوڵێك بووە تێگەشتنی پەیوەندی نێوان زمان و سەرکەوتنی خوێندن.

کۆمەلناسی پەروەردە و فێرکردنی نوێ دەیەوێت بزانێت دۆخی ناو پۆلی وانەوتنەوە چۆنە؟

باسی چوارەم

میتۆدەکانی لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن

کۆمەڵناسی پەرورەدە و فێرکردن هەمیشە بوارێك بووە بۆ توێژینەوە و پرۆسەی جیاوازەکانی پەروەردەیی لە ئاستی جۆراوجۆردا.

دوو پارادایمی کلاسیك

لە سەدەی بیستەم کێشمەکێشی نێوان دوو پارادایم دەبینرێن کە لە توێژینەوە پەروەردەیەکاندا سودیان لێوەرگیراوە. پارادایمی یەکەم پەیوەستە بە زانستی سروشتیەوە و جەخت لە چاودێری چەندایەتی ئەزمونی دەکاتەوە و بۆ شیکردنەوە سود لە ئامرازەکانی بیرکاری وەردەگرێت ئەرکی توێژەر ڕونکردنەوەیە (زانستی سروشتی هەوڵی ڕونکردنەوەی دیاردەکان دەدات)، پارادایمێکیتر کە سەرچاوەکەی زانستی مرۆییە جەخت لە زانیاری چۆنایەتی دەکاتەوە ( زانستی مرۆیی هەوڵدەدات بۆ تێگەشتن لە دیاردەکان). لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم کاتێك ئۆگەست کۆنت (پۆزەتیڤیزم) و جۆن ستیوارت میل گەشەیان بە ئەزمونگەرایلە کۆمەڵناسی و دەروونناسی دەدا. زانستی سروشتی پێشکەوتنی چاوەڕواننەکراوی لە زانکۆکاندا بەدەستهێنا. هۆسێرل باوەڕی وابوو کە دەبێ دەستمان بە جەوهەری کردارەکانی مرۆڤ بگات، ڕێبازی دیاردەناسی کە دواتر گۆڕا بۆ هێرمنۆتیك هەوڵدەدات لە پاڵنەری کاردانەوەکانی مرۆڤ تێبگات.

دوو پاڕداایمی بنەرەتی لە توێژینەوە پەرورەدەییدا لێکجیادەبنەوە، یەکەمیان ڕێبازی ئەرکی پێکهاتەیی بابەتی عەقڵانی پەیوەست بە ئامانج (لە پۆزەتیڤیزمی کلاسیکی سەرچاوەی گرتووە) لە لایەن ئیدوارد لی سرندایك دەروونناسی پەروەردەییەوە بە وردی ڕوونکراوەتەوە بە بڕوای سرندایك ڕونااکبیرە پەروەردەییەکان لەبری بەکارهێنانی میتۆدە فەلسەفیەکان پێویستە سوود لە میتۆدەکانی زانستی سروشتی وەربگرن. دووەمیان ڕێبازی لێکدانەوە مرۆڤناسانە کونجان و زهنییە (لەم سالانەی دوای پێشکەوتنی زۆری بە خۆیەوە بینی، تا ڕادەیەك لە تیۆری قوتابخانەی فرانکفۆرت بەتایبەتی تیۆرەکانی هابرمانسەوە سەرچاوەی گرتووە).

میتۆدەکانی چەندایەتی و چۆنایەتی

ئەو میتۆدانەی لە توێژینەوە پەروەردەییەکاندا بەکاردێن دوو جۆرن: چەندایەتی و چۆنایەتی. میتۆدی توێژینەوەی چەندایەتی لە زۆر بەشی زانستی و سروشتی و بایلۆژیدا

سودی لێوەردەگیرێت، زۆرینەی بە شیکردنەوەی ئاماری ژمارەییەوە سودی لێوەردەگیرێت (لەسەر ئەو گریمانە کار دەکات کە هەر تاکێك خاوەن کلتور و بارودۆخێکی تایبەت بە خۆیەتی)، لە ساڵەکانی کۆتاییدا توێژەرانی پەروەردەیی سەرنجیان خستە سەر میتۆدی توێژینەوەی چۆنایەتی ئەو میتۆدانەی کە لە مرۆڤناسی و مێژوو و دەروونناسی و زمانناسیدا بەکار دەهێنران. ئامانج لەم میتۆدە تێگەشتنی تاك یان ڕوداوێکە لە بارودۆخی سروشتەی زەمینەکەی خۆیدا.

باسی پێنجەم

ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی قوتابخانە

مەبەست لە ڕێکخراو چیە؟ بە بڕوای ئیتزوینی ڕێکخراو، یەکەیەکی کۆمەڵایەتیە و بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجی تایبەت دروستکراوە سەر لە نوێ دروستدەبێتەوە. لەسەر بنەمای ئەم پێناسە، قوتابخانە بۆ ئەوە دروستکراوە تا بە هۆی وانە وتنەوەوە کۆمەڵێ شتی جیاواز برەخسێنێ. هەندێك پەروەردە دەبەخسن، هەندێکیتر پەروەردە دەبینن، هەندێك تاوتوێی پاکوخاوێنی ژینگەی قوتابخانە دەکەن، هەندێکیتر ئەنجامی کارکردن لە ژووری بەڕێوبەر و کارگێڕێەوە سەرقاڵن.

هەندێك لایەن سیستەمی قوتابخانەیان وەك سیستەمی بیرۆکراسی سەیرکردوە، سیستەمی بیرۆکراسی، بە سیستەمی ڕێکخراوەیی کە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی بەڕێوبردنی تایبەت دانراوە، ڕێکخراوی بیرۆکراسی ئەمانە لە خۆ دەگرێت: دابەشکردنی کاری ورد، پۆلێنبەندی دەسەلات، سیستەمی یاسایی.

بە گوتەی ئیتزۆنی، کۆمەلگەی ئێمە کۆمەڵگەیەکی ڕێکخراوەییە، ئێمە لە ناو ڕێکخراودا لە دایکدەبین، فێردەکرێن و کاردەکەین. بەم شێوەیە شارستانی نوێ تا ڕادەیەکی زۆر وابەستەیە بە ڕێکخراوەوە. بەڕێوبەری قوتابخانە بابەتێك بە یاریدەدەر دەڵێت ئەویش بە مامۆستای ڕادەگەیەنێت و مامۆستا فێرخوازان ئاگادار دەکاتەوە.

قوتابخانە وەك ڕێکخراوێك

قوتابخانە بەر لە هەر شتێك ڕێکخراوێکە و زۆر لە تایبەتمەندیەکانیە هاوبەشەکانی هەموو ڕێکخراوەکانی هەیە. بەدەربڕینێکیتر، سیستەم کۆمەڵێك بنەمایە کە پەیوەندی دوو لایەنەیان لەگەڵ یەکتر هەیە، هەر شتێك لە دەرەوەی سیستەمدا بێت پێی دەڵێن ژینگەی سیستەم. سیستەم دوو جۆرە: یەکەمیان؛ سیستەمی داخراو وەك موشەکی

بالیستی دوای تەقاتندنی ڕێگای خۆی دەدۆزێتەوە و ئەرکی خۆی جێبەجێدەکات، ب ئەم موشەکە گرنگ نییە کە چ گۆڕانێك لە دەوروبەر دروستدەکات. دووەمیان؛ سیستەمی کراوە، بریتیە لە تاکە کەس، تاك لە ژێر کاریگەری گۆڕانی ژینگەدایە. بۆ نمونە پلەی گەرما گەر بگۆڕێت ئەوا بارودۆخی جەستەی مرۆڤیش دەگۆڕێت. قوتابخانە جۆرێکە لە سیستەمی کراوە، قوتابخانە باڵەخانەیەکی دابەشکراو نییە، بەڵکو جۆرە پەیوەندیەکی نێوان گروپێکی پەروەردە و فێرکردن و فێرخوازانە. هەموو سیستەمە کراوەکان پرۆسەی تواناکانیان لە ژینگەوە وەردەگرن و دوبارە بە ژینگەی دەدەنەوە.

بە بڕوای پارسۆنز، ئامانجی قوتابخانە بریتیە لە ئامادەکردنی فێرخوازان بۆ لە ئەستۆ گرتنی ڕۆڵی گەورە سالان لە کۆمەڵگەدت، لە ڕێگەی بە کۆمەڵایەتی کردنیانەوە.

لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە سیستەمی قوتابخانە لە زۆر لایەنەوە تایبەتمەندی ڕێکخراوێکی گەورەی هەیە، دوو لەو تایبەتمەندیانە: سیستەمی قوتابخانە ئامانجی ڕێکخراوەی هەیە، قوتابخانە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی پەیوەست بە ئامانجە، قوتابخانە خاوەنی تۆڕێك لە پێگەی پێکەوە بەستراوە (بەڕێوبەر، یاریدەدەر، مامۆستا، فێرخواز، فەرمانبەر...) کە هەموویان کار بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی ڕێکخراوەکەیان دەکەن. لەسەر بنەمای شێوازی ڕێکخراوەیدا، کاری قوتابخانە گواستنەوەی زانست و زانین و بەهرە و بەهایە بۆ فێرخوازان. لە زۆر بابەتدا ئامانجی ڕێکخراوەیی و قوتابخانەگشتیەکان ناڕوونە. ئەگەر سیستەمی قوتابخانە لەگەڵ کۆمپانیایەکی بازرگانی بەراورد بکەین باش لەو ڕاستیە تێدەگەین. فێرکردنی منداڵ ئامانجی ڕێکخراوی قوتابخانەیە، ئەم ڕستەیە تا ڕادەیەکی زۆر ناڕۆشنە.

دیاریکردنی ئامانجی پەروەردەی پەیوەستە بە گرنگیدان بە بابەتە بایەخدارەکانو وەك بە چ شتێك دەوترێت پەروەردە و فێرکردنی باش؟ ئەرکەکانی ماڵ و قوتابخانە کامانەن؟ ئایا قوتابخانە دەبێت زیاتر گرنگی بە گەشەی فکری و هزری بدات یان بە گەشەی سۆزداری؟ ئایا قوتابخانە ئەرکی گواستنەوە و گەیاندنی بەها ئەخلاقیەکانە یان نا؟ ئایا قوتابخانە دەبێت بایەخ بە دۆخی باو بدات یان ڕەخنەی لێبگرێت؟ ئایا مامۆستایان دەبێت بە شێوەیکی ڕێکخراو بەشداریبکەن لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی دایبابان؟ ئایا پیشەی مامۆستا ئەرکی ڕاوێژکار دەگرێتەوە؟ ئەرکی مامۆستا لە بەرانبەر منداڵی سەر بە کێشە چیە؟ ئایا مامۆستا لە بەرانبەر سکالا پێویستە پاریزگاری لێبکرێت؟

ئەگەر لە ڕوانگەی کۆمەڵناسیەوە وەك ڕێکخراوێك سەیری قوتابخانە بکرێت، ئەوا ڕوبەڕووی دوو گرفت دەبێتەوە: یەکەم: نەبونی یەکدەنگی دەربارەی ئامانجی ڕێکخراوەیی، دووەم: دەربارەی پێناسەی ڕۆڵی هەریەك لە پێگەکانی پەروەردەیی.

قوتابخانە وەك ڕێکخراوێکی پەروەردەیی

قوتابخانە ڕێکخراوێکە دوو جۆر زانیاری ژینگەی خۆیدا وەردەگرێت: فێرخوازان، مامۆستایان. قوتابخانە منداڵانی نەخوێندەوار دەگۆڕێت بە کەسێکی بە توانا و کۆمەڵایەتی و بەهرەدار، دواتر دەیانبەخشێتەوە بە کۆمەڵگە. ئەوە سەلمێنراوە کە هەرچەند سیستەمی قوتابخانە گەورەتر بێت، ئەگەری نوێگەری و داهێنان لەلایەن مامۆستایانەوە کەمترە. کەواتە هەرچەندە قوتابخانە گەورەتربێت، سەربەخۆیی مامۆستایان بۆ بڕیاردان کەمتر دەبێتەوە، بەم شێوەیە توانای مامۆستایان بۆ نوێخوازی لە پۆلەکاندا سنوردار دەبێت. قوتابخانە لە لایەکەوە لە زیندان دەچێت، چونکە لەناو قوتابخانەدا گروپێك واتە فێرخوازان دەبێ بەتەواوی پابەندی ڕێکخراوبن، لە کاتێکدا گروپێکیتر لە مامۆستایان و فەرمانبەران ئازادی زیاتریان هەیە، لە لایەکیترەوە ئەرکی مامۆستا وەك ئەرکی پاسەوانی زیندانە، لە هەندێك قوتابخانە چاوەڕێی ئەوە لە مامۆستایان دەکرێت کە لە پشوی وانەکاندا ڕاڕەوەکانیش بخەنە ژێر چاودێری خۆیانەوە. مامۆستا ئەبێت ئاگاداری دزیکردن و سەرپێچی فێرخوازانبن، هەندێك قوتابخانە دیواری بەرزیان بۆ دروستدەکرێت و تەلبەند دەکرێن ڕێك وەك دیواری زیندان.

تایبەتمەندیەکانی ڕێکخراوی تایبەتی قوتابخانە

قوتابخانە بەوە جیادەکرێتەوە: مرۆڤی گوێڕایەڵ بەرهەمدەهێنێت، پێویستی بە گۆڕانکاری نییە، چونکە مانەوەی قوتابخانە پەیوەست نییە بە بە چۆنییەتی چالاکیەکانەوە. مێلز باوەڕی وایە نەبوونی جوڵەی ئابووریەکان، هۆکاری دروستنەبوونی گۆڕان و نوێگەریە لە پەروەردە و فێرکردندا. مێلز کۆمەڵێك تایبەتمەندی قوتابخانە دەنوسێت لەوانە: ناڕوونی ئامانج، تا ڕادەیەك توانای هەڵسەنگاندن و پێوانیان نییە، جیاوازیەکی زۆر لە نێوان فێرخوازان و ئەندامانی بەڕێوبردنی قوتابخانە هەیە. فێرخوازان دەتوانن ڕۆڵی مامۆستا ببینن، بەڵام ئەم یاریە ڕێپێدراو نییە.

کۆنترۆڵ لە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی لە قوتابخانە

قوتابخانه یەکەیەکی کۆمەڵایەتی گەورەیە، هەمیشە بەرژەوەندی فێرخواز و مامۆستا دەبێتە قوربانی ئامانجی قوتابخانە. چوار جۆر کۆنترۆڵ لە قوتابخانە بەرچاو دەکەوێت:

کۆنترۆڵی بیرۆکراتی: ئەمجۆرەیان لایەنێکی قوتابخانە دەگرێتەوە پێویستی بە یاسا و ڕێسای فەرمییە. بۆ نمونە ڕێکخستنی کاتژمێری وانەکان، پێداوەیستی قوتابخانە...

کۆنترۆڵی ڕواڵەتی: دەبێت فێرخوازان هانبدرێن بۆ بەدیهێنانی ئامانجی ڕێکخراو. وەك ڕێوڕەسمی دەرچوون، ڕێوڕەسمی ڕۆژە تایبەتیەکان.

کۆنترۆڵی کەسی: کۆنترۆڵی بەڕێوبردن هەوڵدەدات تاك بە گوێرەی کات و شوێن ڕێکبخات و کۆنترۆڵی هەندێ لە مامۆستایان و فێرخوازان دەجوڵێنێ و دەوروژێنێ، بەڵام ئەم دوو کۆنترۆڵە نابنە گرەنتی بەدیهێنانی ئامانجی ڕێکخراوەکە.

کۆنترۆڵی ڕەمزی: ڕێگەیەکیتری کۆنترۆڵی تاکەکان سودوەرگرتنە لە هاندان و سزای ڕەمزی.

کۆمەڵناسی پەروەردەی خوێندن

لە ڕاستیدا گروپی پۆل، یەکێك لە گرنگترین گروپەکانە لە ژیانی منداڵدا. لەم گروپەدا زۆر لە نیازەکانی منداڵ دێنەدی و بەو هۆیەوە زۆر شتی جیاواز فێردەبێت. دەگونجێت گروپی وانە خوێندن گروپێکی سەرەتایی بێت، بەڵام قوتابخانە گروپی دووەمە. گروپی وانە خوێندن کە هەموو تایبەتمەندی گروپی سەرەتایی هەیە. کاتێ منداڵ لە سنوری ێزانەوە پێجەخاتە سنوری قوتابخانەوە، لە ڕاستیدا لە گروپی یەکەمەوە دێتە ناو گروپی دووەمەوە ئەم گواستنەوەش ئاسان نییە. هەروەرها گواستنەوە لە قوتابخانە سەرەتایی بۆ قوتابخانەی ناوەندی هەمان بارودۆخی هەیە، بەڵام نەك بە ئەندازەی ئەوەی پێشوو.

پۆلی وانە خوێندن لە ڕوانگەی تیۆری پارسۆنزەوە وەك سیستەمێکی کۆمەڵایەتی وایە و دو ئەرکی گرنگی هەیە، یەکەم: هۆکارێکی بە کۆمەڵایەتیبوونە، دووەم: هۆکارێکە بۆ دیاریکردنی هێزی مرۆیی. بەشێوەیەکی گشتی ژینگەی پۆلی وانە خوێندن، ڕۆڵی لە دروستکردنی کەسایەتی تاکدا دەبینێت.

باسی شەشەم

پرۆسەکانی تایبەت بە قوتابخانە

کلتوری فێرخوازان و پرۆسەی خوێندن

دیاریکردنی ڕێژەی کلتوری فێرخوازان کاریگەری لەسەر سەرکەوتنی خوێندندندا بابەتی سەرەکی چەند دەیەی ڕابردوو بووە. جەیمز کولیمان لە کتێبی کۆمەڵگەی تازە پێگەشتووان لە ساڵی ١٩٦١دا، دەڵێت دانانی تازە پێگەشتووان و هەرزەکاران لە قوتابخانە دوور لە گەورە ساڵان دەبێتە هۆی پەیدابوونی وردە کلتور، ئەم وردە کلتورە جیاوازە لەگەڵ کلتوری گەورە ساڵان. جەیمز زۆر لەوە نیگەرانە کە تازە پێگەشتوان بە ئاستێکی کەمی سەرکەوتن لە خوێندن ڕازین، ئەگەرچی دایبابانی بەشدار لەم توێژینەوەیە باوەڕیان وایە کە دەبێ سەرکەوتن لە خوێندندا کاری سەرەکی گەنجان بێت، گەنجان لە جیهانێکدا دەژین کە سەرکەوتنی خوێندن هێندە بایەخی نییە. لەبەر ئەوە جەیمز پێشنیار دەکات لە قوتابخانە لە بڕی پێشبڕکێی وەرزشی، خەریکی پێشبڕکێی زانستی و ململانێی زانستیبن. توێژینەویەکیتری نوسەر دەریخستوە کە فێرخوازان لە نێوان داواکاری دایبابان و بۆ سەرکەوتنی خوێندن و چاوەڕوانی هاوڕێکانیاندا لە ململانێدان. لە توێژینەوەیەکیتردا دەریخستوە کە بۆ سەرکەوتنی خوێندن، هەموو گۆڕانە کۆنترۆڵکراوەکان گرنگی زیاتریان هەیە تا کلتور و بەهاکان. ئەگەر فێرخوازێك بچێتە قوتابخانەیەك کە تێیدا بایەخی زۆر بە سەرکەوتنی خوێندن بدات، ئەو کات پرۆسەی کرداری خوێندن باشتر دەبێت. هەندێك لە هۆکارەکانی شکست و سەرکەوتن لە خوێندن:

ئامانج و ڕێزگرتنی خود:

یەکێك لە هۆکارە کاریگەرەکانی سەرکەوتنی خوێندن، ئارەزوەکانی فێرخواز و خانەوەدەکەیەتی.

پێگەی کۆمەڵایەتی و ئاستی ئابوری.

ڕێز و حورمەت: ئو فێرخوازانەی ڕێز و حورمەتیان بۆ خۆیان دادەنێن و باوەڕیان بە تواناکانی خۆیان هەیە، لە خوێندندا سەرکەوتون.

پاڵنەری دەستکەوت

بۆچی دوو منداڵ کە بەهرەی زیرەکی یەکسانیان هەیە، دەستکەوتی جیاوازیان هەیە؟ چ شتێك ئاستی ئارەزوی فێرخوازێك دیاریدەکات؟ مەکلالەند و ئاتکینسۆن وەڵامیان داوەتەوە. هەندێك کات فێرخوازان دەیانەوێ هەندێك کار ئەنجام بدەن تا کارامەی خۆیان بسەلمێنن، هەندێکجار هەندێك چالاکی ئەنجامدەدەن بە بێئەوەی مەبەستیان

هەبێت. لە تیۆری ئاتکینسۆن سێ گۆڕاوی سەرەکی بوونیان هەیە: پێشبینی، هاندان، پاڵنەر. تیۆری مەکلالەند هۆکاری پێشبینی سەرکەوتنی فێرخواز، ئەویە تا چ ڕادەیەك دەیەوێ لە ململانێی ئەوانتردا سەرکەوتوو بێت.

فێرخوازان زۆر لە ژێر کاریگەری چاوەڕوانی مامۆستاکانی خۆیاندان. مامۆستا چاوەڕوانی ڕەفتاری تایبەت لە فێرخوازان دەکات و فێرخوازانیش بە هەمان شێوە وەڵامی ئەم چاوەڕوانییە دەداتەوە. فێرخوازان تەنیا ئەو شتە فێردەبن کە لێیان چاوەڕێ دەکرێت.

کاریگەری ژینگەی خێزان بەسەر خوێندنەوە

خێزان ژینگەی یەکەمی منداڵە بۆ فێربوون، هەروەها هۆمارێکی کاریگەرە بۆ سەرکەوتنی لە خوێندندا. هەندێك ڕایان وایە ٨٠٪ ئەگەرەکانی زیرەکی لە تەمەنی ٨ ساڵیدا گەشە دەکات. توێژینەوەی کۆلیمان بە ناوی یەکسانی دەرفەتی پەروەردەیی دەریخستوە کە کاریگەری ژینگەی خێزان لە سەرکەوتنی فێرخوازدا زیاترە لە کاریگەری بەرنامەکانی خوێندنی قوتابخانە. توێژینەوەکیتر لە لایەن جانکیسەوە ئەنجامدراوە لەسەر ئەو بنەمایەی کە تایبەتمەندیەکانی خێزان گرنگترین هۆکارن لە دیاریکردنی سەرکەوتنی فێرخوازاندا. پیشە و داهات و ئاستی خوێندەواری دایباب بەهێزترین هۆکارن بۆ سەرکەوتنی فێرخواز. دایبابی ئەو منداڵانەی خەریکی خوێندنەوە دەبن، دەڕۆن بۆ کتێبخانە و لە چالاکیەکانی قوتابخانە و مۆزەخانە بەشداری دەکەن، تەواوی ئەم چالاکیانە بە شێوەیەك بەهای پەروەردە و فێرکردن لە منداڵان بەهێز دەکەن.

هەروەها خۆشویستن و ڕێزگرتن لە خود، ڕۆڵی گرنگیان لە سەرکەوتنی منداڵاندا هەیە. ئەو منداڵانەی خۆشەویستی کەمیان بۆ خۆیان هەیە و بیرکردنەوەی نەرێنیان دەربارەی خودی خۆیان هەیە، ئەوە کاردەکاتە سەر بەدیهێنانی خود، بەتایبەتی ئەم پرۆسەیە دەچێتە ناو ژینگەی پۆلی وانە خوێندنەوە. بە بڕوای دایانا باومڕیند دوو جۆر ڕەفتاری دایبابان گرنگی زۆریان هەیە بۆ منداڵان: یەکەمیان: وەڵامدانەوەی دایبابان، دووەمیان: چاوەڕوانییان بۆ منداڵەکانیان. هاندەری پێشکەوتن بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ دایباب.

جۆرەکانی دایباب:

سادەگیر - نەرمومیانڕەو: دایبابی وەڵامگۆ بووە، داواکاری نەبووە. لە بواری ڕێکخستن و دیسپلینکردندا زۆر ناچالاکانە ڕەفتار دەکەن، داواکاری زۆریان نییە بەڵام ئازادیەکی زۆر

به منداڵەکانیان دەدەن، تا هەر چۆنێکیان پێخۆشە بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکەن. منداڵەکان هەست بە لێپرسراویەتی زۆر کەمدەکەن، زیاتر پشت بە بازنەی هاوڕێکانیان دەبەستن، کەمتر دەتوانن لە بارودۆخی جیاوازدا ڕۆڵی جیاواز بگێڕن و پێشەوایەتی بگرنە دەست.

بەهێز - دەستڕۆشتوو: دایبابی وەڵامگۆ بووە، داواکاری زۆری هەبوو. گەرمن بەڵام نەگۆڕن، ئەوان بۆ ڕەفتاری منداڵەکانیان پێوەریان هەیە، بەڵام چاوەڕوانی خۆیان لەگەڵ نیاز و تواناکانی منداڵەکانیان دەگونجێنن. ئەوان بایەخی زۆر بە سەربەخۆیی و خۆبەڕێوبردن دەدەن، بەڵام باوەڕیان وایە دەبێت منداڵ بەرپرسیارێتی کردەوەکانی خۆی هەڵبگرێت. ئەو منداڵانەی لە خێزانێکی دەسەڵاتدار پەروەردەکراون هەست بە لێپرساوی زیاتر دەکەن، پشت بە خۆیان دەبەستن و گونجاوترن و حەزی داهێنانیان زیاترە.

ستەمکار: دایبابی وەڵامدەر نەبووە، داواکاری زۆرە. گرنگی بە گوێڕایەڵی منداڵەکانیان دەدەن. دەلبێت منداڵ بێچەندوچون یاساکانی دایباب قەبوڵ بکەن. منداڵی ئەمجۆرە خێزانانە وابەستەی زیاتریان هەیە و ناچالاکن و کەمتر پشت بە خۆیان دەبەستن، لە ڕووی تامەزرۆییەوە کردەوەی کەم پیشاندەدەن.

کەمتەرخەم: دایبابی نە وەڵامگۆ بووە، نە داواکاری هەبووە. کەمترین زانیاریان هەیە سەبارەت بە چالاکی و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ منداڵەکانیان، کەمترین زانیاریان هەیە سەبارەت بە ئەزمونی منداڵەکانیان لەگەڵ هاوڕێکانیان لە قوتابخانەدا. زۆرینەی منداڵەکان پڕ جوڵەن و ڕەفتاری هەرزەکارانە دەکەن و زووتر توشی بەکارهێنانی مادەی بێهۆشکەر و بابەتەکانی هاوشێوەیان دەبن.

ئەم ڕیزبەندیەی سەرەوە دەتوانێت کۆمەکیەکی باشمان بکات بۆ لێکدانەوەی پەیوەندی شێوازی ڕەفتاری دایباب و پێشکەوتنی دەرونی و کۆمەڵایەتی منداڵان.

پیشەی دایك و کاریگەری لە سەر سەرکەوتنی منداڵ

بە پێی توێژینەوەیەکی هافمەن بە شێوەیەکی گشتی پیشەی دایك کاریگەری ئەرێنی لەسەر کچان هەیە، بەڵام بە پێچەوانەوە کاریگەری نەرێنی لەسەر کوڕان هەیە (ئە هۆی کارکردنی دایکان بۆ ماوەیەکی درێژ خوێندنی کوڕانی لاوازکردوە)، لە چینی ناوەڕاستی کۆمەڵایەتیدا ئەو کچانەی دایکیان خاوەن کار و پیشەیە بە بەراورد بە هاوتەمەکان

خۆیان ئومێد و ئارەزوی پیشەی بەرزتریان هەیە. لێرەدا کچان زیاتر بە دایکیان دەچن، چونکە پلان و بەرنامەی پیشەی کچان لە ژێر کاریگەری پیشەی دایکیان دروستدەبێت. توێژینەوەیەکیتر دەریخستوە ئەو کوڕانەی دایکیان کارێك دەکات بە بەراورد بە کوڕەکانیتر، زیاتر توشی دەمەقاڵێ و کێشە لەگەڵ دایك و خوشك و براکانی دەبێتەوە، هەندێ کەس ئەم بابەتە دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی خێزان سەبارەت بە کاروباری ناوماڵ داواکاری زۆر لە کوڕان هەیە.

شیکردنەوەی ئەرکگەرایانە و ڕادیکاڵ بۆ پرۆسەی خوێندن

لەسەر بنەمای پارادایمی ئەرکگەرایی، پرۆسەی خوێندن پەیوەستە بە توانا و هاندانی فێرخوازەکەوە. لەسەر بنەمای ئەرکگەرایانە پرۆسەی خوێندن پەیوەستە بە هەندێ هۆکارەوە وەك: توانا، ئامانج و ئارەزوەکانی دایباب، ئامانج و ئارەزوەکانی خودی فێرخواز، توانای قوتابخانە، شێوازی وانەوتنەوە.

پارادایمی ڕادیکال گریمانەیتری هەیە و پێی وایە زیرەکی بەهرەیەکی بۆ ماوەیی نییە. لە ڕاستیدا ئەم پارادایمە تیشکی نەخستوەتەسەر جیاوازی بەهرەی زیرەکی فێرخوازان.

پارادایمی ئەرکگەرایی لە کۆتاییدا بەو ئەنجامە گەیشتوە کە تایبەتمەندی فێرخواز زۆر گرنگترە لە تایبەتمەندی قوتابخانە، بەڵام پارادایمی ڕادیکاڵ تەواو بە پێچەوانەوە باوەڕی وایە کە جیاوازی لە پرۆسەی خوێندندا زیاتر ئەنجامی تایبەتمەندی قوتابخانە و ئەو چاوەڕوانیانەی لە فێرخوازان هەیە.

تاك و پێگەکان

چاوەڕێی ئەوە لە تاکەکان دەکرێت کە بە گوێرەی پێگە کۆمەڵایەتیەکان ڕەفتار لەگەڵ یەك بکەن، نەك بە گوێرەی ناسنامەی کەسایەتیان. یەکێك لە دەستکەوتەکانی ئامادەبووان لە قوتابخانەدا ئەوەیە کە ئەم جیاوازییە لە نێوان تاك و پێگەکان بۆ فێرخوازان دروست دەکات. ئەوە فێردەبێت کە ئەوان تاکی جیاوازن بەڵام خاوەنی پێگەی کۆمەڵایەتی وەك یەکن بە شێوەی یەکسان کاردەکەن.

بەرنامەی وانەی شاراوە

بۆ یەکەمجار ئەم چەمکە لە لایەن جاکسۆن لە کتێبی ژیان لە پۆلەکانی وانە خوێندندا پێشکەشکرا. مەبەست لە وانە شارەوکان پشوودرێژی و دەستهەڵگرتن لە موڵکی تایبەتی.

وا دێتە پێشچاو کە بەرنامەی خوێندنی شاراوە لای مامۆستایان شاراوەبێت و بۆ فێرخوازان ئاشکرا. بلووم باوەڕی وایە کە بەرنامەی وانەی شاراوە لە زۆر ڕووەوە کاریگەری هەیە لە بەرنامەی خوێندنی ئاشکرا. وانەکانی ئەم بابەتە لە زیهنی فێرخوازاندا دەمێنێتەوە.

لە چاوەڕوانی یەکسانیدا

سەردەمانێکی زۆر کۆمەڵگەکان پێیان وابوو کە دەکرێ لە ڕێگەی فراوانبوونی قوتابخانە و پەروەردە و فێرکردنەوە دەرفەتی زیاتری یەکسانی برەخسێنرێ. توێژینەوە تازەکان ئەو گریمانەیان خستوەتە ژێر پرسیارەوە ڕاستە کە بەهرەی زیرەکی تاك تایبەتمەندیەکی باشە بۆ سەرکەوتنی فێرخواز لە قوتابخانە، ئەوانەی کە پێگەی ئابوریان و کۆمەڵایەتیان نزمە بەڵام بەهرەی زیرەکیان مامناوەندە تەنیا ٦٪ چەنسیان هەیە، تا ئەو کەسانەی کە داهاتیان باشە و بەهرەی زیرەکیان مامناوەندیە چانسی سەرکەوتنی ئەمجۆرانە ٤١٪ە. وا دێتە بەرژاو کە پێگەی ئابوری و کۆمەڵایەتی دایباب کاریگەری باشتری لە سەرکەوتنی ئابوری منداڵ لە ئایندەدا هەبێت، تا بەهرەی زیرەکیەکەی.

باسی حەوتەم

خێزان و قوتابخانە

خێزان و قوتابخانە دوو دامەزراوەن کە بە شێوەیەکی سەربەخۆ کاریگەریان بەسەر منداڵەوە هەیە. زۆر لە ئەزمونەکانی کۆمەڵگا لە ڕێگەی ئەم دامەزراوانەوە بۆ منداڵان دەگوازرێتەوە. خێزان نەك تەنیا لە گەشەی جەستەیی پارێزگاری لە منداڵان دەکات، بەڵکو یەکەمین دەرفەتی بە کۆمەڵایەتیبوون و پەروەردە و فێرکردن و ڕاهێنانیشی بۆ فەراهەم دەکات. هەندێ لە منداڵان لە ڕووی خۆگونجاندنەوە لەگەڵ قوتابخانەدا ڕوبەڕووی کێشە دەبنەوە، ئەم کێشانە کاتێك زۆرتر و بەردەواتر دەبێت کە لێکچونێکی وا لە نێوان مەعریفە و تێڕوانین و بەهاکانی خێزان و قوتابخانەدا بوونی نەبێت. سەرەڕای بوونی جیاوازی نێوان قوتابخانە و خێزان بەڵام هەردوکیان ئامانجی هاوبەش و لێکچونیان هەیە، خێزان هەوڵدەدات پێداویستیە فیزیکیەکانی وەك خۆراك و پۆشاك و شوێنی مانەوە و تەندروستی بۆ مندال دابینبکات، لە هەمان کاتدا قوتابخانەش هەوڵدەدات زەمینە و هێزی مرۆیی و بەرنامەی وانە خوێندنی گونجاو و شێوازی فێربوونی منداڵان فەراهەم بکات.

بۆ بەراوردکردنی دوو ژینگەی جیاواز، دەبێ ئەم پێوەرانە بەکار بهێنین:

١- سنور و قەبارە: لە دامەزراوەی کۆمەڵایەتی ماڵدا هیچ جۆرە جیاکاریەك لە ئارادا نییە، خێزان بە فەرمی دابەش ناکرێن بەسەر لقیتردا، لە کاتێکدا قوتابخانە دابەش دەبێت بەسەر ئاستی جیاواز.
٢- ماوەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان: منداڵی بچوك زیاتر کاتەکانی لەگەڵ ئەندامەکانی خێزانەکەی و کەسوکار و دراوسێەکانی بەسەر دەبات. لەگەڵ چوونی بۆ قوتابخانە دەبێتە فێرخواز لەگەڵ مامۆستا و هاوپۆلەکانی پەیوەندی دەبێت. بە شێوەیەکی ئاسایی منداڵ پەیوەندی نزیك و قوڵی خۆی تا کۆتایی سەردەمی هەرزەکاری لەگەڵ ئەندامەکانی خێزانەکانیدا ناپچرێت.
٣- ژمارەی ڕێژەی گەورە ساڵان و کەسانیتر: ئاشکرایە کە مامۆستایان ناتوانن هەروەك دایبابان سەرنج وتێبینی وردی منداڵان بکەن، لە بەر بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە فێرخوازان مامۆستا ناتوانێت پەیوەندیەکی گەرموگوڕیان لەگەڵ ببەستێت.
٤- پێکهاتەی تایبەتمەندیەکانی منداڵ: منداڵان لە ناو خێزانی ناوەکیدا لە ڕووی شوێنی کۆمەڵایەتی و گروپی نەتەوەی و ئاینیەوە یەکسانن وەك یەکن، بەڵام لە ڕووی ڕەگەز و تەمەن و توانای جەستەی و زیهنیەوە لە یەك جیاوازن. بەڵام لە قوتابخانە جیاوازی تەمەن و ئاستی جەستەیی و زیهنیەوە لە یەکەوە نزیکن.

چالاکیەکانی تایبەت بە خێزان و قوتابخانە

جیاوازی زۆر لە نێوان چالاکیەکانی پۆلی وانە خوێندن و خێزاندا هەیە، گرنگترینیان چلاکی پەروەردەییە کە مامۆستا ئەرکی وانە خوێندن دەدات بە فێرخوازان و دواتر هەڵسەنگاندنیان بۆ دەکات. بەڵام خێزان خۆی بە هەڵسەنگاندنەوە سەرقاڵ ناکات. لە ژیانی خێزانیدا هیچ بەهایەك لە ئەنجامدانی ئەرکی ڕۆژانە و دەربڕینی خۆشەویستی گرنگتر نییە. بەڵام ئامانجی دیاری قوتابخانە کارێکی پەروەردەییە.

هاندان و سزادان

مامۆستایانیش هەروەك دایبابان ڕوبەڕووی کێشەکانی پەیوەست بە پاداشت و سزا دەبنەوە. مامۆستا دەبێت بتوانێت پۆلی وانە خوێندن بەڕێوە ببات بەبێ ئەوەی بەرنامەی پەروەردەیی بکاتە قوربانی. دایبابن بۆ هاندان و سزادانی منداڵەکانیان پشت بە نمرە یان

هەڵسەنگاندن نابەستن. بە سەرنجدان بەوەی منداڵان لە خێزانەوە فێری ڕەفتارەکانیان بوون بەڵام دەبێ قوتابخانە گۆڕانکاری بنەڕەتیان تێدا دروستبکات بۆ ئامادەکرنیان بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی.

سەرمایەی کۆمەڵایەتی

بە بڕوای کۆلیمان دەتوانین سەرمایەی کۆمەڵایەتی لە سێ لایەنی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا بدۆزینەوە.

١-پەیوەندی بە تەمەنەکان لەگەڵ منداڵەکاندا. ٢- پەیوەندی نێوان دوو لە بەتەمەنەکان. ٣- بەردەوامی هەمیشەیی پێکهاتەیی.

پوکانەوەی سەرمایەی کۆمەڵایەتی:

لەم سەردەمە ئێستادا پوکانەوەی زۆر لە سەرمایەی کۆمەڵایەتی منداڵان و گەنجان ڕوویانداوەز بەردەوام ئاستی خوێندن لە بەرزبونەوەدایە بەڵام هاوشانی گەشەکردنی سەرمایەی دایباب و سەرمایەی کۆمەڵایەتی و بەشداری گەورە سالان لە خێزاندا بەرەو کەمبونەوە ڕۆشتووە. نەبوونی باوك لە ناو خێزاندا و نەمانی ژینگەی هاوسێیەتی و نەبونی دایك لە ماڵدا و بەشداریکردنی لە بازاڕی کاردا، هەروەها بڵاوبونەوەی بیرۆکەی تاکگەرایی، پێشخستنی بەرژەوەندی تاك پێش بەرژەوەندی گشتی دەخرێت. گرنگیدان بە بەژن و باڵای ڕوکەشی و پێشکەوتنی پیشەیی. دەکرێ پوکانەوەی کۆمەڵایەتی ببێتە هۆی تێکدانی پەیوەندیەکان. لە تێکچونی پەیوەندیەکانیشدا ڕێزی بەرامبەر و خۆشەویستی و ڕاستگۆی کەمدەبێتەوە. لە کۆتاییدا نەوەی داهاتوو باجەکەی دەدات. بە بڕوای کۆڵمان جیاکردنەوەی شوێنە ئاینیەکان لەگەڵ دەوڵەت وایکردوە قوتابخانە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی خۆی نەتوانێت سود لە سەرمایەی ئەو شوێنە ئاینیانە وەربگرێت.

باسی هەشتەم

مامۆستا و قوتابخانە

یەکێك لە بابەتە گرنگەکانی کۆمەڵناسی پەروەردە و فێرکردن. کۆمەڵناسی وانەوتنەوە و ڕۆڵی مامۆستایە لە کۆمەڵگەدا. سێ دیدگای تیۆری لە کۆمەڵناسیدا هەن: ئەرکگەرایی، ململانێ و لێکدانەوەیی. ئەم سێ تیۆرە جەخت لە پێگەی مامۆستایان و دامەزراوەی

پەروەردەی دەکەنەوە و هەریەك لەمانە ڕۆڵی تایبەت دەبینێت. لە ڕوانگەی ئەرکگەرایەوە ڕۆڵی پەروەردە و فێرکردن گواستنەوەی مەعریفەیە و بەها و باوەڕەکانە (دۆرکهایم پێیوایە پەروەردە و فێرکردن دامەزراوەیەکە بە هۆیەوە بەهاکان دەگوازرێنەوە بۆ ئەندامانی کۆمەڵگە و شوێنی خۆیان دەکەنەوە، گواستنەوەی کلتور و بەهاکان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتر) بە تێڕوانینی دۆرکهایم پەروەردەی ئەخلاقی ئەرکی مامۆستایە، لە ڕوانگەی ململانێەوە ئەم ڕۆڵە بەرهەمهێنانەوەی پێکهاتەی ئابوری و توێژبەندی هێزی کارە (بە تێڕوانینی مارکسیستەکان سروشتی بزاوتی کۆمەڵگا کەموکورتی هەیە و تایبەتمەندی نایەکسانی کۆمەڵایەتی هەیە، قوتابخانە هاوکاری بەهێزبونی ئەم نایەکسانیە دەدات و لە خزمەتی چینی سەرمایەداردایە، کرێکارێکی گوێڕایەڵ بۆ دەسەڵات دروستدەکات) پەیج و میتز و کۆنێل بڕوایان وایە مامۆستا ئامرازێکە بۆ پرۆسەی بەرهەمهێنانەوە، لە ڕوانگەی تیۆری لێکدانەوە ڕۆڵی پەروەردە و فێرکردن هەمان پرۆسەی بە کۆمەڵایەتیبوونە (پەیوەستن بەوەی کە مرۆڤ ئەمانە لە ڕێگەی پەیوەندی بە کەسانیترەوە دروستدەکات) لایەنگری کارلێکی هێمایی هۆگری پێشکەوتنی وێنای خودی و پرۆسەی بە کۆمەڵایەتیبون و تواناکانی تاکن بۆ بەجێهێنانی ڕۆڵەکانیان.

دەروونناسی کۆمەڵایەتی وانەوتنەوە

لە بنەڕەتدا پەروەردە و فێرکردن پرۆسەیەکە مامۆستایان و فێرخوازان و کەسانیتر لە خۆ دەگرێت، ئامانجی ئەم پرۆسەیە گواستنەوەی بەهرە و کلتورە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتر. سروشتی کۆمەڵایەتی پەروەردە و فێرکردن ئەمانەن:

١-سروشتی کۆمەڵایەتی پەروەرردە و فێرکردن: خوسڵەتی گرنگی مرۆڤ گواستنەوەی مەعریفەیە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتر، قوتابخانە بۆ هاوکاریکردنی پرۆسەی گواستنەوە و ڕێکخستنیان دروستبووە و گەشەی کردوە. ئەم گواستنەوەیە لەلایەن کۆمپیوتەر یان مۆبایل یان پرۆگرام یان ئامێرەکانی تاقیکردنەوەوە ئەنجامنادرێت، بەڵکو بەرهەمی ڕاستەوخۆی پەیوەندی نێوان مامۆستا و خودی فێرخوازە.

٢-ڕێکخراوی پەروەردەیی و تیۆری ڕۆڵ: قوتابخانە ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتیە، واتا کۆمەڵێ پەیوەندی ڕێکوپێکی نێوان تاکەکانە بۆ گەشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو. بۆ هەر پێگەیەك ڕۆڵێك بوونی هەیە، واتا هەر کەسێك ئەم پێگانە بەڕێوە ببات دەبێ چەند ڕەفتارێکی دیاریکراو بنوێنێت، ئەوە ڕۆڵەکانن دیاریدەکەن کە چۆن هەرزەکاران و منداڵان

پەیوەندی لەگەڵ یەکتر دروستبکەن. ئەو کەسانەی ڕۆڵی تایبەتیان هەیە چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکرێت شارەزاییانە ڕەفتار بکەن.

٣-تیۆری چاوەڕوانی: لەسەر بنەمای ئەم تیۆرەدا ئەو چاوەڕوانیەی مامۆستایان و هاوپۆلەکان لە فێرخوازانیان هەیە، کاریگەری دەبێت لەسەر ڕێژەی فێربونیان. توێژینەوەکان ئەوە پشتڕاستدەکەنەوە کە مرۆڤەکان باوەڕیان بە ئاخاوتنی کەسانی پلەوپایە هەیە و جێبەجێدەکەن.

٤-تیۆری پشت بەیەك بەستنی کۆمەڵایەتی: یەکێکە لە گرنگترین تیۆرەکانی دەروونناسی کۆمەڵایەتی بۆ بواری پەروەردەو فێرکردن، مامۆستا بڕیار دەدات بۆ هەروانەیەك بە شێوەی گرووپ یان تاك ئەنجامبدرێت. بناغەی ئەم تیۆرە بەپوەستە بە تیۆری مەیدانی کۆرت لوین و لەلایەن مۆرتۆن دۆچەوە گەشەی پێدراوە. ئەم تیۆرە کاتێك سەرهەڵدەدات کە ڕەفتاری هەر کەسێك لە ژێر کاریگەری کەسانی دیکەدا بێت. دووجۆر پشتبەیەك بەستن هەیە، یەکەمیان، پەیوەستە بە هاوکاری ئەوان ( تاك دەبێ تێبگات سەرکەوتنی ئەو بە بێ سەرکەوتنی ئەوانیتر نەکردەیی). دووەمیان ململانێ (ململانێ کاتێ دروستدەبێت کە پێی وایە سەرکەوتنی ئەو پەیوەستە بە شکستی ئەوانی دیکەوە). ەوڵی تاکەکەسی کاتێ دروستدەبێت تاك وا هەست بکات سەرکەوتنی ئەو هیچ پەیوەندیەکی بە سەرکەوتن یان شکستی ئەوانی دیکەوە نییە.

٥-تیۆری دابەشکردنی دادپەروەری: ئەم تیۆرە تاوتوێی ئەوە دەکات کە چ ئیمتیازات و بەرژەوەندیەك دەدرێت بە ئەندامانی گروپ؟ دیدگای ڕەوایی باوەڕی وایە کە دەبێ پاداشتی تاك گونجاوبێ لەگەل ڕۆڵ و بەشداریکردنی لە هەوڵی پێکەوەییدا. بەڵام دیدگای یەکسانی باوەڕی وایە کە تەواوی ئەندامانی گروپ دەبێ بە شێوەی یەکسان لە ئیمتیازەکاندا سودمەندبن. توێژینەوەکان دەریانخستوە پێش ئەنجامدانی کار پێدانی پاداشت لەسەر بنەمای ڕەوایی، بە باشترین سیستەم لە قەڵەم دەدرێت لە کاتێکدا دوای ئەنجامدانی کار، لە کاتێکدا دوای ئەنجامدانی کار، سیستەمی پێدانی پاداشت لەسەر بنەمای یەکسانی بە دادپەروەرترین سیستەم دادەنرێت.

٦-تیۆری خستنە پاڵ: ئەم تیۆرە وەڵامی بۆچیەکان دەداتەوە، وەك بۆچی لەم تاقیکردنەوەیە ڕەتکرامەوە؟ بەزۆری پرسیارە بۆچیەکان لە دوای پەیامە نەرێنیەکان و چاوەڕێ نەکراوەکانەوە دێن. تیۆری خستنە پاڵ جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئایا مرۆڤ هۆکارەکانی ڕەفتاری خۆی بە بارودۆخەوە دەبەستێتەوە یان بە تاکەکانەوە؟ چۆن مرۆڤ

بەرپرسیارێتی سەرکەوتن یان شکستی خۆی دیاری دەکات؟ فۆرسایت لە توێژینەیەك دەربارەی کاردانەوەی فێرخوازان سەبارەت بە سەرکەوتن و شکست بەو ئەنجامە گەشتوە کە لە زۆرینەی بابەتەکاندا فێرخوازان سەرکەوتنەکانی خۆیان بە خودیەتی و شکستەکانیانی خۆیان بە هۆکاری بارودۆخەوە گرێداوە. مامۆستا دەبێت هەوڵبدات تا فێرخوازان بیربکەنەوە کە بۆچی دووچاری سەرکەوتن یان شکست بونەتەوە؟ لەم پرۆسەیەدا مامۆستا فێرخواز هانبدات کە شکستهێنان هۆکارەکەی هەوڵنەدان یان ستراتیژی هەڵەبووە.

٧-تیۆری ڕێز لە خۆگرتن: فێرخوازانێك کە دەربارەی ناسنامەی خود، دووچاری ناڕوونی دەبنەوە یان بڕوایان بە خۆیان نییە، ئەوا لە کاتی هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی فێروون توشی شکست و دوودڵی دەبنەوە. مامۆستایان دەتوانن لە ڕێگەی هاوکاریکردنی فێرخوازان سەبارەت بە ناسنامە و ڕێزگرتنی خود ڕێنمویان بکەن و کاریان یۆ ئاسان بکەن. فێرخوازیش پێویستە ناسنامەیەکی گونجاو بۆ خۆی دروستبکات و  بە درێژای کات بارودۆخی ئەرێنی خۆ بپارێزێت بە چاوپۆشین لەوەی کە چ گۆڕانکاریەك لە ژیان و دەروبەریدا ڕودەدات.

مامۆستا و وانەوتنەوە

دەکرێ پەروەردە وفێرکردن وەك پرۆسەی فۆرمبەخشین بە ڕەفتار پێناسە بکەین. بە گشتی هەر ساتێك لە ژیاندا چ باش بێت یان خراپ ئەزمونێکی پەروەردەییە. لەم پرۆسەیەدا مامۆستا کەسێکە سەرقاڵی پارێزگاری و گواستنەوەی مەعریفەیە. هالمۆس پیشەی وانەوتنەوە بە خزمەتکردن بە خەڵك پێناسە دەکات.

مەعریفەی مامۆستا

لە ساڵی ١٩٨٣ دا توێژینەوەیەك ئەنجامدرا. وەك مامۆستا چی دەزانن؟ چۆن ئەم زانینە بەدەست دەهێنن؟ چۆن ئەم زانینە کاریگەری لەسەر کارەکەیان دەبێ؟ چوارچێوەی مەعریفەی مامۆستا دابەش دەبێت سەر شەش بەشدا: مەعریفەی ناسینی ناوەڕۆك (پەیوەیستە بە ئاگایی مامۆستا سەبارەت بە بابەتی وانەوتنەوە.)– مەعریفەی ناسینی فێربوون و فێرخوازەکان (هۆشیاری دەربارەی تیۆرەکانی فێربوون، گەشەی فیزیکی، کۆمەڵایەتی و دەروونناسی و ناسینی فێرخوازان و تیۆری بزواندن دەگرێتەوە) – مەعریفەی شێوەی وانەتنەوە (دەربارەی ڕێکخستن و بەڕێوبردنی پۆلی وانەوتنەوە و میتۆدەکانی وانەوتنەوە)– مەعریفەی بەرنامەی وانە خوێندن (ئاگاییی مامۆستایە

لەبارەی پرۆسەکانی گەشەپێدانی بەرنامەی وانەکان)- مەعریفەی پەیوەست بە بوار و زەمینە (ئاگایی مامۆستایانە دەربارەی فێرخوازان و خانەوادەکەیان و ناوچەی نیشتەجێبوونیان – خۆناسین (بەهای کەسێتی خودی مامۆستا خۆی و خاڵی بەهێز و لاوازی، فەلسەفەی پەروەردە و ئامانجی وانەوتنەوەی لە خۆدەگرێت). خاڵێکی گرنگ دەبێت مامۆستا توانای کۆنترۆڵی پۆلی وانەخوێندنی هەبێت و بەشێك لەم کۆنترۆڵە لە ڕێگەی مەعریفەی خۆیەوە هەبێت. کۆنترۆڵێ سەرکەوتوانە بە مانی سنورردارکردنی دەرفەتەکانی ئازادی فێرخوازان نییە، بەڵکو مەبەست لێی زیادکردنی ئەم دەرفەت و تواناییانەیە لە ڕێگەی هاوکاریکردنی فێرخوازانەوە.

لایەنی کۆمەڵناسی مافی مامۆستایان

هەندێك لە پیشەکانی وەك خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و پەرستاران و توێژەران مافیان زۆرە، لە کاتێکدا هەندێکیتر وەك پزیشکان و دادوەران لە زۆر مافدا سودمەندن. بەدەستهێنانی داهات لە سێ دەستەواژەی گشتیەوەیە: یەکەم: لە ڕێگای فرۆشتنی کاڵا و خزمەتگوزاریەکان وەك بازرگانێك. دووەم: ئەو داهاتەی لە کۆمپانیایەك بەدەست دێت. سێیەم: داهاتێك لە ڕێگای موڵك و ماڵی خەڵکەوە بەدەست دێت وەك داهاتی کارمەندانی دەوڵەت.

لەبەر ئەوە ناکرێت ئەم سێ دەستەواژەیە بە یەك بەراورد بکرێن. هەندێك لە کارەکان دەتوانێت لە ڕیزی هەرسێ دەستەواژەکەدا شوێنیان بۆ بکرێتەوە. لەسەر داهاتی پیشەیەك دەبێ بپرسین کە ئەم پیشەیە چ شوێنێکی لە کۆمەڵگەدا هەیە؟ هەرکاتێك بۆ خزمەتێك داواکاری زۆر بوونی هەبێت، ئەوا ئەو کەسانەی ئەم خزمەتە دابیندەکەن پێگەیەکی بەرزتر بەدەست دەهێنن، هەر خزمەتێك تایبەتمەندی دەستبەجێ و پەلەی پێویست بێت وەك نەشتەرگەریکردن ئەوا کارمەندانە دەتوانن پارەی زیاتر داوا بکەن.

هەرکاتێك گروپێکی بچوکی وەك دادوەران بیانەوێت داوای موچەیەکی بەرز بکەن بە ئاسانی دەتوانرێ بۆیان زیاد بکرێت لەبەر ئەوەی ڕێژەیان کەمە و کاریگەری وەهای لەسەر ئابووری وڵات نابێت، بەڵام ئەگەر گروپێکی گەورەی وەك مامۆستایان بیانەوێت هەمان کار بکەن ئەوا فشارێکی زۆر لەسەر ئابوری کۆمەڵگە دروستدەکات تەنانەت لە کۆمەڵگەیەکی دەوڵەمەنیشدا. لە ساڵەکانی پێش دەیەی ١٩٢٠دا، لە زۆر لە وڵاتان مامۆستایان لە خێزانی چینی ناوەڕاستی کۆمەڵگە بوون، مامۆستایی پیشەیەك بوو کە جێی بایەخی ژنانی چینی بەرز بوو، بەڵام لەگەڵ زیادبوونی دانیشتوان و گەورەبوونی شارەکان

و  پێشکەوتنی ناوەندە فێرکاریەکانی مامۆستایان، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کاری مامۆستایان گۆڕانی بەسەردا هات، زۆرینەی توێژینەوەکان دەریدەخەن لە ئێستادا مامۆستایان لە چینی خوارەوەی کۆمەڵگان.

چاوەڕێی مامۆستا لە فێرخواز

مەبەست لە چاوەڕوانی مامۆستا، ئەو زانیاریانە لە خۆدەگرێت کە مامۆستا سەبارەت بە فێرخواز و ڕەفتارەکانی کۆیاندەکاتەوە، بۆیە لەسەر ئەو بنەمای زانیاریانە، دەکرێ پێشبینی بۆ خوێندنی داهاتووی بکات. چاوەڕوانی مامۆستا کاریگەری لەسەر ئەنجامی کرداری فێرخوازان هەیە. بە پێی توێژینەوەی کە لە ساڵانی ١٩٦٠دا لە ئەمریکا لە لایەن ڕۆزتاڵ و ژاکۆبسۆنەوە ئەنجامدرا، بەو ئەنجامە گەشتوون کە پێشبینیەکانی مامۆستا پەیوەستە بە ئەرکی ڕاستەقینەی خۆی سەبارەت بە فێرخوازن. واتە ئەو فێرخوازانەی مامستایان پێشبینیان دەکرد سەرکەوتنێکی باش بە دەستبهێنن لە ڕاستیدا سەرکەوتنێکی باشیان بەدەستهێناوە. توێژەران باوەڕیان وایە کە پێشبینی مامۆستایان دوو کاریگەری گرنگی هەیە: یەکەم: کاریگەری خۆبەدیهێنان، دەبێتە هۆکاری ڕەفتارێك کە ئەم پێشبینیە نادروستە بگۆڕێت بۆ پێشبینیەکی درووست. دووەم: کاریگەری بەهێزی مانەوەیە، ئەم کاریگەریە کاتێك ڕوەدات کە مامۆستا چاوەڕوانی لە فێرخوازان دەکات بەردەوامی بەو ڕەفتارەیان بدەن کە پێشتر هەبووە.

هەردوو توێژەر برافی و گوود لە توێژینەوەیەکیاندا لە ساڵی ١٩٧٠دا دەربارەی کاریگەری چاوەڕوانی مامۆستا، گەشتونەتە ئەو دەرئەنجامەی هەر فێرخوازێك کە چاوەڕوان زۆری لێبکرێت سەرکەوتنی زۆر بەدەست دەهێنێت، بەڵام ئەو فێرخوازانەی کە چاوەڕوانی زۆریان لێ ناکرێت ئەوا سەرکەوتنی کەم بەدەست دەهێنێت. کاتێك کە مامۆستا دەرفەتی کەمتر بۆ بەشداریکردنی بابەتە گشتیەکان بە فێرخوازە کەمتر سەرکەوتووەکان دەدات یان کاتێك پرسیاریان لێدەکات و ماوەی کەمیان پێدەدات بۆ وەڵامدانەوە یان بەهۆی وەڵامدانەوەی ناڕاست، هەمیشە ئەو فێرخوازانەیان ڕەخنەباران کردووە و هاوکاری کەمیان دەکەن تا وەڵامی ڕاست دەدەنەوە. هەندێك لە توێژینەوەکان دەریانخستوە شێوەی ڕوخساری فێرخواز کاریگەری لەسەر جۆر و ئاستی پێشبینی فێرخوازکان هەیە، هەروەها توێژینەوەکان دەریانخستوە پێشبینی مامۆستایان بە گوێرەی ڕەگەزی فێرخوازان جیاوازی هەیە، پێشبینی مامۆستایان بۆ سەرکەوتنی خوێندنی کچان زیاترە لە کوڕان. پێشبینی مامۆستایان لەسەر بنەمای چینی کۆمەڵایەتیش جیاوازە، مامۆستایان زیاتر پێشبینیان بۆ سەرکەوتنی منداڵانی چینی باڵادەست و دەوڵەمەند.

سەرکەوتنی خوێندن بابەتێك نییە کە بە تەواوەتی لەسەر توانای بۆماوەیی منداڵ وەستابێت، بەڵکو مامۆستا کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە.

بێزاری مامۆستایان

هەستی لەخۆ نامۆبوون و بێتوانایی سەبارەت بە وانەوتنەوە، تایبەتمەندی زۆری مامۆستایانی ولاتە جیاوازەکانە، دوودڵی پیشەیی لەڕادەبەدەر و نەبوونی ئاسایش لەلایەن بەڕێوبەری قوتابخانەوە دەبێتە هۆکار تا زۆر لە مامۆستایان هەستی ماندووبون و بێبەرهەمیان هەبێت. چەمکی بێزاری بۆ یەکەمجار لە لایەن فراندبێرگەوە پێشنیارکرا، پێوەرێکی بۆ بێزاری دانا ئەمەش ئەمانەن: شەکەتی (چیتر تامەزرۆی بۆ کارەکەی خۆی نامێنێت)، نەبوونی هەستی سەرکەوتنی تاك (هەست دەکات ناگات بە ئامانجەکانی)، خۆبینین بەشێوەیەکیتر (تەماشای فێرخوازان دەکات کە شتێکن مایەی ڕەنج و ئەزیەتن نەك شتانێکی بایەخدار). بێزاری بەرهەمی درزێکی هەستپێکراوی نێوان چاوەڕوانی مامۆستا و ئەزمونی ئەو لە پۆلی وانەخوێندندایە. زۆرجار مامۆستا توانای ڕوبەوڕوبونەوەیان نییە لەگەڵ ئەو دۆخەی کە پڕیەتی لە ڕێوشوێنی کاغەزی بەڕێوبردن، گرنگی نەدانی دایبابان بە فێربوونی منداڵەکانیان، جیاوازی کلتوری و چینایەتی لە نێوان فێرخوازان و مامۆستایان ژینگەیەك دروستدەکات کە تیایدا ڕێزی مامۆستا ناگیرێت.

چ گروپێك لە مامۆستایان زیاتر توشی بێزاریدەبن:

١-دەروونناسان دەڵێن کەسانی نەخۆش و دورەپەرێز زیاتر لە هەمووان توشی سترێس دەبن.

٢-ئەو کەسانەی دیموکرات و خۆگونجێن گەر داوایان لێبکرێت سەختگیربن.

٣-زیادبوونی تەمەن و ئەزکموونی وانەوتنەوە.

٤-تێڕوانینی نەرێنی فێرخوازن بۆ قوتابخانە، کاریگەری هەیە لەسەر مامۆستایان.

٥-جیاوازی چینایەتی نێوان مامۆستایان و فێرخوازان.

٦-هەندێك لە دایبابان دەڵێن مامۆستایان موچە وەردەگرن و پێویستیان بە دەستخۆشی نییە.

٧-بونی بەڕێوبەری دەسەڵاتخواز و بەڕێوبەری خەمسارد.

کتێبی هەشتەم: دەروونناسی پەروەردەیی. - نوسینی: محەمەد پارسا.
وەرگێرانی: عەباس جوامێری.

چاپی یەکەم ۲۰۲۱

دەروونناسی پەروەردەیی، یەکێکە لە گرنگترین ئەو بەشانەی کە لێکۆڵینەوە و تاوتوێی پێشکەوتنی وانە و ڕاستکردنەوەی کەموکوڕیەکانی خوێندنی فێرخوازان دەکات. لە ڕاستیدا لەو کاتەوە ولهام وۆنت دەروونناسی ئەڵمانی لە ساڵی ۱۹۷۸دا تاقیگە دەروونناسیەکەی خۆی لە زانکۆی لایپزیگ دامەزراند، هەموو لێکۆڵینەوەکان تێیدا هاتوون، دەربارەی پرسی گەشەی تاکەکان، بیرهاتنەوە و لەبیرچوون، هەڵسەنگاندنەکانی خوێندن، شێوازە جۆراوجۆرەکانی فێربوون ئەنجامدراون.

کاریگەری ئاین

توێژینەوەکان نیشانیانداوە، کاتێك مەزهەبێك یان ڕێبازێکی ئاینی دێتەکایەوە، یەکەمین کار کە بۆ مانەوەی خۆی ئەنجامی دەدات گۆڕینی سیستەمی فێرکاری و پەروەردەی کۆمەڵگەیە، هەروەها چاکسازیکردنە لە هەڵسوکەوت و کرداری شوێنکەوتوانی خۆیدا. لەبەر ئەوە پەروەردە و فێرکردنیان بە سەرمەشقی خۆیان داناوە.

زەمینەکان و ڕێگاکانی پەروەردەیی

یەکەمین کتێبی دەروونناسی پەروەردەیی سۆرندایك لە ساڵی ۱۹۱۳دا بڵاوکرایەوە لەسەر سێ تەوەری سەرەکی: چیەتی سروشت و خۆماکی مرۆڤ و جیاوازیەکانی تاکەکەسی بڵاوکرایەوە. بە بڕوای سۆرندایك مرۆڤەکان یەکسان نین، بەڵکو لە نێوانیاندا جیاوازیەکی سەرسامکەر هەیە، فێرکاری و پەروەردەی سەرکەوتوو و پێشەنگ دەبێت لەسەر بنچینەی ئەو جیاوازیان پلان و سیستەمی خۆی دابڕێژێت. لە ڕاستید ڕێگای زانستی و ڕێگای لێکۆڵینەوە یەك چەمکن، بەڵام لێکۆڵەر دەتوانێت بەبێ بەکارهێنانی ڕێگای زانستی کار ئەنجامبدات.

دەروونناسان بۆ پەرەپێدانی وانە و خوێندنی فێرخوازان، کەڵك لە تیۆرەکانی فێربوون و ڕێگاکانی فێرکاری کاریگەر وەردەگرن، تا کاروباری فێرکاری و پەروەردە باشتر و خێراتر بەڕێوە بچێت و فێرخوازان بتوانن بە ماندوبونێکی کەمتر بتوانن ئەنجامی باشتر بەدەست بهێنن. برۆنەر دەروونناسی بەناوبانگ لە زانکۆی هارڤارد پێی وایە تیۆرەکانی فێربوون لایەنی وەسفکردنیان هەیە، بەڵام تیۆرەکانی فێرکاری ڕێگەپێدانیان هەیە. بەرنامەی دەروناسی

پەروەردەیی بە شێوەیەکی گشتی لە سێ قۆناغدا ئەنجامدەدرێت: لە قۆناغی یەکەم، چالاکیەکانی پێش فێرکاری ناو دەبرێت (ئامانج و ناسینەوە و تایبەتمەندی فێرخوازان)، لە قۆناغی دووەمدا، چالاکیەکان لە میانەی فێرکاریدا (پاڵنەر، وانەوتنەوەی کاریگەر، ڕێگاکانی فێرکردن)، لە قۆناغی سێیەمدا، چالاکیەکانی دوای فێرکاری (هەڵسەنگاندنی کار، کۆششی فێرخوازان).

ئەزمونەکانی فێرکاری مامۆستا

هەموو مامۆستایەك پێویستە ئەوە بزانێت، کە ئامانجی بنەڕەتی فێرکاری و پەروەردە فێربوونە، ئەرکی سەرەکی فێربونیش وروژاندن و ڕێنمایکردنی فێرخوازانە بۆ دەستڕاگەشتن بە گەشەپێدانی پەروەردەیی و زانستی. مرۆڤی ئەمڕۆ بە پێچەوانەی لەسەردەمی گۆڕانکاریدا دەژی، گۆڕانکاریەکان ئەوەندە خێران کە پێشبینی هەر بارێك لە ئایندەی نزیکدا دژوارە. بە گونەی کیلی ١٩٧٠ ئێمە لەگەڵ دروستکردن و ،ێرانکاری ئەم جیهانەی تیایدا دەژین بەشدارین، دید و جیهانبینی ئێمە لە بەرنامەی قوتابخانە شاراوە و نادیارە. ئەگەر پرۆگرام و ڕێگاکانی فێرکاری بە باشی هەڵسەنگاندنیان بۆ نەکرابێت و پرسە گشتیەکانی مرۆڤایەتی لە بەرچاو نەگیرێت ئەوا مرۆڤایەتی لەبری پێکەوەژیانێکی ئاشتیانە. بەردەوام لە شەڕ و دووبەرەکی و وێرانکاری و نابوتی بەسەر دەبات.

ئامانجەکانی پەروەردەیی

ئامانج کە بە واتای گەیشتنە بە ئامانجێکی ویستراو لە چالاکیەکی دیاریکراودا بە شێوەی خۆویست و خۆنەویست دێتەدی. ئەو مامۆستایەی کە تێڕوانینێکی زانستی و پیشەیی هەیە، دەیەوێت بزانێت کە مەبەست لە وانەوتنەوە چییە و فێرخوازان بە چ قۆناغێکی گەشەکردنی دەروونی و هزری و کۆمەڵایەتی و مەزهەبی و هونەریدا تێدەپەڕن. ڕۆبەرت گانیەی دەروونناس لە ساڵی ١٩٦٤ ئاشکرای دەکات: دەستنیشانکردنی ئامانجەکانی فێرکاری بە یەکێك لە پێویسترین و گرنگترین هەوڵەکانی پەروەردەی هەژمار دەکرێت، چونکە دیاریکردنی ئامانجەکان پەیوەندی نزیکیان بە پێشکەوتنی کاروباری وانە و پیشەوە هەیە لەسەر ئەو بنەمایە تا ئامانج ڕوونتر و نمونەیتر بێت جێبەجێکردنی بەرنامەکان سەرکەوتوتر دەبێت. زۆربەی فێرخوازان پێیان باشە بزانن کە پێش ئەوەی قۆناغێکی فێرکاری تەواو دەکەن چیان دەستدەکەوێت. ئەگەر مامۆستای مێژوو بە تەنها باسی ڕووداوەکان بکات، بە بێ ئەوەی گوێ بداتە کاریگەری ئەو ڕووداوانە لەسەر دوای خۆیان و فێرخوازان لە کێشە و چارەسەرەکان کاریگەری نەبێت، ئەوکات فێرخوازان

وابیردەکەنەوە کە ئەرکی ئەوان تەنها لەبەرکردنی بابەتەکان و هیچیتر، ئەمەش لە گرنگی و کاریگەری ئامانجە پەروەردەییەکان کەمدەکاتەوە.

تێگەشتنی تایبەتمەندیەکانی گەشەی فێرخوازان: یەکێك لە ئەرکە سەرەکیەکانی مامۆستا ناسینی فێرخوازانە، بەو مانایەی کە پەروەردەکار دەبێت جیاوازی تاکایەتی، زیرەکی و ئامادەکاری، پێداویستیەکان، کەموکوڕی و توانای فێرخوازان لە هەریەك لە قۆناغەکانی گەشەدا وشیاری تەواوی هەبێت.

پاڵنەر: دەروونناسان پێیان وایە کە پاڵنەر هێزێکی ناوەکییە لە بونەوەرانی زیندوودا، بە هۆکاری جوڵاندن و گۆڕینی ڕەفتار دادەنرێت. ئەگەر مامۆستایان بیانەوێت لەکاری فێرکرای و پەروەردەدا سەرکەوتووبن، دەبێت هۆکارە جیاجیاکانی پاڵنەر بزانن. سەعدی شیراوی دەڵێت: وانەی مامۆستا گەر نەغمەی خۆشەویستی تیابێت

منداڵای هەڵهاتوو لە قوتابخانە لە هەینیدا بە غار دێنێتەوە.

پرۆسەی فێربوون: فێربوون کردەیەکی جوڵەدار یان دینامیکیە کە ڕەفتاری تاکەکانی مرۆڤ، بە کاریگەری تاقیکردنەوە و بە مەبەستی گونجان لەگەڵ دەوروبەر دەگۆڕێت. تیۆرەکانی فێربوون بە گشتی بەسەر سێ گروپدا دابەشبوون: بزوێنەری وەڵام، مەعریفی و کۆمەڵایەتیدا دابەشدەبن. زۆربەی نیگەرانی مامۆستایان لەوەدایە کە بە چ ڕێگایەك دەتوانن فێرخوازانیان فێربکەن. فێرخوازانیش دەیانەوێت هەتا بکرێت وانەکانیان بە باشتر بۆیان ڕوونبکرێتەوە.

لە کاری فێرکاری و فێربووندا ڕێگای جۆراوجۆر هەیە، پێویستە مامۆستا ڕێگا کاریگەرەکانی فێرکاری هەڵبژێرێت و بە هەنگاو جێبەجێبکات. چەمکەکان ئامرازی بیرکردنەوەن، بە چارەسەری کێشە، هۆکاری درککردن و پێشکەوتنی فێرکاری و پەروەردە هەژمار دەکرێن. هەرکاتێك فێرخوازان زیاتر لەگەڵ چەمکەکان ئاشنابن و لەبەکارهێنانیان بەڕاستی لە هەر حاڵەتێکدا بە باشی شارەزابن، ئەگەر وا نەبێت چەمکەکان ئاڵۆز دەبن و ئارەزووی خوێندیان نامێنێت.

تەکنیکی وانەوتنەوە خۆی لە خۆیدا کارێکی هونەریە، ناتوانرێت وەك خۆنوسێکی دیاریکراو دەستنیشان بکرێت، چونکە ئامانجی وانەوتنەوە دروستکردنی گۆڕانکاریەکی دڵخوازە لە ڕەفتاردا.

هەڵسەنگاندن: دوا هەنگاوی فێرکاری لە دەروونناسی پەروەردەیدا هەڵسەنگاندن و پێوانەکردنە. لە ڕاستیدا هەڵسەنگاندن ئامرازێکە بۆ مامۆستا تاوەکو لە ئەنجامی فێربوونی فێرخوازان و وانەوتنەوەی خۆی ئاگاداربێت. ئەوەی پەیوەندی بە فێرخوازان هەیە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکان و بەدەستهێنانی نمرەی بەرزە.

ئامانجەکانی پەروەردەیی لە ڕوانگەی گەلانی جیاوازەوە

لە چینی کۆندا ئامانجی پەروەردەیی سەرکردە و پێشەوا ئامادە بکەن بۆ ئەوەی شارەزای زانستی و ڕۆشنبیری کۆنبن. دەیانوست تاکەکان وا پەروەردە بکەن کە خاوەن ڕەفتاری شایستەبن لە تەواوی کاروباری ژیاندا، ئەخلاقی کۆمەڵایەتی خەڵك لەگەڵ ڕێگاکانی کتێبی کۆنفیۆشیۆسدا بگونجێت.

لە میسریش ئامانجی پەروەردە دەستەبەرکردنی کاهینەکان بووە، پاشان ئامانجی پەروەردەیی ئەرکێکی دونیایی لەگەڵ لایەنەکانی ئاین تێکەڵکراوە.

لە سپارتە یان لاکیدمون، ئامانجی پەروەردە سنوردار کرابوو لە پەروەردەکرنێکی ئازادی پیاواندا کە تایبەتبووە بە پەروەردەکرنی ئەو پیاوانەی لە مەیدانی شەڕدا خاوەن هێز و لە قسەکردن و وتارداندا قسەزانبن.

لە کڵێسەکانی کاسۆلیك، ئامانجی پەروەردە ڕەهبانیەت بووە، کوشتنی ئارەزوەکان و نەهێشتنی پاڵنەرە فیسۆلۆجیەکان لە جەستەدا بۆ پەرەپێدانی لایەنی ڕۆحی و ڕزگاربوون لە ئەشکەنجە و سزای دۆزەخ.

لە ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەیەم، ئامانجی پەروەردە، دروستکردنی مرۆڤی ئازا و بوێر بوو بە مەبەستی جێبەجێکردنی یاسا و ڕێزلێنانی ئازادی.

لە ژاپۆن، پەروەردەکرنی فەرمانبەر و کارمەندانی پەیوەندیدار بە دەوڵەت لە ڕێگای پەروەردەی سۆزی ئەوانەوەیە کە سود بە دەوڵەت بگەیەنن.

ئامانجی کۆمەنیسیەکان، پەروەردەکردنی تاکێکی مرۆیی بۆ هاوکاری و چالاکی لە ڕاپەڕینی شۆڕشدا.

ئامانجی پەروەردەیی لە ئیسلامدا، دروستکردنی تاکێکی تاکپەرەست و گوێڕایەڵی خودا، مرۆڤێکی بەرپرس و هاوسەنگ و خۆشبەخت و ئاوەدانکەرەوە و جێنشین لەسەر زەوی.

لە ڕاستیدا ئامانجی پەروەدەی هەر گەلێك ئەوەیە كە بەرنامەی دەوڵەتەكەی پەسەند بكات و وەفاداربن بۆ نیشتیمانەكەیان.

ئامانجەكانی پەروەردەیی لەسەر بنەماكانی دیموكراسی

لە كۆمیسیۆنی پلاندانای پەرورەدەیی ئەمریكا لە ساڵی ١٩٨٣دا ئامانجی نەتەوەیی و فێركاری بەم شێوەیە بڕیاری لەسەردرا:

١- ئامانجی خۆپێگەیاندن: زیهنی توێژەر – قسەكردن – خوێندنەوە و نوسین و هەژماركردن – بینین و بیستن – خوە دروستەكان – خولیای زانست و مەعنەوی- تەندروستی جەستەیی – ئارەزوی هەنەری و جوانناسی.
٢- ئامانجەكانی پەیوەندیە مرۆییەكان: ڕێزگرتن لە مرۆڤایەتی – پێشبڕكێ – هاوكاری – پابەندبوون بە یاسا و ڕێسا – بەرزڕاگرتنی خێزان – ڕێزگرتن لە ئازادی تاك.
٣- ئامانجەكانی لێهاتووی ئابوری: كار وپیشە – هەڵبژاردن و لێهاتووی لە كار – چاكسازی و بایەخبێدان – ئابووری كەسی – كڕیاری وریا و سەركەوتوو.
٤- ئامانجەكانی بەرپرسیارێتی كۆمەڵایەتی: دادگەری كۆمەڵایەتی - چالاكی كۆمەڵایەتی – دەركپێكردنی كۆمەڵایەتی – چاوپۆشی و خۆڕاگری – هاونیشتیمانی جیهانی و سیاسی و دیموكراسی.

ئەنجامەكانی فێركاری و خوێندن

ئامانجەكانی فێركاری و خوێندن ئاسایی لە پرۆگرامەكانی خشتەی ماوە دیاریكراودا دەردەكەون. هەروەها ئامانجەكانی فێركرای لە قۆناغی بنەڕەتی فێربوون و نوسین و خوێندنەوە و هەژماركردنە، بەڵام لە خوێندنی باڵا شارەزای و پسپۆڕیە لە بەشە تایبەتەكان. پرۆگرامەكانی هەر قۆناغێكی فێركاری دەربڕی خودی ئامانجەكانی پەروەردە و لە تانوپۆی ئەواندا بەزۆری بە پێی داخوازی و پێداویستیەكانی هەر كۆمەڵگەیەكە. گومانی تێدا نییە هەر جۆرە فێركاری و پەروەردەیەك ئامانجەكانی دیاریكرا و بەهادار نەبن ڕێگا وندەكات و سەر ئەنجام بێجگە لە سەر لێشێوان و ڕێونكردنی فێرخوازان كارێكی پێناكرێت.

پۆلێنكردنی ئامانجەكانی پەروەردەیی

زۆربەی مامۆستاكان بەزۆری هەوڵی بەدەستهێنانی زانیاریەكان دەدەن، بەڵام گرنگی بە

ئامانجەکانی فێربوون لای بەنجامین بلوم کە یەکێکە لە دەروونناسە ناسراوەکان و مامۆستای زانکۆی شیکاگۆ، جۆرەکانی فێربوون لەسەر بنەمای ئامانجەکانی: مەعریفی (زانیاری، درکپێکردن، جێبەجێکردن، شیکردنەوە، پێکهێنان، هەڵسەنگاندن)، سۆز (وەرگرتن، دانەوە، نرخاندن، ڕێکخستنی بەهاکان، خوگرتن)، جوڵە و بزاوت (جوڵەی خاو و ناوهەسەنگی جەستەیی، جوڵەی نەرم و هاوسەنگ، ئامرازەکانی پەیوەندیکردنی نازارەکی، ڕەفتارەکانی زارەکی) دابەشدەکات.

ئامانجەکانی فێربوون لە ڕوانگەی گانییەوە

گانییە پێیوایە فێربوون شێوە و جۆری جیاجیای هەیە، هەریەکە لەو جۆرە فێربونانە ئامانجی تایبەتی خۆی هەیە، کە لەگەڵ ئەوانیتردا جیاوازی هەیە، لەوانەیە یەکێکیان پێویستی بەودیان هەیە. گانییە لە ساڵی ١٩٧٧دا ئامانجەکانی فێربونی لە ئاسانەوە بۆ قورس بۆ حەوت پلە دابەشکرد: فێرکاری بە هێما، فێرکاری بە وەڵامی بزوێنەر، زنجیرەکردن، هاوئاوازی پەروەردەی زارەکی، فێرکاری بە ناسینەوە، فێرکاری بە چەمك، فێرکاری بە ڕێسا و یاسا.

بەشی دووەم

تایبەتمەندیەکانی فێرخوازان

جیاوازیەکانی تاکی و ڕۆڵی کەسایەتی و خوو لە پەروەردەدا

تاکەکانی مرۆڤ لە نمونە بایلۆجیەکاندا وەك یەك گەشە دەکەن، بەڵام لەگەڵ یەکتر جیاوازیان هەیە. دەروونناسی گەشە ئەو ڕاستیە دەخاتەڕوو کە منداڵان و مێردمنداڵان لەسەر بنچینەیەکی تایبەت بە شێوەی چەند گۆڕانکاریەکی یەك لە دوای یەك گەشە دەکەن. بەڵام لەبەر ئەوەی بۆماوەیی و کاریگەرییە ژینگەییەکان و فەرهەنگیەکان لە پێشکەوتن و دواکەوتووی تاکەکانی مرۆڤدا بە شێوەیەکی بەرامبەر بەیەك کاریگەریان لەسەر یەك هەیە، هیچ تاکێك بە یەکسانی گەشە ناکەن. هەروەها جیاوازی ڕەگەزی نێوان کوڕان و کچان لە ڕووی جەستە و دەروونیەوە، بەو واتایەی کە هەر کوڕ و کچێك لە ئەنجامدانی کارەکانی خۆیدا شێوازی تایبەتی خۆی هەیە کە لە سەرانسەری قۆناغی گەشەکردنیاندا دەردەکەوێت. کچان بە هەڵپە و چوستوچالاکترن و لە قۆناغی پێش قوتابخانە کچان باشتر و خێراتر لە کوڕان بەسەر زمان و قسەکردندا زاڵدەبن و باشتر وشەکان دەردەبڕن، بەڵام لە سەرەتای پێگەشتندا لە تەمەنی ١٤ بۆ ١٥ ساڵیدا لەم

ڕوەوەو جیاوازی نێوانیان کەمدەبێتەوە وردە وردە نامێنێت. کچان لە پێشبینیکردا لە کوڕان باشترن، بەشێك لە لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەردەخەن کە کوڕان لە پرسەکانی بۆشایدا توانای باشتریان هەیە و زۆربەی ئەوانە لە شیکاری پرسیارەکانی بیرکاریدا بەرچاودەکەون. کوڕان کەمێك لە کچان زبرترن.

جیاوازی لە ڕووی خێزانیەوە

ئەو هەڵسوکەوتەی خێزان سەبارەت بە منداڵ دەیگرێتەبەر، کاریگەریەکی هەستیاری لەسەر گەشەی کۆمەڵایەتی و کەسایەتی ئەو منداڵە جێدەهێڵێت. خێزانەکان لە شێوە جیاجیاکان لەگەڵ یەکتر جیاوازن. ژمارەی منداڵ، میهرەبانی،پەیڕەوکردنی دەسەڵات، پێگەی ئابوری و سیاسی وکۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری هەموو ئەمانە هۆکاری گرنگن کار لە دەرکەوتنی ڕەفتاری منداڵان دەکەن. دەڤید ئەکیندی دەروونناسی ئەمریکی لە ساڵی ١٩٨٥دا لێکۆڵینەوەیەکی سەبارەت بە  فێرخوازانی پۆلی سێیەم ئەنجامدا، بە پێی ئەو لێکۆڵینەوە ئەو فێرخوازانەی کە توانیبویان ڕەزامەندی دایبابیان بەدەستبهێنن، زۆربەیان جێگای سەرنج و هەمووانبوون پتر لە هەمووان لە چاودێری هاوپۆلان و هاوڕێکانیان بەهرەمەندبوون.

چۆنیەتی گەشەی زمان

زمان لە تەواوی قۆناغەکانی گەشەدا ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەو ئاستەی ئاخاوتنەوەیە دایباب هەیانە لەگەڵ منداڵ. منداڵانی خێزانە خوێندەوار و پەروەردەکراوەکان لەگەڵ ئاخاوتنە دروستەکان و قسە و گوتاری شایستەدان، لەگەڵ ئەوانەی لەم نیعمەتە بێبەشن جیاوازیان هەیە. دەروونناسێکی کلینیکی جەخت لەوە دەکەنەوە کە هۆکارەکانی کەسێتی و هەژاندن لە منداڵاندا نیشانەکانی بە شێوەی نەخۆشی و گرفتی قسەکردن دەردەکەون. ئەم هۆکارانە کار لە گەشەی زمان و قسەکردن دەکەن: کایەی سۆزداری خێزان و گەرموگوڕی خۆشەویستی ڕێگای گفتوگۆ زیاتر دەکات، ئامرازەکان و دابینکردنی هۆیەکانی یاریکردن و خوێنجنەوەی چیرۆك، شێوازی پەرورەدەکردن و نمونەی باش و ڕەفتاری چاك. دەروونناسان لوریا و یودۆڤیچ لە ساڵی ١٩٥٩دا توێژینەوەیان لەسەر دوو منداڵی دووانە وەرگرت، لە دوو ناوەندی جیا دایانان، کە لە ڕووی پەروەردەیەوە جیاوازبوون، دوای ماوەیەك هەردو منداڵەکەیان خستە ژێرباس و لێکۆڵینەوە لە ئەنجامدا دەرکەوت، کە ئەو منداڵەی بە زمان و قسەکردنێکی فێرکاری تایبەت پەروەردەکرابوو دەیتوانی لە ناوەندی خۆیدا دڵنیاتر و کاریگەرتر بێت.

لێکۆڵەران لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەدا لەوە تێگەشتوون، کە ئەندامانی خێزانانەی پێداویستیان زۆرە و لە ناوچە هەژارنشینەکاندان بەزۆری لە ڕووی پێشکەوتنەکانی وانەوە باری ژیانیان لە خێزانی چینە ناوەندەکان نزمترە. منداڵانی چینی هەژاران کەمتر ڕوو لە زانست و پێشکەوتنی وانەکان دەکەن، زۆربەیان ئەرکەکانی قوتابخانە بە باشی ئەنجامنادەن، کەمتر گوێ لە وانەکان و قسەی ماۆستا دەگرن. کۆلمان یەکێکە لە لێکۆڵەرە ناسراوەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٦١ لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەك بۆ ئاگاداربوون لە کاریگەری هەژاری لەسەر پێشکەوتنی خوێندن و پێشگیری لە پێشهاتە ناخۆشەکان، لە ئەنجامدا بۆیدەرکەوت بێهیوای و دواکەوتووی فێرخوازان لە خێزانە هەژارەکان لە هەرە هۆکارەکان بوو بۆ شکست لە خوێندن لەبەر ئەوەی لەم خێزانانەدا پاڵنەر و هەستی بەرسیارێی خوێندنیشیان نەبوو. یەکێکیتر لە توێژەرە بەریتانیەکان بە ناوی میلەر لە ساڵی ١٩٧٠دا لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجامدا، ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی سەرکەوتنی فێرخواز لە خوێندندا و ڕۆڵێکی فراوانتریان هەیە لە چینەکانی ئابوری کۆمەڵایەتی ئەمانەن:

١-ئارەزومەندی و هۆگربوونی فێرخواز بە خوێندنەوە.

٢-دیدی ئەرێنی فێرخوازان بۆ قوتابخانە.

٣-بۆچونی ئەرێنی سەبارەت بە چینی خوێندەوار.

٤-هاوکاری دایباب بۆ منداڵ.

ڕۆڵی کەسایەتی لە پەروەردەدا

کەسایەتی چەمکێکی وەرگیراوە لە ڕەفتار و پەیوەندی بە هەموو لایەنەکانی ڕەفتاری مرۆڤەوە هەیە، چونکە ئێمە تەنها ڕەفتار دەبینین و بۆ هەر بارێکی ڕەفتار ناوێك دادەنێین، وەك: ڕاستگۆی، ئەمانەتپارێزی، ئازایەتی...دەروونناسان ئەم وشانە بە سیفەتەکانی کەسایەتی ناودەبەن. سیفەتەکانی کەسایەتی ڕووی هەڵسوکەوتی بەرز لە مرۆڤدا پێش دەخات. خووی کەسایەتی نیشانەی کەسایەتی تاکە و پەیوەندی بە سیفەتی گشتی کەسەکەوە هەیە، دەربڕی چەند شێوازێکە مرۆڤ بە پێی بنەما و بیروڕاکانی خۆی ئەنجامی دەدات، خوو شتێکە بەدەست دێت، ئیشی پەروەردەکاران ئەوەیە کە بە هەر ڕێگایەکی گونجاو بێت فێرخوازان بە خوو و سروشتی پێویست پەروەردە بکەن.

هاوئاهەنگی

کەمن ئەو کەسانەی دەتوانن لەژێر کاریگەری و  دابونەریتی گشتی و کۆمەڵگادا خۆیان لابدەن، بیروباوەڕی کۆمەڵگە دەتوانێت فشار بخاتە سەر تاکەکانی، تەنانەت ئەگەر بە پێچەوانەی هەڵسوکەوتی خۆی بێت، ئامۆژگاری فێرخوازان دەکرێت خۆیان لە تاکرەوی بپارێزن و بە پێی دابونەریت ڕەفتار بکەن. ئەوانەی بە پێچوانەی دابونەریت ڕەفتار دەکەن بە کەسانی نائاسایی ئەژمار دەکرێن، ئەوانەشی لە ڕادەبەدەر هاوهەمانگی نیشان دەدەن لە ڕووی ڕواڵەتی بوونەوە ڕوبوڕووی دژواری زۆر دەبنەوە.

خۆپاڵنەری

ئامانجی پەروەردەیی قوتابخانە دەبێت یارمەتیدانی فێرخواز بێت بۆ ئەوەی هاوسەنگیەکانی گونجاو لە نێوان فەرمانبەجێهێنان و خۆدەرخستنیدا ڕابگیرێت و مامۆستاش ئارەزووەکانی منداڵ بخاتە ژێر سەرنجەوە. منداڵان پێیان باشە سەبارەت بە ڕێگاکانی ئەنجامدانی ئیشوکاریان پرس و ڕایان پێبکرێت.

هاوڕێیەتی

دروستبوونی هەڵسوکەوتی هاوڕێیانە یەکێك لە دیاردە دیارەکانی کەسایەتییە. فێرخواز کاتێك دەتوانێت لەگەڵ کەسانیتر لەیەکتر تێبگات. لە نێوان ئەو و هاوانەکانیدا لە ڕێگەی تاقیکردنەوە و هاوکارییەوە پەیوەندی هاوڕێیەتی دروست بوبێت.

ڕاستگۆیی

ڕاستی و پاکی، هەموو گەلان و میللەتان لە تایبەتمەندییە دیار و بەهادارەکانی هەر مرۆڤێك هەژمار دەکرێت. دکتۆر بێن کارپمان لە باوەڕەدایە کە درۆکردن و جۆرەکانی فریودان کە لە ڕاستی و دروست جیاوازە، بەم شێوازە خۆی دەنوێنێت:

نیشاندانی میهرەبانی لە پێناو ئەدەب و پیویستی بەرامبەر.

نیشاندانی ئێش و ئازار، بە مەبەستی سەرنجڕاکێشان و دەرخستنی هاودەردی.

پاڕانەوە و نوزانەوە، بە ئامانجی داپۆشینی هەستی سوکی.

هەستی خراپە ویستن، بە هۆی چەوساندنەوە و سودوەرگرتنی لە شتی ناڕەوا.

بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە، بە مەبەستی ئازاردانی تاکێکی دیاریکراو.

هاتشۆرن و مەی لە ساڵی ١٩٢٨ لە توێژینەوەیەکیاندا سەبارەتس بە فێڵ و تەڵەکەبازی و فریودان، دەریانخست، کە ڕاستی و ناڕاستی و پاکی و فێڵبازی لەو سیفەتانەن کە فێردەکرێن و وەردەگیرێن، نەك خۆماکی و بۆماوەییبن.

ئەرکناسی و نەرمینواندن

هەندێك منداڵ زیاد لە پێویست پابەندن بە کار و فەرمانەوە، لەگەڵ نوێبونەوە و گۆڕانی هەلومەرجی پێویستدا هەر لەسەر ڕەوشی پێشویان بەردەوامن. پەروەردەکارە خاوەن ئەزمونەکان ڕاسپاردەیان ئەوەیە، کە منداڵان لەو بارەدا وازیان لێبهێنرێت با وەك خۆیان بمێننەوە، بۆ ئەوەی ڕێگا چارەی کێشەکانی خۆیان بدۆزنەوە.

مرۆڤدۆستی

بۆچونیی گەورەکان وێنەیەك بۆ تێڕوانینی منداڵان دەدات، ئەگەر مامۆستایان و دایبابان یارمەتی منداڵان بدەن خۆشی و شادی دەربڕن، منداڵانیش مەبەستی هاوشێوەی تێدا دروستدەبێت و فێڵادەبێت کە چۆن یارمەتی ئەوانە بدات کە پێویستیان بە هاوکاریە و زۆر بە گیانێکی مرۆڤدۆستانەوە هەنگاو دەنێت. دەبێت منداڵ لەوە ئاگاداربکرێتەوە هەروەك چۆن ڕێز لە مافی بەرامبەر دەگرێت، دەبێت ئاواش داکۆکی لە مافی خۆی بکات.

جێگیربوونی ئەخلاق

منداڵان بە ئاسانی ناتوانن دابونەریت و ڕێسا کۆمەڵایەتیەکان فێربن و پەیڕەویان لێبکەن. زۆربەی خەڵك سەبارەت بە چیەتی هەیانە پێناسەیەکی دیاریکراویان نییە. بەزۆری چێژ لەو هەڵسوکەوتە باشانە وەردەگرن کە لەگەڵ ڕێسا کۆمەڵایەتیە چالاکەکاندا هاوڕایە.

گەشەی خوو

خوو و سروشت کردەوەیەکن بە تێپەڕبوونی کات لە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی کەسی بە شێوەی هەست و هزر و کردار دەردەکەون. سیفەتەکانی ئێستای تاك دەرئەنجامی سەرنج و کاردانەوەی ڕابردویەتی. قوتابخانە جەتوانێت ڕۆڵی گرنگ لە هەموو لایەنەکانی گەشەی سروشت و خووی منداڵان و مێردمنداڵاندا لە ئەستۆ بگرێت. لێکدانەوەی دوو دەروناس لە ساڵی ١٩٦٠ ئەوە دەردەخات، کە خوێندنەوە فەرمییەکان لە دۆزینەوەی

و بەهێزکردنی سیفەتە سروشتیەکان و ەك: بڕوابەخۆبوون و ئارامگرتن، لاوازکردنی سیفەتە نەویستراوەکانی وەك: دەسەڵاتخوازی و دەمارگیری و زێدەڕەوی.

یەکێك لە بنەڕەترین ڕێگاکانی چارەسەرکردنی کەموکوریەکانی مۆڕاڵی، باسکردنی ڕاستگۆیانە لەگەڵ منداڵان سەبارەت بە پرس و بەهاکان. وەك: تەزویر، دوڕووی، هەڵبەستن، دزی، زۆربلێیی، خۆویستی.

ڕۆڵی قوتابخانە لە گەشەی کەسایەتیدا

یەکێك لە فەرماە گرنگەکانی قوتابخانە دۆزینەوەی پێگەکانی کۆمەڵایەتیە کە بە هۆیانەوە لە وەرگرتنی سیفەت و خووە پەسەندەکاندا یارمەتی فێرخوازان دەدات، بەو واتایەی کە هەنگاونانی گروپێك هەلێك دێنێتە کایەوە تا گیانی هاوکاری، ڕاستگۆی، هەڵسوکەوتە ویژدانیەکان، ئازایەتی، پاڵنەری خودی، خۆڕاگری لە وانەدا بەهێز دەکات. مامامۆستا لەبری ئەوەی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گفتوگۆ لەگەڵ فێرخوازەکاندا بکات وا باشترە ڕوبەڕوو بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ وەڵامی پرسیارەکانیان بداتەوە. ئەگەر منداڵ بە شێوەیەکی شایستە ڕێنمایی بکرێت، ئەندامێکی کارامە و سودبەخشی لێدەردەچێت بۆ کۆمەڵگە. مامۆستای کارامە دەزانێت کە ڕێکاری گونجاندن و ژیرانە لە تەندروستی دەروونی و گەورەبوونی فێرخوازاندا هەنگاوبەهەنگاو بهێنێتەوە و ڕێکیان بخات.

وەرزی چوارەم

گەشەی جەستەی، کۆمەڵایەتی، هەڵچوون، ئەقڵی فێرخوازان لە قۆناغە جیاوەزەکانی تەمەندا.

بوونی زانیاری و ناسینەوەی مامۆستا بە تەواوەتی سەبارەت بە تواناکان، کەموکوڕیەکان، پێداویستیەکان و تواناکانی جەستەیی و دەروونی منداڵان و مێردمنداڵان لە قۆناغە جیاجیاکانی تەمەندا لە هۆکارە زۆر گرنگەکان و ئاسانکاری کاروباری فێرکاری و پەروەردە هەژمار دەکرێت. لەبەر ئەوە پێویستە پەروەردەکاران لە هەموو تایبەتمەندیەکانی قۆناغە جیاجیاکانی تەمەن شارەزایی پەیدا بکەن.

قۆناغی منداڵی باخچەی ساوایان ٣ بۆ ٦ساڵی - قۆناغی یەکەمی بنەڕەتی ٦ بۆ ٩ ساڵ

قۆناغی دووەمی بنەڕەتی ٩ بۆ ١٢ ساڵ - قۆناغی ناوەندی ١٢ بۆ ١٥ ساڵی.

قۆناغی ئامادەیی ١٥ بۆ ١٨ ساڵی.

تایبەتمەندییەکانی جەستە و کۆمەڵایەتی و هەڵچون و عەقڵی ئەم قۆناغانە

قۆناغی منداڵی باخچەی ساوایان: لەبەر ئەوە لەو تەمەنەدا زۆر چالاك و پڕ جۆشوخرۆشن هەڵبەز ودابەز زۆر دەکەن، لەبەر ئەوە دەبێت تا لە تواناد‌ا هەبێت هەلی ڕاکردن و سەروخواریان بۆ بڕەخسێنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت زۆر ماندوو بکرێن. لە نوسین و قۆپچەداخستن و لەبەرکردنی جلوبەرگ خاون. لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە یەك دوو هاوڕێی باشیان هەیە، بە زۆری هاوڕێیەت لەگەڵ هەمان ڕەگەزی خۆیان دەکەن، زۆرجار گروپێك بۆ یاریکردن دروستدەکەن. لە ڕووی هەڵچونەوە لەم قۆناغەدا بە ئاشکرا سۆز و هەلچونەکانیان بە ئاشکرا و بێپەردە ئاشکرا دەکەن. زیاتر توڕە و ڕقئەستور دەبن کاتێك برسیان دەبن یان خەویان دێت. لاسایی گەورەکان دەکەنەوە بەتایبەت لە ترسان لە شتێك. زۆربەیان سەرنجی کەسانی گەورە ڕادەکێشن بۆلای خۆیان. لە ڕووی عەقڵیشەوە حەزیان لە گوێلێبوون و چیرۆکە، هەروەها قسەکردن و خۆدەرخستن.

قۆناغی یەکەمی بنەڕەتی: ئەمانیش وەك قۆناغی پێشوو بزێوو بە جۆشوخرۆشن، بەڵام لەبەر ئەوەی پێویستە لە پۆلدا بە هێمنی و بێدەنگی دابنیشن، پەنادەبەنە بەر نینۆکجوین و ئەملاولاکردن و قسەکردن. لەبەر ئەوە پێویستە مامۆستایان ئەرکی زۆریان بەسەردا نەدەن و پەرتوکی وانەکان بە گەورە نوسرابن. لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە هەوڵی زۆر دەدەن هاوڕێی نوێ پەیدابکەن و لەگەڵ ئەوەشدا دوژمنێك یان زیاتریشیان هەیە، بەڵام منداڵی گۆشەگیر توشی کێشەی زۆر دەبنەوە، ڕوو دەکەنە یاریە ڕێکخراوەییەکان و بە جێهێنانی یاسا، زۆر خۆپەرەستن و هەندێکجار لە نێوان کوڕان مشتومڕ و شەڕکردن ڕوودەدات. لە ڕووی هەڵچونەوە هەستیاری و سۆزی کەسانیتر دەکەن، بۆ ئارەزوو خۆشحاڵی خۆیان گاڵتە بە کەسانیتر دەکەن، لە بەرامبەر ڕەخنە و گاڵتەپێکردن هەستیارن. بە زۆری مامۆستاکانی خۆیان خۆشدەوێت، لەبەر ئەوە حەزدەکەن مامۆستاکانیان لە خۆیان رازی بکەن. لە ڕووی عەقڵیشەوە دڵیان بە فێربوون و وانە خوێندن خۆشە بەتایبەت پێیان خۆشە وانەکان بە ئەزلەبەر وەك توتی بڵێنەوە. هەندێکجار حەزیان بە وشەی نالەبار و جنێوو هەیە.

قۆناغی دووەمی بنەڕەتی: قۆناغی گەشەی خێرای جەستەیە، لەبەر ئەوە بەشێکی زۆر لە کچان و هەندێکیش لە کوڕان هەر بە زووی کۆئەندامی سێکسیان پێدەگات، بە زۆری لەو تەمەنەدا کچان باڵا و کێشیان لە کۆڕان زیاترە. مامۆستا دەبێت زۆر بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم قۆناغەدا بکات، لەبەر ئەوەی گەشەی ئێسکیان تەواو نەبووە توانای هەڵگرتنی فشاری قورسیان نییە. لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە سەرەتای کەموزۆری

پەرشوبلاوی هاوڕێیانە، کە لە شێوەی پێوانەی ڕەفتاری منداڵادا دەردەکەوێت، بە زۆری توشی ڕکابەری دەبن لەگەڵ ڕکابەرەکانیان. لە نێوان کوڕان و کچان زۆرجار دەبێتە توانج لەیەکگرتن. مامۆستای کارامە دەبێت ئەمجۆرە ڕەفتارانە نەهێڵێت. زۆرجار ئەم تەمەنە پەنا دەبەن بەر تیم دروستکردن و فێری دەمارگیری بۆ تیمی خۆشیان دەبن. لە ڕووی هەڵچونەوە ڕوبەڕووی دژواریە جۆراوجۆرەکان دەبنەوە لە نێوان شێوەی هەڵسوکەوتی منداڵان و و ڕێوڕەسمی گەورەکاندا. بەڵام هەندێك منداڵی تاوانکار لە پەروەردەی ڕاستودروست بێبەشبوون. لە ڕووی عەقڵیشەوە سەبارەت بە هەموو بابەتك دەپرسن و لێکۆڵینەوە دەکەن، چون بۆ هەر باەتێك کۆمەڵێك زانیاری کۆدەکەنەوە. لەبەر ئەوە پێویستە بە ڕاستی و دروستی وەڵامی پرسیارەکانیان بدرێتەوە بەمەرجێك ڕەچاوی تەمەن و زیرەکی منداڵەکە بکرێت.

قۆناغی ناوەندی ١٢ بۆ ١٥ ساڵی: لەم قۆناغەدا کچان کۆئەندامی سێکسیان پێدەگات، بەڵام هەندێك لە کوڕان ساڵێك بۆ دوو ساڵ لە پێگەشتن دوادەکەون، درێژی باڵای هەندێکیان تا نزیکەی ١٥ سەنتیمەتر زیاد دەکات. مامۆستا و دایباب دەبێت لە ڕێنمایە بە سودەکان و ئامۆژگاریەمانیان بێخەم نەبن. لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە زۆربەی مێردمندالان هەمان ڕەفتاریان هەیە و گوێ بە ڕێکاری هەڵسوکەوتی دایبابیان نادەن. بەڵام ڕاوبۆچنی هاوڕێکانیان زۆر بە گرنگ دەزانن لەبەر ئەوە دەیانەوێت لەگەڵ هاوڕێکانیان خۆیان بگونجێنن. زۆرجاریش کەسانێك فاکتن و خۆیان لە درۆ و ڕیایی و مەرامی بە دووردەگرن. لە ڕووی هەڵچونەوە بە مێردمنداڵی یەکەم یان هەرزەکاری پێشوەختە ناودەبرێن، چونکە بە سەرەتای گۆڕانکاری ژیان دەژمێردرێت. ژیانیان لە بارێکی سەرگەرمیدا بەسەر دەبەن، چونکە نە لە خۆشیەکانی منداڵی و نە لە سودەکانی گەورە ساڵیدا بەهرەمەندن. هەندێکجار هەڵسوکەوتی چاوەڕوانـنەکراویان تێدا دەردەکەوێت. بەهۆی بڕوا بەخۆنەبوونیان وەك کەسانی بـێڕابردوو دێنە بەرچاو. وا دەزانن وەڵامی هەرچی پرسیارە دەیزانن. مامۆستا و دایباب بە بەربەست دەزانن و بە ڕێگرکدرن لە ئازادیەکانیانی بەردەمیان دادەنێن لەبەر ئەوە دژایەتیکردنیان بە ئەوپەڕی دەسەڵات دەزانن. لە ڕووی عەقڵیشەوە لە بەشێك لە چەمکە ئەبستراکتەکان تێدەگەن، لەمڕوەشەوە دەتوانن زۆر لە بنچینە ئەخلاقی و کارە مەعنەویەکان تێبگەن. بەڵام زۆر ئارەزووپەروەر و خەیاڵپلاون.

قۆناغی ئامادەیی: ئەم قۆناغە هەموو منداڵان بە کوڕ و کچەوە گەشەی تەواوی جەستەیان کردووە، مێردمنداڵ بە زۆری تامەزرۆی دامرکاندنەوەی غەریزەی سێکسی

هەیە. زۆر حەزیان بە جلوبەرگ و ستایلی قژی مۆدێلە، کات زۆر لەبەر ئاوێنە بەسەر دەبەن. مامۆستا دەبێت ئاگاداریان بکاتەوە قوتابخانە شوێنی مۆدێل نییە. لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە بەردەوامی بە دەسەڵاتی خۆیان دەدەن و جیاوازی دابونەریتیان لەگەڵ خێزانەکانیان پەرە دەسەنێت. کەفوکوڵی سێکسی و بیری هاوسەرگیریان ۆ زیاد دەبێت، پێویستە هۆشداریان پێبدرێت زەواج تەنها بۆ دامرکاندنەوەی حەزە سێکسیەکە نییە بەڵکوو بەرپرسیارێتیە و هەڵگرتنی مافی بەرامبەرە. لە ڕووی هەڵچونەوە لەم قۆناغەدا لە هەرەتی ئاشکراکردنی گواستنەوەی بار و رەفتاریاندان لە منداڵییەوە بۆ گەورە ساڵی. لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا بارێکی دیاریکراو بۆ ئەمجۆرە گواستنەوەیە نییە. لە ئەنجامدا منداڵێکی سەر بەکێشەی بێسەروبەر دروستدەبێت.

وەرزی پێنجەم

ئامادەیی، گەشەی سروشتی، هۆش و داهێنان لە قوتابخانە

کەمتر پەروەردەکارێك دەبینرێت کە سەرنجی لەسەر گرنگیپێدانی ئامادەیی بۆ فێربوون نەبێت، بەڵگەکان ئەوەیان خستوەتە ڕوو ئەو فێرخوازانەی ئامادەیی زیاتریان تێدایە بۆ فێربوون، خێراتر و بە شێوەیەکی کاریگەریتر بابەتەکانی وانە فێردەبن. ئەگەر فێرخواز لە پۆلدا ئاگایی هەبێت و هزری لە ناوەند بەرەو ژوورەوە بێت، بە ئاسانی لە پرسەکانی فێربوندا پێشدەکەوێت. ئامادەیش بۆ فێربوون ئارەزوی تاکە بۆ گۆڕینی هەڵسوکەوتی خوود. بە شەو ڕۆژێك دەرناکەوێت بەڵکو کاتی پێویستە. دەروونناسان بۆ ئامادەیی دوو ڕەهەند دەستنیشان دەکەن: گەشەی سروشتی و ئاوەز.

گەشەی سروشتی چەمکێکی گەشەی جینیە، پرۆسەیەکە لە ئەنجامی گەشە و پێگەشتنی جەستەیی، سێکسی، سۆزداری، کۆمەڵایەتی و دەرونیدا دێنێتە کایەوە. هەنێك پێیان وایە فێربوون و ڕاهێنا ن پێش گەشەی سروشتی بێئاکامە، بەڵام ژان پیاژە ئەوەی ڕونکردوەتەوە کە فێربوون لەگەڵ گەشەی سروشتیدا خێراتر و ئاسانتر بەدەست دێت.

کرۆنباخ بۆ ئامادەیی چوار بنچینە دیاریدەکات:

١-هەموو لایەنەکانی گەشە کاریگەری لەیەکتر دەکەن.

٢-گەشەی فیسۆلۆجی مرۆڤ بۆ سودوەرگرتن لە تاقیکردنەوە ئامادەکاری دەکات.

٣-تاقیکردنەوەکان کاریگەری زیاتریان هەیە.

٤-ئامادەیی بنچینەیی بۆ هەر جۆرە فێربوونێك لە قۆناغەكانی پێكهێنانی ژیاندا بەرهەم دێت.

ئاوەز (زیرەكی): زیرەكی ڕەفتارەكانی وەك دركپێكردنی خێرا، زوو فێربوون، هەژماركردنی خێرا و كلیلی كرانەوەی كێشەكان لە مێشكماندا دەگرێتەوە. چۆن دڵنیابین لەوەی كە فێرخوازان بیر و هۆشی تەواویان هەیە؟ سۆرندایك زیرەكی بە سەر سێ توانییدا دابەش كردووە: توانایی پەتی ( بیر و هزر و هێماكان)، توانای میكانیكی (كەڵكوەرگرتن لە ئامێرەكان)، توانای كۆمەڵایەتی.

تاقیكردنەوە زیرەكی: پێشەنگی تاقیكردنەوەكانی زیرەكی ئەمرۆ ئەلفیرد بینەیە، پزیشك و دەروناسی فەڕەنسی لە ساڵی ١٩٨٩دا تاقیكردنەوەی لەسەر ئەو فێرخوازانە كرد كە نەیاندەتوانی لە بەرنامەكانی قوتابخانە ئاسایەكانی فەڕەنسا بەردەوامبن، چونكە لەوكاتەدا فێرخوازی بەهرەدار و بیركۆڵەكان بە پێی هەڵسەنگاندنی مامۆستاكان دیاریدەكرا. یەكێك لە كارە بەنرخەكانی ئەلفێرد بینە، پلانی تەمەنی ژیریە كە توانای زیركی منداڵ بە بەراورد لەگەڵ هاوتەمەنەكانی دەردەخات. ولیام ستیرنی ئەڵمانی پێشنیاری كرد ئەگەر تەمەنی ژیری دابەشی تەمەنی ساڵی منداڵ بكرێت و كەرەت ١٠٠بكرێت ئەوا IQی منداڵەكە دەستدەكەوێت. ویشلەلا لە ساڵی ١٩٣٩ تاقیكردنەوەی زیرەكی بۆ نەخۆخانەی بیلْڤۆ لە شاری نیویۆرك ئەنجامدا، كە بە پێوەری زیرەكی گەورە ساڵان ناوبانگی دەركرد، بۆ گەورە سالان یانزە پرسیار و بۆ مندالان دوانزە پرسیاری دانا، پرسیارەكان تیۆری و كردەیی بوون، ویشلەر لەبری IQ و ڕێژەی سەدی دانا. گەر منداڵێك ٨٧ی هێنا ئەوا واتە لە ١٠٠كەس لە هاوتەمەنەكانی لە ٨٧ زیرەكترە.

داهێنان

یەكێكە لە تایبەتمەندییە دەرونییەكانی هەر فێرخوازێكی بەهرەمەند و بە توانا كە بە یارمەتی ئەوانەوە دەتوانێت بۆ هەر پرسێك وەڵامی جۆراوجۆر و بە كەڵك بداتەوە. ماك كینۆن دەروناسی زانكۆی بیركلی، لە ڕاپۆرتێكدا بەو ئەنجامە دەگات كە داهێنان:

١-ئەندێشە یان وەڵامێكی نوێیە.

٢-وەڵامێكی گونجاوە و شایستەیە، كە چارەسەری پرسێك دەكات.

٣-دەبێتە تێڕوانینێكی ڕاستەقینە و چالاك لە بەرزترین ئاستی خۆیدا.

داهێنان نابێت تایبەت بکرێت بە چەند کەسێکی دیاریکراو، یان وەك ئەرکی ژمارە کەسێك بناسرێت، بەڵکو لە زۆر تاکدا بە شێوەی جۆراوجۆر دەبینرێت.

هۆکارە کاریگەریەکانی داهێنان.

١-بیری داهێنانە: داهێنان بەبێ بیر و ئەندێشە ڕونادات.

٢-نەرمینواندن: کەسێك دەتوانێت داهێنەر بێت ئەگەر لە وەڵامدانەوەی بزوێنەرەکاندا نەرمی بنوینێت.

٣-دروستکردنی پێداویستیەکان: مامۆستایان دەبێت هەل بڕەخسێنن بۆ توانای داهێنانی فێرخوازان.

٤-کەشی کۆمەڵایەتی: لە هەر شوێنێك فێرخواز هەست بە ئازادی بکات و لەبەرامبەر هۆکارەکاندا دەستکراوە بێت، بە ئاسانی خۆی بیروڕاکانی خۆی دەربیرێت.

٥-کەسایەتی تەندروست: یەکێك لە هەلومەرجە پێویستیەکانی مسۆگەرکردنی داهێنان دەروندروستیە.

قۆناغەکانی داهێنان: لێکۆڵەران، سەبارەت بە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤەکان کە خاوەن بەرزترین تواناکانی داهێنانن، بەدواداچونێکی زۆریان ئەنجامداوە، لیهمان لە ساڵی ١٩٥٣دا توێژینەوەیەکی ئەنجامداوە باوەڕی وایە لە نێوان داهێنران خاڵی هاوبەش و جیاوازی هەیە، بە گشتی لوتکەی داهێنان لا بازرگانان و سیاسەتمەداران لە تەمەنی ٤٠ بۆ ٧٥ ساڵیە. تۆرانس دەروونناسێکی ئەمریکی دەڵێت: لوتکەی داهێنان لای منداڵ لە تەمەنی ٤ونیو بۆ ٩ ساڵیە. وە لە تەمەنی ٣ و ٦ و ١١ ساڵیدا بیری داهێنان کەموکورتی زۆری تێدەکەوێت، لەبەر ئەوەی ڕاڕایی و بێمتمانەی بە خۆیان.

پەروەردەکرنی توانای داهێنان: دەبێت ئەوەمان بیر بێت کە خەموو فێرخوازان بە گوێرەی پرس و گەشەپێدانی داهێنانەکانیانەوە کار و کاردانەوەیان پێویست نییە. لەبەر ئەوە هەر مامۆستایەك بۆ ئەوەی بتوانێت توانای داهێنان لە فێرخوازەکاندا پەرەپێبدات دەبێت ئەوە بزانێت بەشێك لە فێرخوازان بە هاندان و بەشێکیتریان پێویستیان بە ڕێسا و یاسا هەیە. پۆڵ تۆرانس یەکێك لە لێکۆڵەرە ناسراوەکان، ئەم ڕێساسانە بە باش دەزانێت بۆ پەروەردەکردنی توانای داهێنان:

١-فێرخوازان هانبدرێن بۆ ئەوەی لە بابەتەکاندا قسەیان هەبێت.

٢-کاتێك فێرخوازێك بیرۆکەی نوێی پێیە ئەگەر لە ئەقڵیشەوە دووربێت هانیبدە.

٣-لە ڕێکخستنی وانەکاندا نەرمونیانبە.

٤-لە کاتی وانەوتنەوە با ژینگەی پۆل هێمن بێت.

٥-لە نێوان فێرخوازە داهێنەرەکان و فێرخوازانیتر پەیوەندی دروستبکە.

٦-پرسی وروژێنەر بخە ڕوو، بیروڕای هەموشیان وەربگرە.

٧-بنچینەی چارەسەری سیستەمی داهێنانیان فێربکە.

٨-فێرخوازان فێربکە مە توانای داهێنانی خۆیان بە کەم نەزانن با بچوکیش بێت.

وەرزی شەشەم

بیرکۆڵی خوێندن

هەر فێرخوازێك ئەنجامی وانەکەی لە ئاستی پلەی ناوەند کەمتر بێ بە بیرکۆڵ ناودەبرێت. بیرکۆڵی لە خوێندندا لەوانەیە لە ئەنجامی کاریگەری ناکامی هزری، جەستەیی، چینگەیەوە سەرهەڵبدات، کە تاکێکی ناتەندروست و نابەهرەمەند دروستدەکات. دەستنیاشنکردنی نەخۆشی کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو کاری پزیشکان و کەسانی پسپۆڕە، بۆ دەستنیشانکردنی بیرکۆڵی پێویستە بە شێوەیەکی ورد بخرێتە بەر لێکۆڵینەوە سەردانی پزیشك یان دەروونناسی پسپۆڕی پێبکرێت. دەروونناسەکان بیرکۆڵیان کردووە بە دوو بەشەوە: بیرکۆڵی تاك، بەهرەمەند نەبوو لە کلتور.

بیرکۆڵی تاك: بۆ ئەو کەسانە بەکاردێت  کە کێشەی ناوخۆییان هەیە لە مێشك، گلاند، کەم ئاوەزی زانیاری، کەموکوڕی هەستی.

کەمهۆش: بە زۆری ئەو منداڵانەی کە پێوانەی زیرەکیان لە ٨٠ کەمترە لە وانەکانیان سەرکەوتن بەدەستناهێنن. بە بیرکۆڵی هزری یان زهنی ناودەبرێن، بریتین لە: گێل و کەم ئەقڵ و بیر ئالۆز،کە لەم باسەدا بە زۆرپابەند و ڕاهێنەر وەرگر و پەروەردە وەرگر ناودەبرێن.

زۆر پابەند، ئەو منداڵانەن نزمترین ئاستی پێوانەی زیرەکیان هەیە، لە ژیاند ناتوانێت کاروبارەکانی خۆی بەڕێوەبەرێت، دەبێت لە ڕێکخراوێکی تەندروستیدا چاودێری بکرێت،

هەرگیز ناتوانێت بچێتە قوتابخانە، بەڵام دەکرێت فێری هەندێك شتی سادەببن، پێوانەی زیرەکی ئەمانە لە نێوان ٢٥ بۆ ٢٩دایە.

ڕاهێنەروەرگر، لە قوتابخانەی ئاساییدا هێندە پێش ناکەون، پێوانەی زیرەکیان لە نێوان ٥٠ بە ٨٠دایە، هەر لەبەر ئەوەیە پێشکەوتنیان لە خوێندندا لە منداڵانی سروشتی کەمترە. لە هەندێك وانەدا لاوازن، بەڵام بە گشتی لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان باشن. بەبێ هاندانی کەسانیتر لە پۆل ئاساییەکاندا توانای ئامادەبوونیان هەیە، تەنها لە کاتی دەربڕین یان تاقیکردنەوەکان بیرکۆڵیەکەیان دەردەکەوێت. لەبەر ئەوە نابێت بابەتەکانی فێرکاریان زۆر ئاڵۆز و دورودرێژ بێت، دوبارەکردنەوە وە فێرکرای چڕوپڕ پێویستە زۆرتر ئەنجامبدەن. بکریك لە ساڵی ١٩٧٢ لە توێژینەوەیەکدا دەریدەخات کە ڕاهێنەروەرگرەکان لەو خێزانانە ئاستی ئابوریان لاوازە ٥٪ن، لەو خێزانانەی باڵا و بەهرەمەندن ١٪ن. ئەگەر دیاریکرا کە فێرخوازێك ڕاهێنەروەرگرە پێویستە مامۆستا هەوڵبدات لەگەڵ خێزانەکەی و قوتابخانە بەرنامەیەکی فێرکاری بۆ فێرخوازەکە ئامادە بکەن.

نەخۆشیەکان: هەندێك منداڵ دەبینرێن خاوەن زیرەکی سروشتین، بەڵام بەهۆی بێتوانایی، کەموکوڕی جەستەیی، نەخۆشی درێژخایەن ناتوانن لە وانەکانیاندا پێشبکەون، بەزۆری دوچاری بیرکۆڵی خوێندن دەبنەوە، چونکە هێزی کۆکردنەوەی هەستەکان و سەرنجان لەسەر وانەکان لەدەستدەدەن.

کەموکوڕیە جەستەییەکان: پتر ئەو نەخۆشیانەن پەیوەندیان بە بینین و بیستن و قسەکردنەوە هەیە. ئەوانە کێشەی بینینیان هەیە هەندێکیان بەهۆی چاویلکە یان نەشتەرگەریەوە چاکدەبنەوە هەندێکیشیان گەر کوێربن ئەوا بەهۆی نوسینیی تایبەتی برێلەوە فێردەبن. کێشەی نابیستان کەمێك ئاڵۆزترە بەلام هەندێکیان بەهۆی بیستۆکی پزیشکیەوە دەتوانن ببیستن بەڵام هەندێکیتریان بەهۆی باری داراییەوە ناتوانن بیستۆك بکڕن. ناکامی لە خوێندنەوەشدا یەکێکیترە لە گرفتەکان هەندێك لە فێرخوازان وشەکان و ماناکان بە باشی دەزانن و تێدەگەن بەڵام خوێندنەوەی هەندێك پیتیان بۆ قورسە وەك ڵ دەکەن بە ڕ، یان ڕ دەکەن بە غ. هەندێکیشیان کێشەی بینیان هەیە لەبەر ئەوە کێشەی خوێندنەوەیان هەیە وەك ئەوەی پیتی ل بە ن دەبینێت. ئەمانە دەبێت کەڵك لە فۆنەتیك ئان ئاوازناسین وەربگرن.

واسواسی: میزاج پەیوەندی لەگەڵ لایەنەکانی سۆزداری و هەستی سروشتی تاکدا هەیە، سستی، بێئیرادەیی، پەستی، گرژی، نائارامی ئەمانە هەموو بارە تایبەتەکانی میزاجن هەندێك لە فێرخوازان میزاجیان زۆر هەستیارە ناتوانن لە پرسەکاندا بیریان چڕبکەنەوە و تێرامانی وردیان هەبێت. ئەمەش کاردەکاتە سەر بیرکۆڵیان.

جیاوازی ژینگەیی: نایەکسانی ژینگەیی کە لە ئەنجامی هەژاری ئابوری و کێشەی خێزانیەوە و شێوازی ناتەبای فێرکرایەوە هۆکارن بۆ  زیادبون و توندبونی بیرکۆڵی. لەبەر ئەو هەندێکجار فێرخواز هیچ جۆرە کێشەیەکی بیرکۆڵی نییە بەڵام بەهۆی هەژاری و برسیەتیەوە ناتوانن بە ڕێکوپێکی کەڵك لە خواردنە بەسوود و پڕ ڤایتامینەکان وەربگرن و دایکیان بەزۆری لە دەرەوەری ماڵ خەریکی کارکردنن و ناتوانن بە باشی ئچاودێری منداڵەکانیان بکەن لە ئەنجامدا توشی بیرکۆڵی دەبن. هەندێکیشیان بە هۆی کێشە و گرفتە خێزانیەکانەوە وەك: جیابونەوە، مەیخواردنەوە، خیانەتی خێزانی بیرکۆڵی منداڵان لە وانەکانیان زیاتر دەکات.

ناهاوسەنگی پڕۆگرامەکانی خوێندن: ئەگەر پڕۆگرامی خوێندن نارێکوپێك و تەمومژاویبن و هیچ پەیوەندیەکیان بە یەکەوە نەبێ ئەوا دەبنە هۆی سەرلێشێواوی و گرفت بۆ فێربوون لە ئەنجامدا بیرکۆڵی لە فێرخوازدا سەرهەڵدەدات.

بێزاری لە مامۆستا: مامۆستا ئەبێت هاندەر و پاڵنەر بێت بۆ دروستکردنی کەشێکی خۆش و دلڕفێن بۆ فێربوون، وانەوتنەوەی خراپ و نارێکی مامۆستا وا لە فێرخوازەکان دەکات کە بابەتەکان بە باشی فێرنەبن و لە ئەنجامدا هەم لە مامۆستاکە و هەم لە وانەکەش وەڕس دەبن، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی بێزاری و بیرکۆڵی لای فێرخوازان.

پێداویستیەکانی فێرخوازی بیرکۆڵ:

١-سەرنجدانی تاك: منداڵانی بیرکۆڵ پێویستیان بە چاودێری ئەوانیتر هەیە.

٢-بەدەستهێنانی متمانە: ئەو بیرکۆڵانەی متمانەیان بە خۆیان نەماوە، پێویستیان بە کەسانیتر هەیە متمانەیان پێبکەن، بۆ ئەوەی متمانە بە خۆیان بۆ بگەڕێتەوە.

٣-دروستکردنی خولیا: ەبەر ئەوەی بیرکۆڵەکان لە ئەنجامی شکست لە تاقیکردنەوەکانی پێشوو توشی بێئۆقرەیی و  بێتاقەتی بوون، پێویستە وانەکان بە شێوەك بێت شیاوی ئەوان بێت.

خاڵە پێویستیەکان بۆ فێرکاری فێرخوازی بیرکۆڵ:

١- پێداویستیە گرنگەکانی منداڵانی بیرکۆڵ، جەستەیی، دەروونی، ئاسایشی، پەیوەستبوون و ڕێزگرتنە.
٢- پایەی زانست و هونەر لەبەرچاوی منداڵی بیرکۆڵدا بەگرنگ دابنرێت، مرۆڤی سەرکەوتوو و کەسایەتی بەناوبانگیان پێبناسرێت.
٣- لە پێشبڕکێ و کێبڕکێی قورس لە نێوان فێرخوازاندا بە دوور بگیرێن.
٤- پرۆگرامی فێرکرای بۆ فێرخوازانی بیرکۆڵ دەبێت لایەنی ڕاهێنانی زیاتر تێدابێت.
٥- بۆ ئەو لاێرخوازانەی زەینکوێرن و لە لەبەرکردن کەمتوانان، پێویستە وانەکان پتر دوبارەبکرێنەوە و زیاتر ڕاهێنانیان پێبکرێت.
٦- هەڵسوکەوتی سۆزداری و کۆمەڵایەتی لەگەڵ بیرکۆڵدا هاوتای تەمەنی هەڵسەنگاندنی بێت.
٧- دابونەریتی کۆمەڵایەتی و زیاتر تێکەڵکردنیان بە خەڵك و زیاتر کۆمەکیان بکرێت.

منداڵانی بەهرەدار

بەشێك لە دەرونناسان پێیان وایە ئەو منداڵانی کە پێوانەی زیرەکیان لە ١٣٠ زیاترە بە بەهرەدار ناودەبرێن، بەشێکیتریان پێیان وایە بەهرەدار ئەو کەسەیە ئاستی زیرەکیەکی لە سەروو ١٤٠ پلەی زیرەکیەوەیە. تایبەتمەندیەکانی فێرخوازی بەهرەدار:

بەبێ دوبارەکردنەوە و ڕاهێنانی زیاد ئەوەی دەیبیستن و دەیخوێننەوە لە یادگەیان دەچەسپێت.

لەو شتانە بە ئاگان هاوتەمەنەکانیان لێی بێئاگان، ئەو کتێبانە دەخوێننەوە کە هاوتەمەنەکانیان کەمتر توانای خوێندنەوەی هەمان کتێبیان هەیە.

بیریان ڕوون و ڕاشکاوە و کارەکانیان بە پێی بەڵگە و ئەقڵ و لۆژیك دامەزراوە.

کارە قورسە فکری و زهنییەکان بە ئاسانی ئەنجامی دەدەن.

زۆربەی کارەکانیان نوێکارییە، کەڵك لە ڕێگا و بیری نائاسایی وەردەگرن.

هەمیشە بە تیژی و گوێ سوکی و خێرایی و پوختی وەڵامدەدەنەوە.

پرۆگرامەکانی فێرکاری بۆ بەهرەداران

ئامانجی سەرەکی لە فێرکراری بەهرەدان، ڕێکخستنی چەند بەرنامەیەکی هەڵسەنگێنراو کە یارمەتی گەشانەوەی تواناکانی داهێنەرانەی ئەوان بدات، چونکە ژمارەی ئەو فێرخوازانە هەمیشە کەمن، شایەنی ئەوەن پرۆگرام و بەرنامیەکی جیایان بۆ دابنرێت. هەندێك لە دەروونناسان سێ پێشنیاریان داناوە:

١-پۆلە تایبەتەکان: تەنها فێرخوازی بەهرەدار و بیرتیژ وەردەگیرێت، لە ژێر چاودێری مامۆستای شارەزا و بە توانا، بەڵام بە مەرجێك پرۆکرانەکەیان قورس نەبێت.

٢-پەڕینەوە: خێرایی پێدانی پرۆگرامەکانی فێرکاری ئاسایی پەروەردە، یان وەرگرتنیان لە قوتابخانە ساڵێك پێش تەمەنی وەرگرتنی منداڵ لە قوتابخانە، تێپەڕاندنی هەندێك لە وانەکان تەنها بە تاقیکردنەوە، بە ساڵێك دوو قۆناغ ببڕن.

٣-باربۆکردنی پرۆگرامەکانی فێرکاری: مەبەست لە زیادکردنی ئەو چالاکییانەیە کە دەبنە هۆکاری گەشە زیاتر بۆ کارامەییەکانی زهنی و داهێنان و لە فێرخوازاندا.

وەرزی حەوتەم

تیۆرەکانی بزوێنەر وەڵام

مرۆڤ لە سەرتای بونیەوە بۆ بەدیهێنانی خواست و ئارەزوەکانی پێویستی بە فێربوون هەیە. ئەو شتانەی دەیەوێت فێری ببێت زۆرن و پێداویستیەکانی جۆراوجۆرن، هیچ تاکێك هەرچەندە ئاوەزێکی باش و توانایەکی بەهێزی هەبێت ناتوانێت بە درێژای تەمەنی نیوەی ئەمانەش فێرببێت. لەبەر ئەوە هەرکەس بۆ کارێك دروستبووە.

پێناسەی فێربوون: دەروونناسان فێربوون بەو گۆڕانکارییانەی تا ڕادەیەك بە هەمیشەی دەزانن کە تاك لە ئەنجامی تاقیکردنەوەی توانا و لێهاتوویە نوێیەکانی بۆ وەڵامدانەوە بە دەستی دەهێنێت. بەشێك لە دەروونناسان پێیان وایە فێربوون ئەو گۆڕانکارییانەن کە فیسۆلۆجی دەمارەکان دروستی دەکەن.

چۆنیەتی تیۆرەکانی فێربوون

بە بیروڕای هەندێك کەسە تیۆرەکان لە وێناکردن زیاتر نیین و لە ڕاستیدا جێبەجێ ناکرێن، بەڵام لە ڕووی زانستیەوە پشتڕاستکراوەتەوە تیۆرەکام بەشێکن لەو ڕاستییە

ئەزمونکراوەی کە کاریگەری هەوڵ و تێکۆشانی گروپێك لە لێکۆڵەوەران و زانایەوە بەدەست هاتوون. مەبەستی سەرەکی لە خستنەڕووی چەند تیۆرێك لەوەیە کاروباری فێربوون و فێرکاری خوێندندا دەسکەوتیان دەبێت. تا ئێستا نزیکەی بیست تیۆری فێربوون دیاریکراون، کە هەر یەکەیان ئامانج و پلانێکی دیاریکراو لە پرۆگرامە فێرکرایەکاندا ڕووندەکاتەوە.

هۆکارە بنەڕەتیەکان لە تیۆرەکانی بزوێنەر وەڵامدا

فێرخواز: بونەوەرێکە خاوەنی ئەندامە هەستەوەرەکان و کۆئەندامی دەمار و ماسولکەیە.

فێربوون: گۆڕانکاریە لە ڕەفتاری بونەوەر، کە لە کاریگەری سروشت و ئەزمونەکانی دەوروبەرەوە بەدەست دێت.

ڕاهێنان: یەکێکە لە گرنگترین هۆکارە کاریگەریەکانی ئەم تیۆرە، بەڕای لایەنگرانی ئەم تیۆریانە فێرکردن بە یەکجار ئەنجامی نابێت.

پشتیوانیکردن: کاتێك دەرەکەوێت کە وەڵامی بزوێنەرێك مایەی ڕەزامەندی و دڵخۆشی بێت، ئەگین مرۆڤ حەزی لە فێربوون نییە.

تیۆری پابەندبوون

ئیدوار لی سۆرندایك یەکەمین دەروناسە کە لەگەڵ تاقیکراوەکانی ئەزمونی خۆی پایەی زانستی دەروناسی پەروەردەیی دانا. لە ساڵی ١٩٨٩دا لێکۆڵینەوەی خۆی لەسەر ئاژەڵ بڵاوکردەوە، بە بیروڕای ئەو فێربوون بێجگە لە لە شیکارکردنی پرسیارێك هیچیتر نییە. بۆ سەلملندنی ئەو مەبەستە، پشیلەیەکی برسی خستە نێو قەفەسێکەوە، لە دەرەوەی قەفەسەکە ماسیەکی بچوکی دانا. سورندایەك لە تاقیکردنەوەکەی خۆیەوە سێ یاسای بنەڕەتی و پێنج یاسای لقی دەستکەوت، یاسا بنەەتیەکانی سۆرندایك ئەمانەن:

١-یاسای ڕاکێشان سەرنج: بە یاسای بنچینەی چێژ و ئازار ناوزەد کراوە. یاسای ڕاکێشانی سەرنج پشتیوانی ئەو ڕاستیەیە کە پەیوەندی پەسەند لە نێوان بزوێنەر و وەڵامدا بەهێز دەکات، بەڵام وەڵامی ناپەسەند ئەو پەیوەندیە لاواز دەکات.

٢-یاسای ڕاهێنان: بە پێی ئەم یاسایە، هەتاوەکوو ئەو بزوێنەرەی وەڵامێکی پەسەندی بەدوادا دێت زیاتر دوبارە بکرێتەوە نێوانی بزوێنەر و وەڵام تۆکمەتر و دامەزراوتر دەبێت.

٣-یاسای ئامادەبوون: ئامادەیی دەرون یان جەستەی تاك بۆ هەر جۆرە چالاكیەك دەگرێتەوە. كاتێك فێرخواز ئامادەبێت كاركردن بەلایەوە چێژبەخشە، بەڵام كاتێك ئامادە نییە كاركردن ئازاربەخشە.

تیۆری مەرجی كلاسیك

بۆ یەكەمین جار لەلایەن ئیڤان پاڤلۆڤەوە خرایەڕوو، ئەم تیۆرە لەگەڵ ڕەفتاری گیانەوەر و ئەو گۆڕانكاریانەی لە ماسولكەكان یان گلاندنەكاندا پەیدا دەبێت، بۆ شارەزابوون لە نمونەكانی تیۆری وەڵامدانەوە پێویستە هەندێك چەك بخەینەڕوو: پارچە گۆشتێك دەدرێتە سەگێكی برسی، كاتێك سەگەكە گۆشتەكە دەبینێت یان دەیخوات، لیك بە دەمیدا دێتە خوارەوە. لەم تاقیكردنەودا گۆشت بزوێنەری سروشتیە، لیكهاتنە خوارەوەش وەڵامدانەوەی سروشتی، هەركاتێك بزوێنەرێكی وەك زەنگ لێدرا وەڵامدانەوەی ئەو بزوێنەرەوە قوتكردنەوەی گوێكانێتی. پاڤلۆڤ سەرەتا زەنگێ لێدا، لە دواید ڕاستەوخۆ گۆشتی نیشانی سەگەكەدا، دوای ئەوە چەندجارێك ئەو كردارەی دوبارەكردەووە، تێبینی كرد كاتێك زەنگ لێدەدا بە ەێ ئەوەی گۆشت نیشانی سەگەكە بدات، سەگەكە لیك بە دەمیدا دێتە خوارەوە.

گشتاندنی بزوێنەر

یەكێكیتر لە دۆزینەوەكانی مەرجی بوونی كلاسیك گشتاندنی بزوێنەربوو. بۆ نمونە كاتێك سەگێكیان لەگەڵ مترونۆم بۆ ١٠٠ لێدان بە مەرجیكرد هەروەك دەزانن وەڵامدانەوەی ئەو لیكهاتنە خوارەوەیە بوو. وەڵامدانەوە لە شوێنێكدا فێركرابێت دەتوانێت لە بارە هاوشێوەكانی دیكەشدا بەكاربهێنرێت. ئەگەر منداڵێك بە ڕاستی و دروستی فێری ناخواردن كرابێت لە ماڵەوە ئەوا لە قوتابخانە و چێشتخانە و سەیران .. هەمان ڕێگا بەكار دەهێنێت.

تایبەتكردنی بزوێنەر

وەڵامدانەوەی تەنها بە یەكێك لە بزوێنەرە هاوشێوەكان. پاڤلۆڤ لە تاقیكردنەوەكەیدا سەگێكی لەگەڵ بزوێنەرەكانی بازنەیی و هێلكەییدا مەرجدار كرد، كاتێك بینی جیاوازی لە نێوان دوو بزێنەرەكەدا بە ڕوونی دیاریكرا، ئاژەڵەكە ئەم دوانەی لەیەك جیا كردەوە.

بەكارهێنانی فێركاریی تیۆری دانەوە

یەکێك لە بەکارهێنانە گرنگەکانی تیۆری مەرجیبوون بە دانەوە فێربونی زمانی بێگانەکانە. بۆ نمونە وشەی قەڵمدار دەرەدەبڕین وێنەی زیهنی ئەو وشەیە لە کوردیدا بەرجەستە دەبێت. کاتێك وشەی قەڵەم و وشەی (Pencil) دوبارە دەکەینەوە وێنەی قەڵەم لە هزردا دەنەخشێت. فێربوون بەلای پاڤلۆڤ و پەیڕەوەکانیەوە بێجگە لە وەرگرتنی وەڵامدانەوەکانی مەرجی هیچیتر نییە. تاقیکردنەوەکانی ڕینەر و واتسۆن پشتگیری کاریگەر و گرنگی تیۆری مەرجی بوونی دانەوەیە.

تیۆری مەرجی بوونی هۆکار

لە مەرجیبوونی کلاسیکدا وەڵامدانەوەکانی ناویستەکین و تەنانەت لەگەڵ هێزی ویستەکی کەمتر دەتوانرێت پێشگیری لە دەرکەوتنی ئەوانە بکرێت. باسکردنی هەندێك تیۆریتر لە تیۆری مەرجی کە وەڵامدانەکان پتر ویستەکین، ئەم جۆرە مەرجی بونەیان بەمەرجیبوونی هۆکار یان مەرجیبوونی ئامراز ناوناوە. زاراوەی هۆکار بۆ ئەم مەبەستە بەکاری دەهێنن، کە فێرخواز دەبێت بە کاری فێربوون ڕابگات و کاریگەری لە دەوروبەری خۆی بکات و کۆمەڵێك ئاڵوگۆڕ بهێنێتە کایەوە. زاراوەی ئامرازی بە واتای ئەوە دێت کە فێرخواز بەسەر ڕەفتار و کرداری خۆی و کاردانەوەکانی ئەواندا زاڵ بێت. هەر ڕەفتارێك کەسێك بە مەبەستی بەدەستهێنانی پاداشت یان دورکەوتنەوە لە سزا ئەنجامیبدات ئەوا بە ڕەفتاری ئامرازی ناودەبرێت. هەر کارێك یان ڕەفتارێك کە ئەنجامدەدرێت ئەگەر لە ئەنجامی لە ئەنجامی کاریگەری بزوێنەرێکی تایبەتەوە سەرنجی تاك ڕابکێشێت، کاری فێرکردن ئەنجامدەدات. وەك ئەوەی منداڵێك هاتوهاوار بکات و بە ڕاکردن بڕوات دایکی بۆ بێدەنگردنی شۆکلاتەی پێبدات، پەیوەندی ئەو وەڵامدانەوەیە لەگەڵ بزوێنەرەکە (شۆکلاتە)دا پێوەند دەبێت و لە داهاتوو ڕودانی ئەو جۆرە کارە زۆر زۆرە. فێربوون کاتێك ڕودەدات کە بزوێنەرێکی تایبەت دوای وەڵامدانەوەیەکی تایبەتدا دەربکەوێت.

گرنگی پاڵپشتیکردن

پاڵپشتیکار بە هۆکارێك دەگوترێت کە ئەگەری ڕودانی وەڵامدانەوەیەك زیاد بکات. پاڵپشتیکردنی بزوێنەر کاریگەرێکە کە بە زاراوەی دەرونناسی فێربوون وەڵامەکانی ئامرازی وەڵامی بە کەڵك دەگونجێنێت.

پاڵپشتیکارە ئەرێنی و نەرێنیەکان

پاڵپشتیکاران بە شێوەیەکی گشتی دوو جۆرن: پاڵپشتیکارە ئەرێنیەکان دووبارەکردنەوەی ڕوودانی وەڵامدانەوە زیاد دەکەن، بونی ئەو جۆرە پاڵپشتیکارانە بە ئارادا دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ڕەفتار یان وەڵامدانەوەی دەبێت. بەڵام پاڵپشتیکارە نەرێنیەکان بە وانە دەگوترێن کە بونیان لە ئارادا هەڕەشەیە یان ئەوەتا بە جۆرێك لە ئاگادارکردنەوە هەژمار دەکرێت. کاریگەری ئەوانە ئەگەری ڕودانی ڕەفتار ناهێلێت  یان کەمی دەکاتەوە.

گۆڕینی ڕەفتار

لە تیۆری مەرجی بوونی هۆکار، یەکێکە لە ڕێگا گرنگەکانی پاڵپشتیکردنی گۆرانکارییە لە هەڵسوکەوتدا کە سەبارەت بە فێرخوازانی یاخی لە قوتابخانە، زیندانیان، نەخۆشخانەی دەروونی، ئەو تاکانەی کە پرسی خێزانی، ڕەفتارە کۆمەڵایەتییە نەگونجاوەکان، بە شێوەیەکی گشتی هەڵسوکەوتی نالەباریان هەیە بەکاردەهێنرێت. ئەو هۆکارانەی کار لە پاڵپشتیکردن دەکەن، هوم و گۆنزالیس پێیان وایە پاداشت کاتێك کاریگەر دەبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١-پاداشت دەبێ بێدواکەوتن بێت، بە کردەوە بێت.

٢-ڕەفتار هەر لە سەرەتاوە هەنگاو بە هەنگاو ڕێکبخرێت.

٣-پاداش هەرچەندە لە سەرەتادا بڕێکی کەم بێت دەبێت ڕێکوپێك بکرێت.

٤-فێرخواز کارێکی سەرنجراکێش ئەنجامبدات، ئەوکات پاداشت بکرێت.

٥-پەیوەندی نێوان کار و پاداشت هاوسەنگ و دادپەروەرانە بێت.

٦-پاداشتەکە ڕوون و ئاشکرا بێت.

وەرزی هەشتەم

تیۆریە مەعریفیەکان: تیۆریە مەعریفیەکان گرنگی بە دەرکپێکردن و زانیاری، توانای تێڕوانین و دەستنیشانکردنی تاك دەدەن.

تیۆری فێربوونی گشتاڵت

لەو کاتەی کە قوتابخانەی ڕەفتارکاری لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە گەشەسەندندا بوو، بزوتنەوەیەکی دەرونزانی لە ئەڵمانیا سەر هەڵدا و هێرشێکی توندوتیژی کردە سەر

گشت قوتابخانەکانی دەرونزانی چونکە هەستاون بە شیکردنەوەی ڕەفتار بۆ چەند بەش و پارچەیەك وەك یەکەیەك مامەڵەیان لە گەڵدا نەکردووە.

بۆ یەکەمجار لە لایەن مارك وەریتهایمەر و هاوکارەکانی کۆهلەر و کافکاوە پێشنیار کرا. دەروناسانی گشتاڵت بۆچنی جیاوازیان هەیە لەسەر تەواوی مرۆڤایەتی و گرنگی بە درکپێکردن و مەعریفە و چارەسەری پرس دەدەن، لەو باوەڕەدان کە لێکوڵینەوەی هەڵسوکەوت کاتێك سەرکەوتوو دەبێت، کە کاردانەوەی لەسەر هەموو بونەوەر هەبێت و سەرنجی هەموو ڕەفتارەکان بدات. فێربوون کاتێك ڕودەدات کە تاك بتوانێت هەلومەرج و بۆنەکانی ڕابردوو سەر لەنوێ ڕێکبخاتەوە و درك بە پەیوەندیەکان بکات. لەسەر بنچینەی تیۆری گشتاڵت، بۆ ئەوەی فێربوون بە شێوەیەکی کاریگەر ئەنجامبدرێت، دەبێت سەرنجی بابەتەکانی بۆچونەکان، ئامانج (بۆچوون یان مەبەستێکە تاك بۆ بەدەستهێنانی تێدەکۆشێت و چالاکی ئەنجام دەدات)، پێکهاتە (بە ڕێکخستنی ناوەوەی مرۆڤ یان لۆژیکی تاك دەگوترێت) بدرێت. دەروناسانی گشتاڵت هەر جۆرە گۆڕانکاریەك کە لە پێکهاتەی مەعریفی تاك لە ماوەی ژیانیدا ڕوودەدات بە ناونیشانی گەشە و پێشکەوتن لە بیروبۆچوندا ناو دەبەن. لایەنگرانی تیۆری گشتاڵت، سەرنجی مامۆستایان لە کاری وانەوتنەوە بۆ ئەم بابەتانەی خوارەوە ڕادەکێشن:

١-هەمیشە ئامانجێك بۆ فێرخوازەکەت دیاری بکە.

٢-پێکهاتە لەگەڵ زانیاریەکان، ڕاستیەکان، بەڵگە و ئاماژەکان هاوپێچ بکە، بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئەمانە لە بیر و هۆشدا ڕێکبخە.

٣-دەبێت ئەوە بزانیت، کە پێکهاتەی مەعریفی فێرخواز پەیوەندی بە ئەزمونەکانی پێشوتریەوە هەیە.

٤-زانیاریەکان لە پێکهاتەیەکی گشتیدا بخرێنە بەردەست و سەرنجی فێرخواز بۆ بابەتەکان ڕابکێشێت.

بۆچون لە فێربووندا گرنگییەکی زۆری هەیە و دەتوانێت بە شێوەی بۆچوونە بەشیەکان دەربکەوێت پاشان بگۆڕێت بۆ تێڕوانینی گشتی، چونکە کاتێك فێرخواز بەتەواوی دەکەوێتە ڕەوتی هەموو بابەتەکەوە و سەرەکانی بابەتەکە جێگیر دەبێت. لایەنگرانی تیۆرە مەعریفییەکان، زانیارییە ڕاستیەکان بە کلیلی بنەڕەتی چەمکەکان و بنچینەی فێربوون دەزانن، چونکە ئامانج لە دابینکردنی چەمك و بنچینەیەکی شیاو، ڕوون و ڕێکە

بۆ ئەوەی فێرخواز بتوانێت بەبێ هیچ تەمومژێك توانای تێڕوانینی پەیوەست بەدەست بهێنێت.

تیۆری مەیدانی لۆین

یەکێکی دیکە لەڕوانگە گرنگەکانی تیرەکانی مەعریفی تیۆری مەیدانی یان شوێنناسی. لیوین بە پێچەوانەی تیۆردانەرانی بزوێنەر وەڵام لەو باوەڕەدایە کە ڕەفتار لە ئەنجامی کردەوەی تاك لە ژینگەی دەوروبەرەوە بەدەست دێت و ئەویش بەم شێوەیە دەنوێنێت: لەم ڕێسایەدا ڕەفتار = پەیوەندی (باری دەرونی تاك و ژینگەی دەرونی) دەنوێنێت. تیۆری مەعریفی دوو لایەنی مەعریفی هەیە: یەکێکیان ئەوەیە کە تاك چۆن بەم جۆرە هەڵسوکەوت دەکات کە خۆی بنچینەی تیۆری کەسایەتی لیوین پێکدەهێنێت.

ژینگە یان ژینگەی دەروونی هەرکەسێك، لەوانەیە هۆکارە جوگرافی و مادییەکانی ئەو کەسە لەبەرچاو بگیرێت یان نەگیرێت. تیۆری فێربوونی لیوین لەسەر ئەوە وەستاوە، کە ژینگەی ژیانی کەسی یەکلاکەرەوە جۆری ڕەفتارە لە کاتی ڕودانیدا.

تیۆری گەشەی مەعریفی پیاژە

ژان پیاژە یەکێك لە دیارترین دەروونناسەکانی سەردەمە، کە لە گەشەی ئەقڵی و فکری منداڵاندا پلە بە پلە و لە کاتێکی دیاریکراودا لە بیری گەورە ساڵان نزیکدەبێتەوە و وەکیەك یەکی لێدێت. بۆ شارەزابوون لە تیۆری گەشەی مەعریفی ژان پیاژە سەرەتا دەبێت هەندێك چەمك بناسین:

گونجان: مەبەست لەگونجان، ئارەزویەکی زیندەوەرانە بۆ ڕاهاتن لەگەڵ دەوروبەری خۆیان، بەڵام پرەنسیپی گونجان هەمیشە پەسەندە.

وێکچواندن: وێکچواندن کاتێ ڕودەدات کە ئەو زانیاریانە لە تاقیکردنەوەکانی پێشتر بەدەستکەوتوون توانرا بە سەرکەوتووی لە هەلومەرجی نوێدا بەکار بهێنرێتەوە.

هاوئاهەنگی: کردەی هاوئاهانگی یان دەرەوەسازی، کاتێك دەردەکەوێت، کە تاك کرداری خۆی بە پێی ئەو هەلومەرجەی پێیدراوە جێبەجێدەکات. بە کورتی لە هاوئاهەنگیدا تاك بۆ ئەنجامدانی خواست و پێداویستیەکانی دەوروبەر، پێکهاتەی فیکری یان نمونەی ڕەفتاری خۆی دەگۆڕێت.

پاراستن: مەبەست ئەوەیە، کە ئەگەر مادەیەك یان شتێکی دیاریکراو بە ڕووکەش گۆڕان بەسەر شێوەیەکدا بێت، بەڵام لە بارستە و کێش و قەبارە و ژمارەدا گۆڕانی بەسەردا ڕوونادات.

بەکارهێنانی فێرکاری تیۆری پیاژە

لە مەیدانی فێرکاری و پەروەردە و فێربوندا دەبێت وا لە فێرخوازان بکرێت ئازادبن و داهێنان لە کارەکانیاندا بکەن، لەوجۆرە کەرەستە و هۆکارانە بخرێتە بەردەستی فێرخوازان کە یارمەتی چالاکییە تاکیەکانیان بدات. بە بیروڕای پیاژە، شێوەی بیرکردنەوە یان تێگەیشتنی منداڵ لە چەمکەکان لەگەڵ گەورەساڵاندا بە تەواوەتی جیاوازی هەیە، پێداگیری لەسەر ئەوە دەکات کە منداڵ پێویستی بە گەشەی دەرونیەوە. ڕاسپاردەی پیاژە بۆ مامۆستایان ئەوەیە، کە لە کاری وانەوتنەوەدا قۆناغەکانی گەشەی منداڵان و مێردمنداڵان لەبەر چاوبگرن.

گەشەی مەعریفی برۆنەر

جیرۆم برۆنەر، یەکێکە لە دەروونناسە دیارەکانی ئەمریکا و لایەنگری پیاژەیەیە. ئەو ڕێگای جێبەجێکردنی فێرکراری و پەروەردەکرن، یان بە شێوەیەکی گشتی فێربوون بۆ دوو جۆر وێنا دەکات: یەکێکیان ڕێگەپێدراو ئەویتریان پێوانەیە. بە بڕوای برۆنەر لە جیاتی تیۆری فێربوون دەبێت تیۆری فێرکرای بەکار بهێنرێت، چونکە تیۆری فێرکاری بنچینە و چوارچێوەی کرداری فێربوون دادەڕێژێت و بەجێیدەهێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا تیۆری فێربوون تەنها باسی ڕاڤەکردنی پرسەکانی فێربوون دەکات. بەشێوەیەکی گشتی فێربوون سێ شێوە نواندنی بۆ دەکرێت:

نواندنی کارپێکەر: یەکێك لە سەرەتایترین و بینراوترین ڕێگاکانی دەربڕینی مەبەستە، بەو مانایەی بەرجەستەکردنی چەمێك، یەك پەیڤین یان بیر و ئەندێشەیەکە، برۆنەر فێربون لەسەر بنچینەی بزوێنەر وەڵام لە ڕیزی نواندنی کارپێکەر دادەنێت.

نواندنی پەیکەرەیی: بە گشتی پەیکەرەکان، گارفیکەکان و وێنا زیهنیەکان کە شتێك، پرەنسیبەکان و ڕێسا یان بیرێك بە ڕێگایەکی ڕوونتر و تەواوتر بەرجەستە دەکەن.

نواندنی هێما: لە نواندنی هێما زمان دەربڕی یەك شت، یەك ڕوداوو، یان یەك بیر و هۆشە کە لە دوو بابەتەکەیتر ئاڵۆزتر و پەتیترە، لە ڕاستیدا بەکارهێنانی ئەو ڕێگایانە پەیڕەوی لە کرداری گەشەی سروشتی دەکات. بە بڕوای برۆنەر بۆ ئەوەی فێرکاری و

پەرورەدە بە شێوەیەکی کاریگەر بەڕێوە بچێت، دەبێت کەڵك لە تیۆرەکانی فێرکاری وەربگیرێت. برۆنەر بۆ یەك تیۆری فێرکاری و پەروەردە بە شێوەیەکی کاریگەر بەڕێوە دەچێت، دەبێت کەڵك لە تیۆرەکانی فێرکاری وەربگیرێت.

١- زەمینەی پێویست:
٢- پێکهاتەی زانیاریەکان:
٣- ڕیزکردنی لۆژیکی:
٤- بڕی خەڵات:

تیۆری واتاداری ئازۆبێل

ئازۆبێل یەکێکە لە دەروونناسانی ناوداری ئەم سەدەیە بە یەکێك لە شارەزایانی تیۆری فێرکرای هەژمار دەکرێت. بنچینەی سیستەمی فێرکاری ئەو لەسەر دووشت وەستاوە: یەکێکیان ئەوەی کە پێشتر تاك فێریان بووە، ئەویتریان ڕێکخستنی ئەو فێربونانەیە.

بە ڕای ئازۆبیل یەکێك لە کاریگرترین ڕێگاکانی فێرکرای ئەوەیە، ئەرکی مامۆستا پێش دەستپێکردنی هەر وانەیەك، پێویستە کورتەیەك لە بابەتی وانەکە بۆ ئەو فێرخواانەی وانەیان پێدەڵێتەوە ئاشکرا بکات، ئەو پوختەی ناوەڕۆکی گشتی بە پێشتر ڕێکخراو ناودەبرد، جاری وا هەیە تیۆری پێکەوە لکان یان شمولیشی پێدەوترێت. لەم شێوە فێرکاریەدا بە یارمەتی پێشتر ڕێکخراو، بابەتی نوێ لە ڕێگای هەمەلایەنەوە و ڕێکخستنەوە دەچێتە ناو پێکهاتەی دەروونی تاکەوە.

فێربونی واتادار

بە کۆمەڵێك چەمك ز بیری ئاشکرا و لۆژیکی دەگوترێت کە هەوڵدەدات ئەو چەمکانە بەوانەی کە پێشتر ناسراون ببەستێتەوە، بۆ ئەوەی  فێربوون واتادار ڕوبدات، پێویستە ئەم مەرجانە بە هەند وەربگیرێت.

١-تاك هەوڵبدات ناوەڕۆکە نوێکە لەگەل چەمکەکانی پێشوتر بە ڕێگایەکی ڕوون و ئاشکرا ببەستێتەوە.

٢-خودی ناوەڕۆکەکە دەبێت لە چۆنیەتی لۆژیکی واتادار کەڵك وەربگرێت.

٣-تاکەکە دەبێت ئاگاداری پێکەوەبەستنی بیرەکان، چەمکەکان و پرەنسیبەکان بێت.

فێربوونی هەڵبژاردنی گانیە

گانیە لە کتێبی هەلومەرجی فێربوونی خۆیدا کە لە ساڵی ١٩٦٥ بڵاوکردەوە، هەشت بابەتی سەبارەت بە جۆرە جیاوازەکانی فێرکاری پێشنیاز کرد بەڵام ساڵی ١٩٧٧ کەمیکردەوە بۆ حەوت ڕێگا. پێی وایە ئەگەر فێربوونی دیاریکراو ڕوودەدات دەبێت هەلومەرجی دیاریکراو هەبێت. دامەزراندنی ڕەفتارگەرایی هەڵبژاردەی دامەزراند. ڕێگاکەی گانیە پەیوەندی لەگەڵ گۆڕانکاری ڕەفتار و فێرکرای و پەروەردە لەسەر بنچینەی فەرمانبەری و شایستەییەوە هەیە.

تیۆری فێربوونی کۆمەڵایەتی باندۆرا

ئەلبێرت باندۆرا و هاوکارەکانی لە ساڵەکان ١٩٣ بۆ ١٩٦٥دا تیۆرەکەی خۆیان بنیاتنا، لەسەر بنچینەی لاسایکردنەوە و نمونەکاری پلانڕێژیان بۆکرد و ڕێکیانخست. بە بیروڕای ئەوان ڕاهێنان بۆ فێربوون پێویست نییە، فێرخوازان لە ڕێگای لاسایکردنەوە و بینینەوە فێردەبێت. فێربوون لە ڕێگای بینینەوە کاریگەری دنەدەر و تەمبێکردن و ڕەخنە و گرنگی سەرمەشق دیاریدەکات. باندۆرا کاریگەریەکانی نمونەکاری بۆ سێ جۆر دیاریکرد:

١- فێربوون لە ڕێگای بینینەوە.
٢- کاریگەری پاداشت و سزا.
٣- کاریگەری و گرنگی سەرمەشق.

بەشی چوارەم

هۆکارە کاریگەرەکانی سەر پەروەردە و پەرەپێدانی خوێندن.

دەروونناسان، پاڵنەر لە ڕوانگەی قوتابخانە و تیۆرە جۆراوجۆرەکانەوە، کەم و زۆر پێناسەی جیاواز یان بۆ کردووە. زۆربەیان بە هۆکارێکی دەزانن بۆ ئەوەی ڕەفتارێك لەسەر بنەمای وەدیهێنانی ئامانجێك دێنێتە ئاراوە و بەردەوامی پێدەدات.

ڕەفتار، کە بنچینەی لێکۆڵینەوەیە لە هەموو لقێکی دەروونناسیدا، بە تایبەتمەندیە خۆماکیەکانی گیانلەبەر و دەوروبەرو کاریگەری ئەم دووانە لە یەکتری.





ئەو هۆکارانەی پاڵنەر پێکدەهێنن بە شێوەیەکی گشتی بۆ دوو دەستەی ناوەکی و دەرەکی یان گۆڕاوە کەسییەکان و گۆڕاوە ژینگەییەکان، کە بەشێکیان لە باری جێگیردان و بەشێکیتریان لە باری ناجێگیر. هۆکارە گۆڕاوە کەسییەکان، ئەو کۆمەڵە چالاکیانەن کە بنگە یان ژێدەری ناوەکیان هەیە.ئەوەی لە مامۆستایەکی شارەزا چاوەڕوان دەکرێت ئەوەیە، کە هەوڵبدات پێشگیری لە ناکامییە وانەییەکانی فێرخوازان بکات، کار بۆ ئەوە بکات سەرنجیان لای وانەکە بێت.

پاڵنەری فێرخواز بۆ وانەخوێندن، لە ڕوانگەی پەروەردەییەوە گرنگیەکی زۆری هەیە، چونکە لە هەمانکاتدا ئامانجە. کاتێك پاڵنەر دەبێتە ئامانج، خودی خۆی بە یەکێك لە هەلومەرجە پێویستیەکان بۆ فێرکاری و پەروەردە هەژمار بکرێت.

پاڵنەر، کاتێك دەکرێت بە هۆکار دابنرێت کە وەکوو زیرەکی، یان هەر هۆکارێکی پەروەردەیتر، لە بەدەستهێنانی ئەو کارامەیی و زانستانەدا وەك ئەوەی دەمانەوێت یارمەتی فێرخواز بدات.

زیرەکی بێگومان یەکێکە لە هۆکارەکانی پێشکەوتنی خوێندنی فێرخواز، بوز مانایەی هەتا فوورخواز بە ئاوەزتر بێت بە هەمان ئەندازە پێشکەوتر دەبێت، بەڵام دەبێت ئەوە بزانرێت کە لەم بوارەدا تەنها زیرەکی تاکە پێوەرە و دڵنیاکەرەوە نییە، دەروونناسان لە لێکۆڵینەوەکانیاندا بۆیان دەرکەوتووە، کە ڕۆڵی پاڵنەر لە پرسی فێربوون و پێشکەوتنەکانی خوێندندا لە پلەی زیرەکی فێرخوازان زۆر کاریگەرترە.

ئەو جیاوازییە سەبارەت بە پەیوەستبوونی زیرەکی و پاڵنەر لەگەڵ پێشکەوتنەکانی خوێندندا چەمکی جدی وەك خوێندنی لاواز و خوێندنی بەهێز دێتە کایەوە.

کاریگەری پاڵنەر لە فێرکرای و پەروەردەدا

ئەو مامۆستایانەی ئەرکی فێرکاری پەروەردەیان لە ئەستۆدایە، بۆ ئەوەی ئارەزووی فێربون لای فێرخوازان دروستبکەن دەبێت بزانن کە چۆن دەتوانن لە جێبەجێکردنی ئەو مەبەستەدا کەڵك لە هۆکاری پاڵنەر وەردەگرن. بۆ دروستکردنی پاڵنەر هۆکاری جۆراوجۆر هەیە:

١- پاڵنەری زارەکی: جاری وا هەیە ستایشی مامۆستا، وەك باشتکرد، ئافەرین، زۆرباش.
٢- بەکارهێنانی تاقیکردنەوە: بەشێك لە مامۆستایان یەك لە دوای یەك وانە دەڵێنەوە وانە دەڵێنەوە، سەبارەت بە وانەی ڕابردوو هیچ جۆرە پرسیارێك لە فێرخوازان ناکەن. دەروونناسان لەو باوەڕەدان کە بەم ڕێگایە پاڵنەری پێویست لە فێرخوازاندا پەیدا ناکات. لەبەر ئەوە پێویستە مامۆستا هەر دوو هەفتە جارێك تاقیکردنەوەی فێرخوازان بکات.
٣- پاڵنەری بەدواداچون: یەکێکیترە لە ڕێگا باشەکان بۆ دروستکردنی پاڵنەر، ئەگەر مامۆستا بتوانێت لە میانی وانەکەیدا پرسی پەیوەندیدار بخاتە ڕوو، کە پێویستی بە زانیت و بەدواداچوون هەبێت، ئەوکاتە فێرخوازان بۆ دەستخستنی وەڵام بەدواداچوون دەکەن.
٤- پاڵنەر یاری: کاتێك وانەیەك خۆشی و یاری لەگەڵدا بێت، فێرخوازان زیاتر حەزی لێدەکەن، خولیایان بۆ ئەو یاریە زیاتر دەبێت.
٥- تامەزرۆی مامۆستا بۆ وانەکەی: کاتێك فێرخواز مامۆستاکەی دەبینێت چەند تامەزرۆیە، ئەوکات فێرخوازەکەش زۆر تامەزرۆ دەبێت.
٦- پۆلی ڕەنگاوڕەنگ: پۆلی کراوە و گەورە و ڕەنگاو ڕەنگ، وا لە فێرخوازان دەکات زیاتر تامەزرۆی فێربوون بن.
٧- کاریگەری پێشبڕکێ: ئەنجامدانی پێشبڕکێ یەکێکە لە پاڵنەرە زۆر کاریگەرەکان لەسەر فێرخوازان. بەڵام نابێت پێشبڕکێی نا هاوتا ئەنجامبدرێت، دەبێت ئاستی فێرخوازان لە یەکەوە نزیکبن.
٨- پێدانی خەڵات: لیۆنەر دیرڤڵ لەو باوەڕەدایە ئەگەر خەڵات بە فێرخوازە سەرکەوتووەکان بدرێت ئەوا فێرخوازانیتریش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دڵیان بە کارەکەیانەوە دەبێ.
٩- خۆلادان لە جیاکاری: یەکێك لە گەورەترین دوژمنەکانی پاڵنەر بوونی جیاکاریە لە نێوان فێرخوازەکاندا.
١٠- نیگەرانیبوون: هەندێکجار ئەگەر فێرخواز لە نمرەی خراپ یان کەوتن لە تاقیکردنەوە نەترسێت وانەکە ناخوێنێت و فێرنابێت.
١١- گۆڕانکاری بەرەوە پێشکەوون: ئەگەر فێرخواز بزانێت فێربوون و سەرکەوتن لە خوێندن هۆکارێکە بۆ پێشکەوتن و گەشتن بە ئامانجەکانی ئەوا ئەمە دەبێە پاڵنەرێکی باش بۆ ئەوەی بەبەاشی هەوڵبدات.

١٢- پەیوەستکردنی بابەتەکانی وانەکە بە ژیانی واقعیەوە: هۆکارێکە بۆ ئەوەی فێرخوازەکە زیاتر گرنگی دەدات بە وانەکانەوە چوون باوەڕی وایە فێربوون کاریگەری دەبێت لە چارەسەرکردنی کێشەکانی.

وەرزی دەیەم

ڕێگاکانی فێرکاری

بۆ ئەوەی پەروەردەکار بتوانێت ئەرکی پەروەردەیی خۆی بە باشی ئەنجامبدات، پێویستە گرنگی بە ڕێگاکانی وانەوتنەوە بدات. دەبووێت ئەوە بزانێت هەر بابەتێك، یان بەشێك، یان تەمەن یان ڕەگەزێك یان ئاستی زیرەکی ڕێگای تایبەت بە خۆی هەیە بۆ فێرکاری، ڕێگاکانی فێرکاریش ئەمانەن: وتاردان، زارەکی، فێرکاری تاك، جێبەجێکردن و کارامەکردن، ڕێگای کراوە و مرۆیی. دەبێت بزانرێت هەریەك لەم ڕێگایانە بۆ ئامانجەکان، دەبێت تەمەن، زیرەکی، بواری فێربوون لە بەرچاو بگیرێن.

ڕێگاکانی فێربوون ئەمانەن:

**وتاردان:** یەکێکە لە بەردەسترین ڕێگاکانی فێرکاری. لەم ڕێگایەدا بابەتەکانی وانەکە بە چەندین نمونە ڕووندەکرێتەوە.

ڕێگاکانی وتاردان لایەنی ئەرێنی و نەرێنیان هەیە، ئەگەر مامۆستا خاوەن وتارێکی ڕوون و ئاشکرا ڕەوان بێت و بە گەرموگوڕی مەبەستەکانی خۆی پێشکەشبکات، دەتوانێت سەرنجی فێرخوازان بۆ وانەکەی ڕابکێشێت و فێرکردن بهەژێنێت. بە شێوەیەکی گشتی فێرخوازان تاقەتی خوێندنەوەیان نییە، لەبەر ئەوە باسکردن و ڕونکردنەوەی مامۆستایان پێباشتر و کاریگەرترە وەك لەوەی خۆیان بابەتەکان بخوێننەوە. بەڵام بەشێکیتر لە لیکۆڵەوران لەو باوەڕەدان ڕێگای وتاردان لە کاتێکدا بووە زۆربەی خوڵك یان خوێندەواریان نەبووە یان دەستیان بە کتێب ڕانەگەشتووە.

**مەرجەکانی وتاردان:**



**گفتوگۆ**: ڕێگای گفتوگۆ بە پێچەوانەی ڕێگای وتاردان مامۆستا ڕۆڵی بەڕێوبردنی پۆلی لە ئەستۆدایە، کۆمەڵێك فێرخواز کۆدەکرێنەوە سەبارەت بە بابەتێك گفتگۆ دەکەن. ڕێگای گفتوگۆ وا لە فێرخوازان دەکات بیربکەنەوە، لێکۆڵینەوە بکەن، بەڵگە بهێننەوە و هاوکاری یەکتر بکەن. ڕێگای گفتوگۆ نابێت لەگەڵ چاوپێکەوتنی ڕوبەڕودا تێکەڵ بکرێت.

ڕێگای گفتۆگردن بە زۆری کاتێك کاریگەری  زیاتر دەبێت کە فێرخوازان لە بابەتێکی تایبەتدا بواری پێویستیان بۆ برەخسێت بۆ  خوێندنەوەی سەرچاوە جیاوازەکان و ڕونکردنەوەی دیدە جیاوازەکانیان بە شێوەی نزیکبونەوەی دواییەك یان ناوبەناو بکەونە مشتومڕەوە. ئامانجەکانی بەم شێوەیەن:

سەرنجدانی فێرخواز  دروستکردنی گروپ  پەروەردەکردنی هێزی فیکری

پەروەردەکردنی هێزی داهێنان  ئەفراندنی ڕەفتاری باش

مامۆستا دەتوانێت لە هەموو بارێکدا بەشداری گفتوگۆ بکات و ڕۆڵی سەرەکی هەبێت، دەبێت لە دانیشتنی گفتوگۆکان ئامادەبێت، بەڵام ئەگەر بێدەنگ بێت و تەنها ڕۆڵی تەماشاکار بێت ئەوا پێدەچێت دۆخەکە لە ڕێڕەوی خۆی لابدات.

**فێرکاری بە تاك**: هەندێك تاقیکردنەوە سەلماندویەتی هەندێك لە فێرخوازان لە ناو پۆلەکان و لە کاری گروپەکان سەرکەوتوو نابن، بەڵام ئەگەر بە تەنها و لە ژێر چاودێری مامۆستا یان بەرنامەیەکی تایبەتدا بخرێتە کار لە وانەکانیدا پێشبکەوێت.

کیلەر لە ساڵی ١٩٦٨دا ڕێگایەکی نوێی دانا بۆ فێرکاری تاك پێشکەش بکات.  کە هەر وانەیەك بۆ ١٥ بۆ ٣٠ خولەك بەشبکات، ئەرکی فێرخوازان ئەوەیە کە هەر یەکەیەك لەو بەشانە بخوێنێت و دوای ئەوە فێر دەکرێن تاقیکردنەوەیان بۆ ئەنجامبدرێت. ئەگەر سەرکەوتووبن بچنە بەشێکیترەوە.

تایبەتمەندی ئەم پلانەش بەمجۆرەیە:



**فێرکاری بە بەرنامە:** سکینەر لە ساڵی ١٩٥٤دا ڕاپۆرتی مێژووی خۆی بە ناوی زانستی فێربوون و هونەری وانەوتنەوە، بە ناوی فێرکاری بە بەرنامە پێشنیاز کرد. لە فێرکاری بە بەرنامەدا پرۆگرامی وانە دەبێت بە جۆرێك ڕێکبخرێت، کە لە جێبەجێکردنیدا سێ ئامانجی هەبێ:

١-هەلومەرجێك دروستبکات کە فێرخواز بە تاك یان گروپی بچوك لە کات و خێراییەکی وادا کە فێرخوازان پێیان باشە ئەنجامبدرێت.

٢-هەلی ئەوتۆ بڕەخسێنێت بۆ ئەوەی فێرخوازان بتوانن بە شێوەیەکی چالاکانە وەڵامی بابەتەکانی وانەکە بدەنەوە.

٣-لە بابەتەکانی ڕاستی و وردبینیدا، وەڵامی فیدباکی پەیوەندیداریان بە شێوەیەکی شایستە بۆ دروستبکرێت، فیدباکەکە بێدواکەوتن دەبێت دوائ ئەنجامدانی وەڵامدانەوەکە بکرێت.

فێرکرای بە بەرنامە دەتوانێت بە شێوە جیاوەزەکان ئەنجامبدرێت، بە شێوەی کتێب، مەلزەمە، گورزەیەك پەڕە، ئامێرێکی سادە ڕێکبخرێت بۆ ئەوەی فێرخوازان بتوانن چەند جارێك بیانەوێت بیخوێنن و وەڵامەکەی خۆیان بە ڕێگایەکی تایبەت بە دەستبخەن. فێرکاری بە بەرنامە جێگای مامۆستا ناگرێتەوە، بەڵکو ئامرازێکە هەروەك ئامرازەکانی دیکەی فێرکاری یارمەتی مامۆستا دەدات لە پەرەپێدانی وانەی فێرخوازاندا هاوکاری دەکات.

**فێرکاری بە کۆمپیوتەر:** ئەمڕۆ بە یەکێك لە ڕێگا دیارەکانی فراوانکردن و پێشکەوتنی فێرکاری بە بەرنامە هەژمار دەکرێت، سودەکانی بەم شێەیە دەبێت:

١-زانیاریەکانی پەیوەست بە وەڵامەکانی فێرخوازانەوە دەتوانرێت دەتوانرێت بە خێرای ببینرێت و وەڵامبدرێتەوە و پێداچونەوەیان بۆ بکرێت.

٢-دەتوانرێت زانیاریەکان لە ڕووی ئاماریەوە لە بەرچاو بگیرێت.

٣-تەنها ئامێرر کۆمپیوتەر دەتوانێت هەزاران زانیاری لە دەیان هەزار میلەوە ڕاپەڕێنێت و کەڵکیان لێوەربگرێت.

٤-کۆمپیوتەر توانای ئەوەی هەیە بە شێوەی دەنگ و ڕەنگ زانیاریەکان پێشکەش بکات.

دو دەروونناسی ئەمریکی لە ساڵی ١٩٧٢دا ٤٤ کوڕ و ٤٤ کچیان لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی خستە ژێر تاقیکردنەوە، بەشێك لەو منداڵانە بۆ ماوەی پێنج مانگ،هەر ڕۆژێك هەشت بۆ دە خولەك بەهۆی کۆمپیتەرەوە فێردەکران، ئەوانیتر وەك گروپی شاهید ئەنجامیاندا. لە کۆتایی ساڵدا ئەوانەی بە بەرنامەی کۆمپیوتەر فێرکران ٥،٥ مانگ لە خوێندنەوەی زمان لە گروپەکەیتر لە پێشتربوون.

**ڕێگای کراوە و مرۆیی:** ڕێگای کراوە ئەنجامی وتارێکی لێکۆڵینەوەیە بە ناوی سامرهێل کە لێکۆڵەری بەناوبانگ نیل لە ساڵی ١٩٦٠دا بڵاوکردەوە. ئامانجی سەرەکی لە فێرکاری کراوەی مرۆیی ئەوەیە کە فێرخواز سەربەستە و خۆی ئەوە دیاریبکات کە ئەو شتانە چین کە دەبێت بیانخوێنێت و چۆن دەیەوێت فێریان ببێت. مامۆستا ڕۆڵێکی واهای نابێت و دانانی پلان و سەرپەرشتیکردن و تاقیکردنەوە بایەخێکی وەهای نابێت. پەروەردەکارانی وەك کارل ڕۆجەر، ماسلۆ هەندێك لە پەروەردەکارانی هاوڕای ئەمان لەو باوەڕەدابوون کە ئامانجی فێرکاری و پەروەردە دەبێت خۆ پێگەیاندن بێت کە ئەوەش پێویستی بە لێهاتووی نییە، بەڵکو بۆ گەشە و بەرەروەپێشچوون پێویستی بە ژینگەی لەبار و پێشوازلێکردن هەیە.

پرەنسیبەکانی فێرکاری کراوەی و مرۆیی

١-خۆبەڕێوبردن: فێرخواز خۆی دیاریبکات کە دەیەوێت چ شتێك فێر ببێت. گۆدمان لە ساڵی ١٩٦٤دا دەڵێت: تاوەکو شتێك پێداویستی، ئارەزوو، بەدواداگەڕان و لێکدانەوی هزری تاك تێرنەکات فێربوون ئەنجام نادرێت، گەر ئەنجامیش بدرێت زوو لەبیر دەچێتەوە.

٢-خواستی چۆنیەتی فێربوون: کاری خوێندنگەکان ئەوەیە فێرخوازان وا پەروەردە بکەن کە حەزی خوێندن و بەردەوامی فێربوون لەواندا هانبدات و بە زیندووی بیهێڵێتەوە. بە بڕوای گاردنەر فێرخوازان دەیانەوێت بە ئارەزوو و شێوازی خۆیان بابەتەکان فێرببن.

٣-خۆهەڵسەنگاندن: مەرجی پێشینەی گەشە و خۆبەڕێوبردنە. لایەنگرانی ئەم ڕێگایە تاقیکردنەوەکان بە هۆکارێکی نەگونجاو دەزانن. گلاسیر لە ساڵی ١٩٦٩دا دژی تاقیکردنەوە بابەتییەکان بوو، چونکە بەرای گلاسیر پرسیارەکان تەنها یەك وەڵامی ڕاستیان هەیە و فێرخوازان بۆ وەڵامدانەوەیان دەبێت بابەتی زۆر لەبەر بکەن. بەلای ئەمانەوە باشترین تاقیکردنەوە خۆهەڵسەنگاندنە.

٤-گرنگی هەستکردن: پەروەردەکارانی ڕێگای کراوە باوەڕیان بە جیاکردنەوەی پرۆسەی مەعریفی و سۆزداری نییە، لەمەوە دەبێت خوێندنگە هەست و سۆزی فێرخوازان لەبەرچاو بگرێت. مۆد یەکێکە لە دەروونناسیە مرۆییەکان لە سالی ۱۹۹۷۰دا دەڵێت: گرنگی نەدانی زۆربەی مامۆستایان بە پرسی سۆزداری فێرخوازان بە توندوتیژی دەروونی ناودەبات، جەخت لەوە دەکاتەوە لەبەر پێشکەوتنی زانیاری و زانست نابێت لە چارەسەرکردنی کێشەکانی هەستیاری، سۆزداری و تێڕوانینی فێرخوازان دوربکەوینەوە.

٥-نەبوونی هەڕەشە: کاتێك ژینگەی فێربوون لە هەموو ترس و تۆقاندن و دڵەڕاوکێ پاکدەکەینەوە، بابەتەکان ئاسانتر و پڕ ماناتر دەگوترێنەوە و لە یادگەی فێرخوازانیشدا باشتر دەمێنێتەوە. کارل ڕۆجەر١٩٦٩دا لەو باوەڕەدایە سوکایەتیپێکردن و ترسان و تۆقان زیان بە کەسایەتی فێرخواز و ئەو وێناکردنەی کە لەسەر خۆی هەیەتی دەگەیەنێت.

تایبەتمەندیەکانی مامۆستای ڕێگای کراوە: گەیج و بیرلینەر بۆ مامۆستایانی ڕێگای کراوە، ئەم تایبەتمەندیانەیان داناوە:

١-ڕەسەنایەتی ڕەفتار: مامۆستا خاوەن کردار و ڕەفتارێکی ڕەسەن بن و خۆیان لە ڕیاکاری و ڕوکەشکاری بپارێزن.

٢-ڕچاوکردنی ڕێز: مامۆستا ڕێز لە هەست و بیروڕا و هەڵوێسیان بگرێت، بە تایبەتی نیشانی بدات کە متمانەی بە ڕاستگۆی و گوتاری فێرخوازانی خۆی هەیە.

٣-هاودڵی: مامۆستا دەبێت لەگەڵ فێرخوازانی خۆیدا لێکتێگەشتنی هەبێت و سەرنجی لەسەر کەسایەتیان هەبێت.

٣-مامۆستا خۆی بکات بە فیرخواز: مامۆستا خۆی بخاتە جێگای فێرخواز، ئەو مامۆستایەی خۆی دەکاتە فێرخواز و یەکێکێك لە فێرخوازەکانی دەکاتە مامۆستا، ئەوکات مامۆستا نمونەیەکی فێرخوازێکی باش و سەرکەوتوو دەناسێنێت ئەویش بەوەی پرسیارەکانی بە شێوازێکی وریایی و عاقڵانە دەخاتەڕوو. ئیمرلن لە سالی ١٩٦١دا، یەکێکەلە دەروونناسانی ڕێگای کراوە، مامۆستایان دەکات بە دوو گروپەوە (ئەرێنی و نەرێنی). بەلای ئەوەوە مامۆستای ئەرێنی ئەوەیە هەوڵدەدات فێرخوازان بیرورا و ئەندێشەیەکی سەربەخۆیان هەبێت و توانای خودی و خۆماکیان گەشە بکات، بەڵام مامۆستای نەرێنی ئەوەیە کە فێرخوازان ناچار بکەن ملکەچی و پەیڕەوی لە کۆمەڵە ڕێسا و یاسایەك بەن بە بێ بیرکردنەوە.

وەرزی یانزەیەم

گرنگی چەمکەکان و ئەندێشە لە پەروەردەدا

هەموو مرۆڤێك پێش ئەوەی بتوانێت وەڵامی گونجاوی ڕوداوەکان دەوروبەری خۆی بداتەوە دەبێت ئاشنایی تەواوی لەگەڵ چەمکە شیاو و پەیوەندیدارەکاندا هەبێت.

بەهۆی پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژیاو و ڕۆشتن بۆ بۆشای ئاسمان، ئامانجی سەرەکی پرۆگرامەکان خوێندن دەبێت دۆزینەوەی هەلی ئەوتۆ بێت بۆ فێرخوازان تاوەکوو بتوانن لەو چەمکانە بکۆڵنەوە بۆ دەرکپێکردن و تێکەشتنی پێشکەوتنە زانستیەکانی سەردەم پێویستە.

دەستخستنی چەمکەکان پەیوەندی بە جۆر و چۆنایەتی ئەو ئەزمونانەوە هەیە کە مندالان لە قۆناغە جیاجیاکانی گەشەی تەمەندا لەگەڵیان ئاشنا دەبن. ژان پیاژەی دەروونناسی سویسری  هەستا بە دەستنیشانکردنی قۆناغەکانی گەشەی منداڵ و ئەو هێڵکاریانەی کە منداڵ لە وێکچونەکان و گونجادا لە ئەنجامی هەڵسوکەوت لەگەڵ دەوروبەر بە دەستی دەهێنێت. دەرونناسان چەمکەکانیان بۆ جۆرە جیاوازەکان بەم شێوەیە دیاریکردووە.

١-چەمکە بینراوەکان: ئەو چەمکانەن کە لەبەردەستدان و بە شێوەیەی هەستپێکراو و بینراو وبە ئاشکرا دەبینرێن. وەك: کورسی، دەرگا، جانتا.

٢-چەمکە زەینیەکان: ێچەوانەی چەمکە بینراوەکانە کە بونیان لە جگە لە خۆیاندایە، واتە تەنها بە پێناسە و باسکردن دەیانناسین. وەك: بینین لە توانای پەیبردن بە واقعێك.

٣-وێنەی ئەقڵیەکان: دوبارەبوونەوەی تاقیکردنەوە هەستیەکانی ڕابردوو لە هزردا. هەریەك لە هەستەکانی ئێمە وێنەیەکی هزری تایبەت بە خۆیان هەیە لە ئەنجامی تاقیکردنەوە بەدەست دێت.

٤-چەمکە خەیاڵیەکان: کاتێك وێنە هزریەکان ئاوێتەی یەکدی دەبن بۆ ئەوەی چەمکێکی موێ دروستبکەن، بەو چەمکە نوێیە دەوترێت خەیاڵ. وەك: ئەسپی باڵدا، پشیلەی شاخدا. فێرخواز پێویستە سەرەتا ئەسپ و باڵ بناسێت یان پشیلە و شاخ بزانێت چیە ئەوکات دەزانێت ئەسپی باڵدار چییە.

٥-چەمکی لێکدراو: مەبەست لە پێکەوەبەستراوە، پێکهاتەی چەمکێکە  کە هەموو تایبەتمەندیەکان یان ئەو سیفەتانەی پێکیدەهێنن تێیدا کۆدەبێتەوە تاوەکو واتای ئەو شتە بە ڕاستی ڕوونبێتەوە. وەك: درەخت کە لە چەند بەشێك پێکهاتووە؛ ڕەگ، قەد، لقوپۆپ، گەڵا.

٦-چەمکی لێکترازاو: پێچەوانەی چەمکی پێکەوەبەستاوە، تەنها یەکێك لە تایبەتمەندیەکان دەتوانێت وەسفی ئەو چەمکە بکات. وەك: ئاسیایی؛ بەو کەسانە دەوترێت لە کیشوەری ئاسیا دەژین، عێراقی، ئێرانی، ژاپۆنی، هیندی..

٧-چەمکی پەیوەندی: برەئەنجامی پەیوەندی هۆکار و ئامانجە. وەك: چەمکی پاداشت کە پەیوەندی نێوان بزوێنەرێکی دیاریکراو و دەستکەوتنی وەڵامی پێویستە.

منداڵ کاتێك وردەوردە لە دەوروبەری خۆی تێدەگات و ئەزمون وەردەگرێت، نەك تەنها چەمکە نوێیەکان وەردەگرێت، بەڵکو ئەو چەمکانەش کە پێشتر درکی پێکردوون راوانتریان دەکات.

گرنگی بیرکردنەوە

بە هەر جۆرێك لە کردە یان چالاکیەك دەگوترێت کە لە چوارچێوی درکپێکردن، زانین، بیرهێنانەوە، خەیاڵکردن، کورتکردنەوە، پەتیکردن، گشتاندن و بەڵگەهێنانەوە دەردەکەوێت بۆ ئەوەی بتوانرێت پرسە ژیاریەکان و ئاستەنگیەکانی چارەسەر بکرێن. هەلومەرجە کاریگەریەکانی سەر بیرکردنەوە ئەمانەن:

١-پێزانین و بوونی کێشە.          ٢- خولیا و پەرۆشی.       ٣-گریمانەکردن.

٤-تاقیکردنەوەی گریمانە.

وەرزی دوانزەیەم

پتەوکردنی زانیاری

دەربڕی سەرنج و پەیوەندی مرۆڤە لەگەڵ ڕووداوەکانی دەوروبەر، ئەوەمان بۆ دیاریدەکەن کە فێربونەکان و زانستەکانمان بە هاوکاری چ ئامێر و هێمایەك لەگەڵ ئەو زانیاریانەی لە یادگەی پەیوەندیداردا جێگیر دەکەن و لە کاتی پێویستی چۆن وەبیر

دێنرێنەوە. لەم باسەدا کردەی زانیاری تایبەت دەکەین بە ڕاڤەکردنی میکانیزمی سەرنجدان، درکپێکردن، یادگە، بیرکەوتنەوە، بیرچونەوە.

سەرنجدان: بە واتای چڕکردنەوەی هەستەکانە لە بابەتێك یان لە مەبەستێکدا، زۆرجار ڕودەدات کە هەستەکانی مرۆڤ دەکەونە ژێر کاریگەری دیمەنەکان، دەنگەکان، بۆنەکان، تاموچێژ و ڕوداوەکان دەبنە شتێکی دیاریکراو لە کۆتایدا توشی لاوازی ئیدراك و سەرنجدانی دەکەن. ئەگەر لە یەك کاتدا سەرنجمان لەسەر دوو شت ببێت ئاستی وردبینیمان لەوە کەمترە سەرنجمان لەسەر تەنها یەك شت بێت.

سەرنجدان ویستی و ناویستی هەیە: سەرنجدانی ویستی ئەوەیە کاتێك لەبەر پێویستی سەرنجی شتێك دەدەین، بەڵام کاتێك بە هۆی پەیوەندی ڕاستەوخۆوە سەرنجی شتێك دەدەین و هیچ پێویستیەك زۆرمان لێناکات ئەوە سەرنجدانی ناویستەکیە.هەتا سەرنجدانەکە ڕاستەوخۆتر و ناویستەکیانەتر بێت کاریگەری و توانای زیاتر دەبێت. لیۆنۆردیرڤڵ لە ساڵی ١٩٧٩دا لەو باوەڕدایە کە سەرنجدان پەیوەندی بە دوو شتەوە هەیە:

١-سروشتی چیەتی ئەو هۆکارانەی جێگای سەرنجن.

ئەمانە کاریگەریان لەسەر سروشتی بزوێنەر هەیە: ئەندازەو توندی، جوڵە، لاسەنگی، نوێکاری

٢-پاڵنەری کەسی بۆ سەرنجدان.

ئەمانەش کاریگەریان لەسەر پاڵنەری کەسی هەیە، پێداویستی جەستەیی و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی.

درکپێکردن

پەیبردنە بە ڕاستی یان چەندی و چۆنی بزوێنەرەکان و پێدراوەکانی ناو ژینگە کە بە هەستەکان دەگەن. درکپێکردن بە بونیادی سەرەکی لە فێربوون و پێشکەوتنەکانی وانە هەژمار دەکرێت، کە پەیوەندی بەم هەلومەرجانەوە هەیە:

١-واتاداربوونی پاڵنەرەکان: درکپێکردن لەگەڵ ڕاستیەکاندا سەروکاری هەیە، واتا شتێك چەمکێکی دیاری کراوی نەبێت، درککردنی نابێت. بۆ نمونە شێوەی گیاندارێك بە کۆترێك دەچوێنین لە ڕاستیدا بەو پاڵنەرانەی بینین و بیستن واتا و چەمکێك دەبەخشن، کەوتنە

واتای یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی پەیبردن لە هێما پێدانە. زانیاریە بێواتاکان ناتوانن یادگەی دوور مەودا چالاك بکەن.

٢-ڕوونبونەوەی مەبەست: بۆ ئەوەی درکپێکردن و وەڵام بە ڕاستی و خێرا دەستبکەون، دەبێت پرسیار تەواو وردبینی کرابێت و لە هەموو ناتەواوی و شاراوەییەك بە دوور بێت.

٣-کاریگەری چاوەڕوانیکردن: بە تاقیکردنەوە بۆمان دەرکەوتووە کە هەتا پتر چاوەڕێ بکەین زووتر تێدەگەین.

٤-کاریگەری پێشینە: لە دەروونناسی گشتاڵدا پێشینە هۆکارێکی گرنگە لە بەرجەستەکردن و تێگەشتنی دەقدا. ئەو کەسەی لە تاریکیدا جلی ڕەش بپۆشێت کەمتر دەبینرێت، بەڵام ئەگەر ڕەنگی سپی بپۆشێت زووتر و باشتر بەرچاو دەکەوێت.

٥-درکپێکردنی تەواو: بە شێوەیەکی گشتی کاتێك بۆ یەکەمین جار چاومان بە شتێك دەکەوێت، بە شێوەیەکی یەك شتی تەواو یان یەکەیەکی دیاریکراو لێتێدەگەین.

یادگە

تەنیا هۆکارێك کە مرۆڤ دەگەیەنێتە گەشە و بوژانەوە، فێربوونی ڕاستیەکانی ژیانە کە پەیوەندی نەپەساوەی لەگەڵ یادگە و بیرەوەریەکانی هەیە. لە ڕاستیدا بەبێ یادگە هەموو هەوەکانمان لە ڕێگای فێربووندا لەناو دەچێت و ناتوانین لەوەی فێربووین لە شوێنی پێویستدا کەڵکی لێوەربگرین و بابەتە نوێکانیش ناتوانین بە ئاسانی فێرببین، بەمەش پەیوەندیمان لەگەڵ زانیاریەکانی ڕابردودا گونجاو نابێت. یادگە سێ جۆرە:

یادگەی هەستی: پێدراوەکانی ژینگەیی دەوروبەر یان بزوێنەرەکان بەهۆی هەستەکانی بینین، بیستن، بۆنکردن، تامکردن و بەرکەوتنەوە دەستدەکەون. لە ڕاستیدا هەریەك لەو هەستانە ئامێری تۆمار و یادگەی تایبەت بە خۆی هەیە.

یادگەی کورتمەودا: بە ڕایی میلەر یەکێکە لە دەزگا مەزنەکان بۆ داغڵکردنی هۆشمەندی و زانیاریەکان، تەنها دەتوانێت ٢+٧یەکە لە زانیاریەکان دەتوانێت وەربگرێت.

یادگەب دوور مەودا: ئەو زانیارییانەی کە لە یادگەی کورتمەودا دەکرێنە ناو یادگەی مەودا بەرزەوە، لە ڕێگای دوبارەکردنەوە و سەرنجدانەوە پتەو دەبن و ماوەیەکی زۆر لە هزردا دەمێننەوە.

هێماپێدان

کردەیەکە کە هۆشمەندی یان زانیارییە نوێیەکان دەستکاری دەکات بە شێوەیەك توانای گواستنەوەی هەبێت لە یادگەی دورمەودا هەڵدەگیرێت، زانیارییە نوێیەکان لە قالبی واتادا لەگەڵ هۆشمەندیە مەعریفیەکانیتردا لە یادگەی دوورمەودا پێکەوە دەبەستێتەوە.

ڕێکخستن: بە پێی بیردۆزی گشتاڵت ئەو بابەتانەی ڕێکخراو و ڕێکوپێك و هەسەنگێنراون ئاسانتر فێردەکرێن. بەلام میلەر پێیوایە کە فێربوون کاتێك گەشە دەکات کە ئەو بەشانەی لێپێکهاتووە ڕێکخرابن و ڕیزبەندیان بۆ کرابێت.

ڕاڤە و ڕوونکردنەوە: یەکێکە لەو هۆکارانەی کار لە هێماپێدان دەکەن، کە پەیوەندی لە نێوان ئەوەی فێردەبێت و زانیاریەکانیتردا پەیدادەبێت و یارمەتی پاراستن و وەبیرهێنانەوەی دەدات.، زۆرجار ڕودەدات کاتێك زانیاریەکان بیردەچنەوە ڕاڤە و ڕونکردنەوەی ئەوانە و پەیوەندیان لەگەڵ بابەتەکانیتر وەبیر دەهێنێتەوە.

سکیما (کەڵکوەرگرتن لە پلانڕێژی): کۆمەڵێك زانیار زۆر لە سیستەمێکی واتاداردا ڕێکدەخرێن و بە شێوەیەکی گشتی ڕەفتارەکان و دیدگاکانی قاڵبێکن کە نمونەی پێوانەیی یان زنجیرە قۆناغێکی پەیوەست بە چەمك کارامەیی و ڕووداوی تایبەت دیاریدەکەن.

وەبیرهێنانەوە

کاتێك زانیاریەکان دەکرێنە یادگەی دوورمەودا، ئەگەر بمانەوێت دووبارە دەستمان پێیان ڕابگاتەوە، ئەو دەسکەوتنەوەیە بە ئاسانی ڕوونادات ناتوانرێت زانیاریەکان بە ئاسانی وەبیربهێنرێتەوە. بەڵام ئەگەر بتوانین ئاماژەکان یان بزوێنەرێکی تایبەت بەکاربهێنرێت، دەتوانرێ لەو ڕێگایەوە یارمەتی وەبیرهێنانەوی زانیاریەکان بدرێت.

بیرچوونەوە

ناتەواوی پشێویە لە وەبیرهێنانەوی بابەتەکاندا بەدی بهێنێت، ئەمەش هۆکاری جیاوازی هەیە کە گرنگترینیان لە ئەنجامی تێکچونی هێماپێدانەوە دروستدەبێت.

کارگێڕی پۆڵ

مامۆستا بۆ ئەوەی لەگەڵ دروستکردنی ڕێکخستن و ئارامی لە پۆلدا، بتوانێت پرۆگرامەکانی خۆی بۆ فێرکاری فێرخوازانی جێبەجێبکات. پێویستە بزانێت لە کوێدا و چ کار و بابەتێکی جیاواز لە شوێنی خۆیدا ئەنجامدەات. بنچینەکانی ڕێکاری:

١-ژینگەی گونجاو بۆ فێربوون لەسەر بنەمای ڕێزگرتن.

٢-دانان ڕێسا بۆ پۆل لە لایەن مامۆستاوە بە مەرجێك فێرخوازان بەشداربن لەم ڕێسایە.

٣-مامۆستا بە ئامادەیی تەواوە بچێتە پۆلەوە.

٤-مامۆستا لە هەمبەر سەرپێچیەکانی فێرخواز، ڕێگای جۆراوجۆر بگرێتە بەر.

٥-مامۆستا کاتێك دەزانێت کۆنترۆڵێ پۆلی لەدەستداوە، پێویستە داوای کۆمەکی بکات.

تایبەتمەندیەکانی مامۆستای باش

فێرکاری و وانەوتنەوە کارێك زۆر هەستیارە، لەبەر ئەوەی زانیاری لە بەشێك دیاریکراودا بەدەستهێنا مەرج نییە بتوانێت ببێتە مامۆستایەکی سەرکەوتوو. بۆ مامۆستایان بە گشتی دوو ڕۆڵی سەرەکیان هەیە، یەکەمیان: ئەرکیان بەرامبەر فەرهەنگی کۆمەڵگەی خۆیانە، دووەمیان: ئەو ئەرکەیە بەلای فێرخوازانەوە پەسەندە. مەبەست لە کلتور؛ شێوازی ژیانی ئاسایی یان میراتی کۆمەڵایەتی خەڵکە و بەرئەنجامی هەموو جۆرە تاقیکردنەوەکانی مرۆڤایەتیە لەبەر ڕۆشنایی ئەودا گروپێکی خەڵك بەردەوامی بە دابونەریتی ژیانی خۆیان دەدەن.

ڕۆڵی مامۆستا لە کلتوردا: ڕۆڵی هەر مامۆستایەك گواستنەوەی بەشێك لە تایبەتمەندیەکانی کولتووری نەتەوەکەیەتی بۆ نەوەی گەنج کۆمەڵگە، کە لەلایەن زۆربەی خەڵکەوە پشتگیری لێکرابێت. هەرچەندە لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا زۆرینەی خەڵك، هەم بۆ پارێزگاری لە کەلەپوری کولتور و هەم بۆ چاکسازی پێشکەوتنی ئەوانە گرنگی و بەرژەوەندی دەردەبڕن، بەڵام دوژواری کاری مامۆستا ئەوەیە چۆن بتوانێت لە نێوان ئەم دژیەکیانە هاوسەنگی بکات.

چوار حاڵەت لە پێشە بۆ ئەوەی مامۆستایان مامەڵەی لەگەڵدا بکەن:

١-نا بۆ ئەو کلتورەی کە هەیە: ئەو مامۆستایانەی کە میراتی کولتووری نەتەوەیی نادیدە دەگرن، ئەوانە دەبنە هۆکاری پشێوی و پاشەکشەکردن، زۆرجار زەرەرمەندیش دەبن،

چون فێرخوازانیان هاندەدەن دژی کولتوری کۆمەڵگەمەیان بن، بەڵام سەرئەنجام ڕوبەڕووی کۆمەڵگە دەبنەوە.

٢-پلاندانان بۆ کلتوری نوێ: لەبەر ئەوەی ئەم دەستە لە مامۆستایان تاکی فێرخواز و مۆدێرنن، بۆ پلان و خوڵقاندنی کولتوور و بیرۆکەی پێشکەوتوو و بەرزی خۆیان دەستدەبەن.

٣-پاراستنی ئەو کلتورەی کە هەیە: گروپێکیتری مامۆستایان بە گەرموگوڕی و ئەوینێکی تەواوە خۆیان بە پشتیوان و پارێزەری کلتوری کۆمەڵکەکەیان دەزانن، خۆیان بە بەشدار نازانن لە گۆڕانکاریە کلتوریەکان. هەر فێرخوازێك هەوڵبدات پێچەوانەی کولتور ڕەفتار بکات بە توندی بەرنگاری دەبنەوە.

٤-چاککردنی ئەو کلتورەی کە هەیە: ئەم دەستەی مامۆستایان بە پێچەوانی سێ دەستەکەیترەوە، هەوڵنادەن بە بێ بەڵگەی لۆژیکی دەست دژایەتی یان گۆڕانکاری یان پاراستنی کولتوور بکەن. بەڵکو هەموو بابەتێکی کلتوری دەخەنە ژێر هەڵسەنگاندنی وردەوە، لایەنی ئەرێنی و نەرێنی دیاریدەکەن. ئەو کلتورانەی باش و چاکن پشتگیریان دەکەن، ئەو نارێکیانەشی لە کلتوردا هەن هەوڵدەدەن ڕێگاچارەیان بۆ بدۆزنەوە.

چاپی یەکەم ٢٠٢٣

چەمکی فێربوون چی دەگەیەنێت، چی بە بیری مرۆڤدا دێت؟

بە گشتی مرۆڤ لە چەمکی فێربووندا ئەم دوو زاراوەیەی بە بیردا دێت، ئەوانیش زانین و توانینە، بەڵام ئەمانە هەردووکیان ناتواندرێ هەروا بە بێ یاریدەی هۆکاری تر بپێۆرێن. ئەو بوارەی دەکرێ زانین و توانینی تێدا هەست پێبکرێت گۆڕینی ڕەفتارە. (فێربوون ئەو گۆڕانی ڕەفتارەیە کە بە دەستی ئەنقەست دەکرێ، بۆ پێوان و سەلماندنی دەشێ).

١-پێویستە فێربوون بە پێی مەبەست و ئارەزومەندانە بێت، هەندێکجار گۆڕانی ڕەفتار بەهۆی نەخۆشی یان پیریەوە دەبێت.

٢-فێربوون دەبێت جێگەی ناسین و پێوان بێت، نابێت فێربوون هەر وەك زاراوەکانی زانین و توانین لێی بڕوانین و قەبوڵمان بێ. هەندێکجار کەسێك دەڵێت شتێك دەزانم، بەڵام لە هەمبەر تاقیکردنەوەدا خۆی ڕاناگرێ.

ناکرێ تێکستی ڕۆمانێك یان تێکستی کتێبێکی بەرنامەی خوێندنگە ببێتە سەرچاوەی زانیاری و بڕوای پێبهێنی، چون ئەو زانیارییە جێگەی قبوڵە کە سەرچاوەکەی جێگەی باوەڕ بێت. گۆڤارەکان زانیاریەکان لە سەرچاوە زانستیەکانەوە وەردەگرن و بە دەستکاریەوە بڵاوی دەکەنەوە، تاکو خوێنەری ئاسایی لێی تێبگات.

فێربوون و بیرکردنەوە

ئەگەر باسێك دەربارەی فێربوون بێ، بێگومان دەبێ باس لە یادی جۆراوجۆری پرۆسەی بیرکردنەوە بکا. کاتێك کەسێك دەیەوێ زانیاریوکانی بە بیربێتەوە، لە یادی خۆیدا دەگەڕێ، پاشان بە بیری جێتەوە یان نە، ئەوە بە توانایی یان لێزانی کەسەکە لەو لێگەڕانە بەندە. ئەویش بە دەوروبەر، توانایی، کەپاسێتی فێربوونەوە بەندە. ئەو کاریگەری و هەلومەرجانەی کە کار لە پرۆسەی بیرکردنەوە دەکەن بە هەمان شێوە کار لە پرۆسەی فێربوونیش دەکەن.

کارکردنی یاگە لەسەر زانیارییەکان

پینتریچ لە ساڵی ١٩٨٨دا، کاریگەری فێربوون و ستراتیژییەکانی بیرکردنەوەی لە پرۆسەی کارکردن لە سەر زانیاریەکان بەم شێوەیە ڕونکردوەتەوە:

ئەو زانیاریانەی بە هەر ڕێگەیەك وەردەگیرێن، ئەوانەی دەگەنە مێشکی مرۆڤەوە بۆ ماوەیەکی یەکجار کورت یان یۆ ماوەیەکی درێژ دەمێننەوە، ئەوەی لەو کردارەدا بڕیاردەرە، تێپەڕبوونی زانیاریەکەیەە بە هەر سێ قۆناغدا، واتە هەر سێ تۆمارەکە. ئەمەش پرۆسەیەکی ئاڵۆزە، زۆر هۆکار و هەلومەرج ڕۆڵی کاریگەریان تێیدا هەیە. بۆیە لە ژیانی ڕۆژانە هەندێك ڕووداو هەن هەرگیز لەبیر ناکرێن، کەچی هەندێکی تریان لە چاو تروکانێکدا وندەبن. ئەم زانیاریانە یەکەمجار لە تۆماری هەستیاریدا تۆمار دەکرێن، مرۆڤ بە هۆی هەستەکانیەوە بۆ ماوەی نزیکەی یەك چرکە تا بیست چرکە زانیارییەکانی لا دەمێنێتەوە. ئەگەر ئەو زانیاریانە بە ئاگاییەو وەربگیرێ ئەوە دەنێرێتە تۆمارکەری یادی کورتخایەن کە لەوێدا بۆ چەند خولەکێك دەمێنێتەوە، دیسان ئەو زانیاریانەی لە تۆمارکەری کورت خانیەندا بۆ تۆمارکەری درێژ خایەن بنێرێ، بە درێژایی ساڵان دەمێنێتەوە.

قۆناغەکانی تۆماری یادگە

١-تۆمارکەری یادی هەستیاری، یەکەمین قۆناغی سیستەمی یادگەیە، بە هۆی پێنج هەستەکەمانەوە بە دونیای دەرەوە دەبەسترێتەوە، مێشك زانیارییەکان بە هۆی ئەم پێنج هەستانەوە وەردەگرێ. هەموو یاد و بیرکانمان زادەی ئەو زانیاریانەن کە لە ڕێگەی کارکردنی ئەو تۆمارکەری هەستیاریەوە پێمان دەگات.

بەکارهێنانی کەناڵەکانی هەست لە کەسێکیەوە بۆ کەسێکی دەوروبەر ئەو سەردەمەوە بەندە، کە کەسەکە تێیدا دەژی. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا مێشکی مرۆڤ زانیاریەکی زۆر پێکەوە لە یەك کاتدا وەردەگرێ، سەبارەت بە بەکارهێنانی کەناڵەکانی هەست توێژینەوە نوێ دەڵێت: مرۆڤی سەردەمی تەکنەلۆیا گەرچی لە ڕووی ژیری و توانای بیرکردنەوە و لۆژیکەوە گەشەی کردوە و چوەتە پێشەوە، بەڵام هەستەکانیان لە پاشیان داوە، هەستیاریان کەمبوەتەوە. زانیاریەکان بۆ ماوەی کەمتر لە بیست چرکە لە یاد دەمێننەوە، دوایی هەندێکی کەم لەو زانیاریانە دەنێردرێت بۆ یادی کورت خایەن. (ئەو زانیاریانەی گرنگ نەبن یان ئەو زانیاریانەی لە ماەی بیست چرکە دوبارە نەکرێنەوە یان لەگەڵ یادێکی پێشوو نەبسترێتەوە ئەوە ون دەبن). تۆمارکەری یادی هەستیاری کاتێکی زۆر کورتی بۆ تێگەشتن و اقیکردنەوە و لێکدانەوەی زانیاریەکان هەیە.

٢-تۆمارکەری یادی کورتخایەن: تۆماکەری کورتخایەن حەوت کۆ یان کەم دوو لەو زانیاریانە تۆمار بکات وات لە نێوان (٥ بۆ ٩) وشە بە بیر دێتەوە، بۆ نمونە ڕاهێنانێك دەکەین: بۆ ماوەی خولەکێك ئەم وشانەی خوارەوە بخوێنەرەو و فێریان ببە:

کتێبخانەی گشتی – زانایانی سروشت – کەرەستەی هەویر – چوارچێوەی نیگار – بورجی مۆبایل – هۆلی ئاهەنگ – دار بەڕوو – میزی نانخواردن – شەقامی شار – دەرگا – ئاوی دەریا.

دواتر بۆ ماوەی ١٠ خولەك بە کارێکیترەوە خۆت سەرقاڵ بکە، دوور لەوەی ئەم وشانە دوبار بکەیتەوە، پاش ١٠ خولەك کاغەزێك بهێنە و ئەو وشانە بنوسەرەوە لە بیرت ماون، بیانژمیرە و لەگەڵ لیستی وشەکاندا بەراوردیان بکە، بزانە چەند چەند وشەی ڕاستت نوسیوە، بە ئەگەرێکی زۆرەوە لە نێوان (٥ بۆ ٩) وشەیە، تۆمارکەری یادی کورتخایەن بەرفراوانیەکەی حەوت کۆ یان کەم دوو ناوەڕۆکە.

کورتەباس نوسین: زۆرجاران فێرخواز لە کاتی وانە خوێندندا بۆ باشتر تێگەشتنی بابەتەکە، کورتە باسێکی گونجاوی بابەتێك دروست دەکات، لە بەرچاو گرتنی چۆنیەتی کارکردنی چڕکردنەوە و بەکارهێنانی لە دروستکردنی کورتە باس (زانیاریەکی زۆری تێدا کۆبکرێتەوە و چڕ بکرێتەوە) زۆر سودبەخش و گرنگە لەبەر پرۆسەی داڕشتن و بەرهەمهێنانەوە. کورتە باس نوسین لەبەر دوو هۆ گرنگە:

١-بڕی زانیاریەکانی هێندە کەمە، بۆ تۆمارکەری یادی کورتخایەن دەشێت.

٢-دانانی کلیلە وشەکان هێندە بە وردەکاری راوتن، ناوەڕۆکی زانیارییەکان بۆ گەشتن بە تۆمارکەری یادی درێژخایەن ئامادەن.

کاریگەری ڕەوشی زنجیرەیی یەك لە دوای یەك تۆمارکەری یادی کورتخایەن: لایەکی دیکەی کارکردنی تۆمارکەری یادی کورتحایەن کە میکانزمێکی زۆر گرنگە، بریتیە لە ڕەوشی زنجیرەیی یەك لە دوای یەکی ئەو کارکردنە بۆ ئەوەی لەم میکانیزمە تێبگەین جارێکیتر دەچینە سەر تاقیکردنەوەی ڕاهێنانی ژمارە ، ئەو وشانەی دەکەونە سەرەتا و کۆتایی لیستەکە فێربونیان باشتر و تایبەتە، بەلام ئەوانەی دەکەونە ناوەندی لیستەکە فێربونیان خراپە، بە هۆی ئەوەی کە ئەو یەکانەیی لە سەرەتادا لە بیری مرۆڤ دەمێننەوە کاریگەری بنچینەییان هەیە، ئەو وشانەی لە کۆتایی لیستەکەدا باش لە بیری مرۆڤ

دەمێنێتەوە کاریگەری هەڵسەنگاندنیان هەیە، بەکارهێنانی کاریگەری ڕەوشی زنجیرەیی یەك لە دوای یەك بۆ لەبەرکردنی وشە، پێناسە، هۆ سودی زۆر باش لێدەبینرێت.

بەیکداچوونی یاد لە ناو تۆمارکەری یادی کورتخایەندا: هەر ناوەڕۆکێکی یاد بۆ ساتەوەختێکی کورت لە تۆمارکەری یادی کورتخایەندا دەمێنێتەوە، ئەگەر لەم ماوەیەدا نەگاتە تۆمارکەری یادی درێژخایەن ئەوە ناوەڕۆکی یادەکە ون دەبێ. بۆ ئەو بابەتانەی دەمانەوێت بگاتە تۆمارکەری یادی درێژخایەن، دەبێ ئەو بابەتە لە تۆمارکەری یادی کورتخایەندا تۆمار کرابێت. بۆ ئەوەی لە کاتی فێربووندا ڕێگە لە بەیەکداچونی زانیارییەکان بگرین، شتی زۆر کاریگەر ئەوەیە کە لە سەرەتای خوێندندا بە تاڵ بکرێ، ئەمەش زۆر ئاسان و سادەیە بەر لە دەستپێکردنی فێربوون بە هۆی خۆ خاوکردنەوە ئەم بەتاڵ کردنەوەیە دێتە ئاراوە.

٣-تۆمارکەری یادی درێژخایەن: زانیاریەکان و ناوەڕۆکی بابەتی فێربوون بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ و بەردەوام لە تۆمارکەری یادی درێژخایەن دەمێنێتەوە، بۆیە هەندێکجار ئەم جۆرە تۆمارکەرە بە تۆمارکەری درێژخایەن ناودەبرێ. تۆمارکەری درێژخایەن سێ جۆرە:

یەکەم: ناساندن: بریتیە لە ناسین و دوبارە ناسینەوەی ئەو ئاماژانەی کە بۆی دێت.

دووەم: بەرهەمهێنانەوە: بەرهەمهێنانەوەش بە دوبارە بەرهەمهێنانی ناوەڕۆکی یادەکان هەڵدەستێ.

سێیەم: بەرهەمهێنان: بریتیە لە دارشتنەوەی یادێکی کۆن یان دارشتنی یادێکی نوێ.

زانیارەکان بەهۆی دەمارە خانە و شەپۆلە ئەلیکترۆنەکانەوە لە کۆتایی دەمارەکانەوە پەیامەکان دەگۆڕنەوە. دەکرێ ناوەڕۆکی تۆمارکەری یادی کورتخایەن بە هۆی دوبارەکردنەوە لە تۆمارکەری یادی کورتخایەندا جێگیر ببێت و بمێنێتەوە، لەوانەشە بگاتە یادی درێژ خایەنەوە. بەڵام بە دوبارەکردنەوەی ڕووت، بۆ ئەوەی زانیاریەکان بگەیەنرێتە تۆماری یادی درێژخایەنەوە میتۆدێکی ناکاریگەرە. ڕێگەی کاریگەر ئەوەیە بۆ ئەو زانیاریەکان لە یادی کورت خایەندا کاری لەسەر بکرێت، حەزلێبوون یان هەڵچونە.

١-حەزلێبوون: بۆ مانەوەی زانیاریەکان یان کارێکی داهێنەرانە زۆر گرنگە حەزت لێی بێت. حەز لێکردن خۆکرنییە، زەحمەتە بتوانێت بە دەست ئەنقەست خۆت بهێنیتە قەناعەت و حەزلێبوون دروست بکەی.

٢-هەڵچونی بەشداربوون: ئەو یادانەی بە هەڵچوونەوە بەستراونەتەوە باشتر لە یاد جێگیر دەبن، بە بوونی یادە یەکەمینەکان لە ناو یادەکاندا بە گشتی زووتر تۆمار دەبن، بەڵام هەڵچونەکان خۆیان یەکەمینی خۆیان هەیە ئەو یادانەی بە هەڵچونەوە بەندن دوو جۆرن: یادی خۆش، یادی ناخۆش. لە سایکۆلۆژیای فێربوونی داهێنەرانەدا کاریگەری هەڵچوون لەسەر فێربوون شتێکی نوێیە، لێکۆڵەوەران لە سەرەتادایە لەگەڵ ئەوەش دا دەرئەنجامی گرنگیان بە دەستهێناوە. بەمە دەردەکەوێت بۆچی ئەو فێرخوازەی لە وانەکانی زۆر باش نییە کەچی لە لایەنی ئارەزوو و هیوایەتەوە دەتوانێ شارەزای تەواو بەدەست بهێنێت.

باسی سێیەم

جۆرەکانی فێربوون و حوکمە ڕاستەوخۆکانی فێربوون

جۆرەکانی فێربوون

دوو جۆر فێربوون ی جیاواز هەیە: یەکێکیان پشت بە گرێبەندی یادەکانی مێشك دەبەستێت بە بەشداربوانی تۆمارکەری یادی هەستیاری و کورتخایەن و درێژخایەن بەندن. دووەمیان کارکردن لەگەڵ تێکستەکان بە بینین و گوێگرتن و نوسینەوە و دارِشتنی هێڵکاری یاد کە میتۆدێکی دیکەی فیربوونە، پێیدەگوترێ کارپێکردن.

حوکمە ڕاستەوخۆکانی فێربوون

١-نابێ هیچ جارێك لە ٧ حەوت یەکە بۆ هەر ستونێکی فێربوون پتر فێربێ.

٢-هەر یەکەیەك باش فێرنەبووی، دەبێ بخرێتە سەرەتای ستونەکە یان کۆتایەکەی.

٣-لە دوای هەر ماوەیەکی فێربوون پێویست بە پشودان دەکات.

٤-ئەو دوو باەبەتانەی لە یەکدەچن، وەك فێربونی دوو زمانی جیاواز، وا باشترە لە دوای یەکتری نەخوێندرێن.

٥-نابێ فێربوون لەگەڵ چالاکی تردا توشی بەیەکداچوون ببێتەوە، واتە دەبێ شوێنی فێربوون داخراو بێت.

باسی چوارەم

شێوازەکانی بەکارهێنانی تۆمارکەری یاد

١-کارتەکانی فێربوون: بنەمای ئەم شێوازە لەسەر بنچینەی دووبارەکردنەوەی بابەتی فێربوون دەوەستێ، هەندێکجار منداڵێك لە ڕاهێنانی موزیك فێربوندا، بۆ نمونەکەمانچە ژەنیندا، دەبینی پارچە موزیکەکە بە جوانی دەژەنێ تا دەگاتە شوێنێك هەڵەی تێدا دەکات و سەری لێدەشێوێ، جارێکیتر دەستپێبکاتەوە لە هەمان شوێنەدا هەمان هەڵە دوبار دەکاتەوە، لەبەر ئەوە وا باشترە تەنیا ئەو شوێنەی هەڵەی تێدا دەکات دوبارەی بکاتەوە.

٢-کارکردن لە تێکست: تێگەشتنی تێکست و هەڵهێنجانی ناوەڕۆکەکەی یەکێکە لە ڕێگاکانی فێربوون کە کارکردن دەگرێتەوە، خۆ خەریککردن بە تێکستەوە چ نوسراو بێت یان بیستراو تاکو ماناکەی تێبگەی و زانیاریەکانی ناوەڕۆکەکەی فێربی. باشترین میتۆد بۆ تێگەشتن لە تێکست میتۆدی SQRRRی پرۆفیسۆری سایکۆلۆژی فرانسیس پی ڕۆبنسۆنە، کە بەم شێوازەیە. کە بە چەند هەنگاوێك بەر لە خوێندنەوەی سەر لەبەری تێکستەکە بیگرێتە بەر، وەك: خوێندنەوەی پێشەکی، بابەتەکان، ناوەڕۆك، دانەرەکەی، کلیل و وشە و خاڵە گرنگەکان. بەم هەنگاوانە دەست پێدەکات:

هەنگاوی یەکەم: ڕوپێوکردن: لەم هەنگاوەدا دەتوانی ئەو بابەتە بدۆزیتەوە کە دەتەوێ یان پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە. ڕوپێوکردن بەسەر بابەتەکاندا هەوەك ئەوە وایە کە وێنە و نەخشەیەکی گشتی نوسراوەکەت پێبدات.

هەنگاوی دووەم: پرسیارکردن: لە دوای چاو خشاندن بە تێکستەکەدا دەکرێ پرسیار بکەی لە کاتی چاو پیاخشاندا باشتر وایە بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارانەدا بگەڕێیت، لەوانەیە لە ناو تێکستەکەدا زاراوەیەك هەبێت زیاد لە چەند پرسیارێك هەڵبگرێ.

هەنگاوی سێیەم: سەرنج بدە خوێندنەوە هەنگاوی یەکەم نییە، بەڵکو هەنگاوی سێیەمە لە کرداری خوێندنەوە بۆ فێربوون. دانیشتن لە سەدا پەنجای تەرکیز کەمدەکاتەوە، لەبەر ئەوە پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەیت:

١-تەرکیزکردن: هەردوو قاچەکانت لەسەر زەوی بێ، لەسەر کورسی ڕەق تەرکیز باشترە.

٢-بیرۆکە سەرەکیەکان بدۆزەرەوە: ئەمە گەوهەری بابەتەکەیە.

٣-هێڵ بە ژێردا کێشان و نیشانکردن.

هەنگاوی چوارەم تێگەشتن: ئەمیش دوو قۆناغە:

١-دارشتنەوە بە دەربڕینی خۆت، کاتێك لە خوێندنەوەی تێکستەکە بویتەوە، هەوڵمەدە نوسراوەکە ئەزبەرکەی، هەوڵبدە بە دەستەواژەی خۆت فێریان بی.

٢-تێبینیەکانی خۆت لە ڕۆخی کتێبەکە بنوسە: دەتوانی بیرۆکە سەرەکیەکان بە دەربڕینی خۆت لە کەناری کتێبەکەوە یان لە تەنیشت تێکستەکەوە بنوسی.

هەنگاوی پێنجەم: پێداچونەوە. هەڵسەنگاندن یان پێداچونەوە، گرنگترین خاڵی میتۆدەکەیە، مرۆڤ تەنیا بە ڕوپویکردنی خوێندنەوە ناتوانێ ئەوەی فێری بووە لە بیری بمێنێ، بەڵکو ئەگەر مرۆڤ لێیگەڕا مێشکی کاربکا لەوانەیە هەندێکجار لە دوای خۆ ماندوکرنێکی زۆریشەوە هەر لە بیری نەمێنێ، لەبەر ئەوە گرنگە دوای هەنگاوەکانی سەرەوە هەمیشە پێداچونەوە بە بابەتەکاندا بکەیت. باشتر پێداچونەوە ئەوەیە لە دوای هەر ماوەیەکی دیاریکراودا (٢ – ٨ – ٣٠) ڕۆژدا بابەتە فێربوەکە دوبارە بکرێتەوە، نەك تا ماوەیەکی زۆر دوور لێیگەڕێ.

باسی پێنجەم

کەناڵەکانی فێربوون: بیستن – بینین – کار لەگەڵ کردن

ئەگەر بتەوێت شتێك دەربارەی بابەتێك فێربیت، بە دوای زانیاریە بەردەستەکان دەربارەی ئەم بابەتە دەگەڕێی و وەریان دەگریت و کاریان لەسەر دەکەیت، تا وەکو لێیان تێدەگەی و لە یادت تۆمار دەبێ. هەر ڕێگایەك کاریگەری مانەوەی زانیاری لە یاد جۆراوجۆرە:

ئەگەر تێکستێك بخوێنیتەوە دوای کەمێك تەنیا ١٠٪ی ناوەڕۆکی زانیاریەکانت بیر دەمێنێت.

ئەگەر بە هۆی گوێگرتن لە موحازەرەیەك ئەو زانیارەت وەرگرتووە، ئەوە بە تێکڕای ٥-٢٠٪ باسەکەت لە یاد دەمێنێ.

ئەگەر بە ئەزمون و تاقیکردنەوە و بە کرداری بە بیستن و وبینین زانیارەکەت وەرگرتووە، ئەوە بە تێکڕای بە نزیکی ٦٠٪ باسەکەت لە یاد دەمێنێ.

ئەگەر بابەتەکە باسی ئەزمونێك بووە و لەگەڵ گروپێکدا کارتان کردووە و گفتوگۆتان لەسەر کردووە، ئەوە بە تێکڕای ٧٠٪ باسەکەت لە یاد دەمێنێ.

ڕێژەی مانەوەی زانیاریەکان لە یاددا بە پێ ڕەوشی فێربوون زەحمەتی و ئاسانی بابەتەکە جۆری دارِستنی زانیاریەکان ...، لە کەم و زۆربوندا دەبێ، ئەو کەناڵانەی لە خوارەوە باسیان دەکەین، ناکرێ بە دابڕاوی باسیان بکەین.

١- بیستن: بیستن یەکێکە لە شێوە کەم کاریگەریەکانی وەرگرتن، بە پێی لێکۆڵێنەوە و ئاماری زانیاری وەرگرتن تەنیا وەرگرتنی زانیاری بە هۆی بیستنەوە دەرکەوتووە کە کاریگەری کەمە و زانیاریەکانیش ڕووکەشن، بەڵام لە پەیوەندی گرتندا خێرا و ئابوریانەیە.

٢- بینین: پێویستە خوێندنەوە لە کەناڵی بینین دەرهاوێین، خوێندنەوە دەربارەی شتێ لە بینینی ڕاستەقینەی شتەکە کە بە چاوی خۆت ڕاستەوخۆ دەبینی جیابکەینەوە، دەبێ خوێندنەوە بە ڕاڤە و وێنە و نیگارەوە سەیر بکرێ.

٣- کار لەگەڵ کردن: مەبەست لە کار لەگەڵ کردن کاری دەستی نییە بەڵکو بیرکردنەوەی ژیرانە و فێربوونی چالاکانەیە بە هۆی گیان و دەروون بە گەڕخستن لەگەڵ بابەتەکەدا، بەو مانایە کار لەگەڵ کردن بەشداریەکی ڕاستەوخۆیە لە کردارێکدا بۆ بیرکردنەوەی خۆت لە پەیوەندیەکاندا و بەشداریەکی چالاکانەیە لە گفتوگۆکاندا. گرنگیەکەی لەوەدایە بۆ خۆت مێشکت بۆ کارکردن لەگەڵ زانیاریەکان بەکاردەهێنی.

هەوڵدەدەین زانستیانە دەربارەی کەناڵی فێربوون بدوێین:

١-زانیاری بیستراو و بینراو، بە هۆی نمونە هێنانەوەی خۆت بە هێنانە بەرچاو بەرجەستەی بکە.

٢-هەوڵبدە ئەوەی دەیخوێنیتەوە لە ژیانی ڕۆژانەدا بەرجەستەی بکە.

٣- کاریگەریت لەسەر پرۆسەی فێربوون هەبێت و چالاکانە بەشداری تێدا بکە.

٤- هەوڵبدە لە کرداریفێربووندا چەند کەناڵێکی تر بەکاربهێنیت.

٥- بزانە کامە کەناڵی فێربوون بۆ تۆ گونجاوە بۆ فێربونی بابەتەکە، ئەوە زیاتر بەکار بهێنە.

٦- خۆت لەسەر یەك کەناڵی فێربوون ڕامەهێنە، بەڵکو کەناڵی فێربونەکانت بگۆڕە.

بەشی دووەم

سایکۆلۆژیای فێربوونی داهێنەرانە

١- مێشکی مرۆڤ: کاتێك باسی مێشکی مرۆڤ دەکەین یەکسەر ئەوەمان دێتەوە بیر کەوا ئامێرێکی سەرسوڕهێنەر و ئاڵۆز و پێشکەوتووی زیندووە. ئەو کەسەی بیەوێ پرۆسەی فێربوون بە دروستی تێبگا، پێویستە بزانێ مێشك چۆن کار دەکات. توانای بۆماوەیی ئاستی زیرەکی ٤٨٪ی بە کرۆمۆسۆمەکانەوە چەسپاوە، ٥٢٪شی لە دوای لە دایکبوون بە هەوڵدان بە دەستدێت.

تۆنی بۆزان، داهێنەری هێڵکاری یاد بۆ ڕاهێنانی یاد و مێشك، دەڵێ: ئەگەر تەنها یەك لای مێشکت بەکار بهێنی، هەروەك ئەوە وایە بە یەك لاق بڕۆی.

مێشکی مرۆڤ لە چەند بەشێکی پێکەوە گرێدراو پێکدێت:




أ- مێشکە خشۆك: کۆنترین و قوڵترین بەشە لە مێشکی مرۆڤدا، ئەم مێشکە دەکەوێتە ئەو شوێنەی بڕبڕەی پشت لە کەللەی سەر جیادەبێتەوە، ئەم جۆرە مێشکە لە گیانلەبەری وەکو تیمساح و باڵندە و خشۆکەکاندا هەیە.

ئەم بەشەی مێشك زۆر کاری بنچینەیی وکو: هەناسەدان، لێانی دڵ و کاردانەوەی ترس ئەنجامدەدا، هەروەها لە زۆر کرداری تری غەریزەش بەرپرسیارە. ئەم بەشەی مێشکە پێمان دەڵێ، برسیمانە یان ماندووین، بە سکی برسی کاری داهێنەرانە و فێربوون ئەنجام نادرێت.

ب- مێشکە شیردەر: ئەم بەشە لە شیردەرەکاندا تا بەرزترین ئاست گەشەی کردووە، بۆیە هەندێکجار بەم بەشە دەڵێن -مێشکە شیردەر- زۆرجار وەکو هەڵسوڕێنەری مێشك یان مێشکی هەڵچوون سەیر دەکرێ. بە شێوەیەکی گشتی زانیارییەکان لە مێشکە شیردەر تۆمار دەکرێن، پێش ئەوەی بتواندرێ لە تۆمارکەری یادی درێژخایەن تۆمار بکرێ.

ئەمەش ئەوە دگەیەنێ کە هەرچەند فێربوون بە بیرهاتنەوە بە هەست و نەستەوە بەستراوبن هێندە ئاسانتر دەبێ، واتە ئەگەر بە حاڵەتێکی باش فێربی ئەوە ئاسانتر بە بیرت دێتەوە. یان بە واتایەکیتر یەکەمجار پێویستە هەناسەیەکی قوڵ بدرێ ئەگەر ئەتەوێ بێزاری بەلاوە بنێی هەناسەیەکی قوڵ بدەرەوە، ئەوکات مێشك و بیرکردنەوەت بەکاربخە.

ج- مێشکی گەورە: بە شێوەیەکی قەد و لۆچ کەوتوەتە سەر یەکتری ئەم بەشەی مێشك تایبەتمەندی مرۆڤایەتی خودا بە مرۆڤی داوە هەموو کارکردنی ئەوپەڕی زیرەکی و بیرکردنەوە و قسەکردن و بینین و بیستن، لەم بەشەدا زانیاریەکان تۆمار دەکرێن. مێشکی گەورە پاسیتێکی زۆر گەورەی لە وەرگرتنی زانیاری و تۆمارکردندا هەیە.

لە مێشکی شوێنی زمان و تێگەشتن و بڕواپێهێنانە، هەروەها هەروەها کاری هونەری و نیگارکێشان و میوزیك و زانیاری نوێ شیدەکاتەوە و لەگەڵ زانیاریە پێشوەکاندا کە تیایدا ژیاوە بەراوردی دەکات.

هەرسێ بەشی مێشك پێکەوە کاردەکەن و یەك ئۆرگان پێکدەهێنن، مێشکی گەورە ناتوانێ ئەو هەموو شتانە لە پێکهاتەی مێشکدا ئەنجامبدات ئەگەر مێشکە خشۆك و مێشکە شیردەر ساغ و سەلامەت نەبن.

هەموو لێکۆڵەر و توێژەرانی مێشکی مرۆڤ سەبارەت بە گەورەی و کەپاسیەتی مێشك دەڵێن: لە ڕاستیدا ئێمە تەنیا بەشێکی زۆر کەمی مێشك بەکار دەهێنین، پرسیاری ئەوان ئێستا ئەوەیە چۆن مێشك داهێنەرانە بەکاردەهێنرێت.

یەکێك لە پێشەنگەکانی فێربوون لە ئەڵمانیا خاتوو ڤێرا ف. بریکنبێڵ کە چەمکی بەکارهێنەری مێشکی بەکارهێناوە دەڵێ: هەموو خاوەن کەسێکی مێشك دەبێ بە بەکارهێنەری مێشك تەنیا ئەگەر بزانێ چۆن بەکاری بهێنێ. مەبەستی بریکنبێڵ بەکارهێنانی هەردوو نیوە بەشی ڕاست و چەپی مێشکە لە فێربووندا کە بە -فێربوون بەپێی ڕێساکانی مێشك – ناویدەبات.

٢- دوو نیوە بەشەکەی مێشك: مێشکی گەورە بۆ دوو بەش دابەش دەبێ، کە پێی دەڵێن

-نیوەگۆ- هەردووکیان بە گورزە دەمارەوە بە ملیۆنان ڕێگە پێکەوە بەستراون کە بە دەمارەگرێ دەناسرێن. زانای ئەمریکی رۆگەر سپێری مانای ئەو دوو بەشبوونەی مێشکی دۆزیەوە، کە هەر نیوە بەشەی مێشك بە میتۆد و ڕێگەی جیاواز کاردەکەن و توانای کارکردن و ڕێکخستنیان وەك یەك نییە. نیوەی چەپ، لە بیرکردنەوەی ژیرانە و

لۆژیکیانە، شیکردنەوە و لێکدانەوە بەرپرسیارە، لە کاتێکدا نیوەی ڕاست لە خەیڵ، فەنتازیا، گۆترەکاری بەرپرسیارە.

لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێ ئەم تیۆرە بە ڕەهایی سەیر بکرێ، بە پێی تیۆری پیتەر ڕەسڵ، هەر بەشێك لەو دوو نیوە کاری تایبەت بە خۆیان هەیە، بەلام ناکرێ وا خەیاڵ بکرێ کەوا هەر بەشەی بە تەنیا بۆ خۆی کار دەکات بەڵکو هەردوو بەشەکە بە یەکترەوە گرێدراون، مرۆڤ توانای کارکردنی هەردوکیانی لە ژێر دەستدایە.

٣- پرۆسەی بیرکردنەوە لە پێکهاتەی تۆڕدا: هیچ کاتێك مێشکی مرۆڤ تەنیا بە هۆی نیوە بەشی ڕاست یان نیوە بەشی چەپ یان مێشکۆڵە کارناکا، هەمیشە بەشێك یان پتر لە پرۆسەی بیرکردنەوەدا بەشدار دەبن، ئەم بەشداربونەش بە پێی هەلومەرجی کارابوونی بەشەکانی تر بەپێی کلتورو ئاستی خوێندن و ژیانی مرۆڤەکە دەگۆڕێ. هەردوو نیوە بەشی مێشك چۆن پێکەوە کار دەکەن؟

تکایە بە هیچ جۆرێ تەسەوری فیلێکی پەمەیی خاڵداری شین مەکە چیت هاتە بەرچاوان؟ مێشکت لەگەڵ ئەم داواکارییەدا وێنەیەکی بەرهەمهێنان وشەی فیلێکی پەمەیی لە نیوە بەشی ڕاستی مێشکدا بروسکە خێرا بۆ وێنە گۆڕدا لە مێشکی بەهۆی تکایەکی داوای لێکراوە هەڵچونی پۆزەتیڤ بەهێزتر بکات.

باسی دووەم

١- هێڵکاری کاغەز: پەرە کاغەزەکە بە باری پانی، ناونیشانی باسە سەرەکیەکە لە ناوەڕاستی پەڕەکە بنوسە یان وێنە بکە، لە کاتی نوسین و وێنە کردندا پەڕەکە بسوڕێنە با هەر لەسەر باری خۆی بمێنێ بۆ ئەوەی دواتر بتواندرێ بخوێندرێتەوە و بکەوێتە بەرچاوان.

أ-لکەکان: لە ناوەڕاستیدا لکە ئەستورەکان دەکێشرێ ئینجا لکەکاندا، لك و پەلی وردتر و باریکتر لێدەبێتەوە، ئاگاداربە لە نێوان لك و پەلەکاندا بۆشای نەبێ، بەڵکو بەیەکیانەوە بنوسێنە بە بازنەی ناوەندی بابەتە سەرەکیەکەوە.

ب- وشەکان: کلیلە وشە بەکاربهێنە لە هەر هێڵێکدا تەنیا یەك وشە بنوسە، وشەکان بە جۆرێ بنوسە کە بە باشی بخوێندرێتەوە.

ج – ڕەنگەکان: ڕەنگ دەتوانێ هێلکارییەکەت برازێنیتەوە بابەتەکە جوانتر بکات، بابەتەکان بە هۆی ڕەنگی جۆراوجۆرەوە بابەت و بەشەکان جیاوازەکان لە یەك جیا بکاتەوە.

د – وێنە: هەوڵ بدە وێنەیەك یان هێمایەك لە جیاتی وشەکان دابنێی کە گوزارشتی لێ بکا.




باسی سێیەم: تەزوی شەپۆلی مێشك

ڕادیۆ و تەلەفزوێن بە هۆی شەپۆلی جیاواز بڵاودەبێتەوە، مێشکیش هەمان کار دەکات لە کاتی بیرکردنەوە شەپۆلی کارەبایی لاواز دەردەکەوێ ئەو شەپۆلانە چوار جۆرن:

بێتا: ئەمە شەپۆلی هەستە سیانزە بۆ بیست و پێنج ئەڵقە لە چرکەیەکدا، لە کاتی هۆشیاری و بە ئاگابوون، تەرکیزکردن، بیرکردنەوە، لێکدان و قسەکردن چالاکانەدا هەیە.

ئەلفا: شەپۆلی تەزووی مێشك لە کاتی خاوبونەوە و ڕاماندا دەردەکەوێ، لە هەشت بۆ دوانزە ئەڵقە لە چرکەیەکدا لە کاتی خەیاڵکردن و دونیای خەیاڵ و فەنتازیا و خاوبونەوەدا هەیە.

سێتا (گاما): ئەم شەپۆلە لە کاتی خەیاڵی زۆر قوڵ و یان سەرتای خەولێکەوتن دەردەکەوێ، ئەم شەپۆلە هەستە چوار بۆ حەوت ئەڵقە لە چرکەیەکدا.

دێتا: شەپۆلەکانی مێشك لە کاتی خەوتنی زۆر قووڵی بێ خەونن لە نیو بۆ سێ ئەڵقە لە چرکەیەکدا.

کامە شەپۆل بۆ فێربوون لەبار و باش؟ ئەمە بە زۆر هۆکار بەستراوەتەوە، ئەگەر باسێکی زانستیت بە دەستەوە بێت بۆ تێگەیشتن بە قووڵی شەپۆلی بێتا بۆ تەرکیزکردن لەسەر

شتێکی دیاریکراو یان کێشەیەك کار دەکات. ئەلفا بۆ حاڵەتی زانیاری وەرگرتن لە بارە، هەموو شارەزایان دەڵێن ئەلفا دەرگای نەستمان بۆ دەکاتەوە. چونکە کەمێك خاوبونەوە و وریایەکی بە ئاگا بۆ وەرگرتنی زانیاری و گەیشتن بە تۆمارکرەی یادی درێژخایەن بە تەواوی گونجاوە وەك فێربونی زمانی بیانی.

باسی چوارەم

ڕۆڵی هەست و سۆز لە پرۆسەی فێربوندا: منداڵ هەر ڕۆژێك لە خەو هەڵدەستێ جوڵەیەکی نوێ و وشەیەکی نوێ دەردەبڕێ، هەرکاتێك شتێکی نوێ فێردەبێ زۆر کەیف خۆش دەبێ، بە داخەوە لە کاتی چونە خوێندنگا ئەو کەیف و خۆشیەی بۆ فێربوون نامێنێ، کاتێ نوسین و خوێندن فێر دەبێت ئەو خۆشیەی پێنادات، بۆچی؟ ئایا چۆن دەکرێ نوسین و خوێندن لە خوێندگە، خۆشی و کەیفی ببەخشن؟

یەکێ لە هۆیەکانی ئەوەی منداڵ زو فێردەبێ و پێی خۆشحاڵ دەبێ ئەوەیە کە هێشتا هەڵسەنگاندنی پێشوەختەی نییە، لێپرسینەەی نییە. منداڵ نازانێ یاری و کارکردن دوو شتی لە یەك جیاوازن. لە ڕاستیدا یاری بەشێکە لە فێربوون، مرۆڤ زانیاریەکان باشتر وەردەگرێ. گێراڵد ئێدلان، خاوەنی خەلاتی نۆبڵ، سەرپەرەشتیاری بەشی دەرمانسازی لە زانکۆی La Jolla لە کالیفۆرنیا دەڵێ: مێشك جەنگلستانێکی زیندووە بە پێی یاسای جەنگەڵ: ژیان و مانەوە لە ژیان، مێشکیش بۆ مانەوە لە ژیان لە فێربوون وەستایە ئەوەی پێویستە بۆ ژیان فێری دەبێ.

ئێمە ئەو کاتە بە چاکی فێردەبین ئەگەر بۆ خۆمان کارمان لە گەڵیدا کرد، بۆ خۆمان مانا و بایەخی شتەکانمان بدۆزینەوە، ئەگەر ئێمە شێوازی کەسی خۆمان تێیدا بەکار هێنا نەك وەڵامی پرسیارەکان حازر بە دەست لە مامۆستاکان وەربگرین، مێشك ئەوکاتە بە ئاگادێ. لە خوێندنگەدا ئێمە سۆز لە لۆژیك جیادەکەینەوە، بەڵام ئەمانە وەك دوو رووی یەك پارەن ناکرێ جیابکرێنەوە، ناکرێ هەست و سۆز لە گرینگترین شتەکانی ژیان جیابکرێتەوە لەبەر زۆر هۆ ناکرێ هەست و سۆز لە فێربوون و پەروەردە جیابکرێتەوە. بۆ نمونە زۆر زانیاری بە نێو ناوەندی مێشکە شیردەردا (هەستدا) تێدەپەڕن و دەگەنە مێشکی گەورە و لەوێشەوە دەگەڕێنەوە ئەگەر ئەم ناوەندە هەستە کار نەکات ئەوا گرێبەندەکانی مێشك دەپچڕێن و پرۆسەی بیرکردنەوە و بەبیرهێنانەوە نامێنێ و دەوەستێ.

هەندێکجار لە کاتی بونی هەڕەشە و ترس ئەو زانیاریانە نانێرێتە مێشکی گەورە تا تاقیبکرێتەوە ئەوجا کاردانەوە بکات بەڵکو یەکسەر بۆ بەشە سەرەتاییەکانی مێشك دەنێردرێن، ئەمیش ڕاستەوخۆ کاردانەوە بەرانبەر بەم هەڕەشەیە پێشاندەدات. هەروەك مرۆڤ کاتێك لە مارێك دەترسێت دەمودەست خۆی لێ لادەدات.

لویز ماخادۆ دی ئەندرێد مامۆستای پەروەردە لە زانکۆی Rio De Janeiro توێژینەوەی لەسەر میکانیزمی چۆنیەتی بەشداری پێکردنی مشکە شیردەر لە پرۆسەی فێربووندا کردووە، لە کتێبەکەیدا مێشکە شیردەر بە ناوەندی کارگێڕی مێشك وەسف دەکات و بە بناغەی زیرەکی دادەنێت، جەخت لەوە دەکاتەوە کە مامۆستا دەبێ سۆزی فێرخواز بجوڵێنێ بۆ ئەوەی تواناکانیان باشتر بە گەڕ بخات. هەروەها پرۆفیسۆر ڕۆبێۆت سیلوێستەر مامۆستای پەروەردە لە زانکۆی ئۆریگن دەڵێ: سۆز ڕۆڵێکی گرنگی لە پرۆسەی فێربوندا هەیە مێشك ڕۆڵی هۆشداری دەبینێ، ئێمە بە تەواوەتی لە سۆز تێنەگەیشتوین بۆیە نازانین چۆن لە خوێندنگە لەگەڵ سۆزدا بجوڵێینەوە. ئەگەر مێشکە شیردەر هەست بە ئارامی بکا و لە باری پۆزەتف دابێت ئەوە بیرهاتنەوە لە باشترین حاڵەتی خۆیدا دەبێ.

کەش و هەوای ژووری خوێندن پێویستە زۆر هاوڕێیانە و پڕ لە سۆز و خۆشەویستی دڵنیای بێ. زۆرجار گوێمان لێدەبێ فێرخوازێك دەڵێ: لە ناو تاقیکردنەوەو هیچم بۆ نەهات و هەموویم بیرچوبوەیەوە، هۆی ئەمە بوونی ترس و پچڕانی گرێبەندەکانی نێوان خانەکانی مێشکە کە بۆ بە بیرهاتنەوەی زانیاریەکان زۆر پێویستن.

ئەو نۆ جۆرە زیرەکییە چین کە پێویستە مامۆستا لە خوێندنگەدا لەبەرچاو بگرن؟

زۆرجار زیرەکی بە ئەنجامدان لە تاقیکردنەوەیەک یان نمرەکان لە خوێندنگە پێناسە دەکرێت، بەڵام لە پەروەردەی نوێدا تێدەگەین لەوە زیاتریش دەڕوات. هەرچەندە هەبوونی زانیاری و لێهاتوویی بەسوود بەشدارە لە زیرەکی مرۆڤ، بەڵام تیۆری زیرەکی فرەیی دەروونناس هاوارد گاردنەر پێشنیاری ئەوە دەکات کە زیرەک بوون تەنها لە بیرکاری و ئینگلیزیدا باش بیت یان فێربوونی زمانی دووەم نیە بەڵکو گاردنەر زیرەکی بە یەک توانای گشتی پێناسە ناکات، بەڵکو لەبری ئەوە دابەشی دەکات بەسەر نۆ جۆر زیرەکی جیاوازدا. لە کاتێکدا ڕەنگە کەسێک بە تایبەتی لە بوارێکدا زیرەك بێت، وەك زیرەکی بیرکاری لەو جۆرە، بەڵام لە ڕاستیدا خاوەنی کۆمەڵێک توانا دەبێت لە چەندین جۆری زیرەکیدا.

پێویستە لە خوێندنگەکانماندا پرۆگرامێك پێشکەش بکەین کە فێرخوازان بتوانن پەرە بەم نۆ جۆرە زیرەکییە بدەن و فێری خاڵە بەهێز و لاوازەکانیان بن، ناسینی ئەم جۆرە زیرەکیانە یارمەتیان دەدات لە پێگەی خۆیان تێبگەن لە جیهاندا و بڕیار بدەن کە حەز دەکەن کام پیشە هەڵبژێرن. لەم بەشەدا، بە وردی باس لەو نۆ جۆرە زیرەکییە دەکەین کە لە لێکۆڵینەوەکانی گاردنەردا هاتووە، تایبەتمەندییەکانی هەریەکەیان دەخەینەڕوو بۆ ئەوەی خەڵک لەوە تێبگەن کە لە نۆ جۆری زیرەکی خاوەنی کامیانن.

تیۆری زیرەکی فرەیی (MI) چییە؟ تیۆری هاوارد گاردنەر لەبارەی فرە زیرەکیەکانەوە پێشنیاری ئەوە دەکات کە مرۆڤەکان بەو هەموو زیرەکییەی کە هەرگیز هەیانبێت لەدایک نابێت و هەموو کەسێک بە شێوازی جیاواز زانیارییەکان پرۆسێس دەکات. بە واتایەکیتر، ئێمە بە درێژایی ژیانمان، تەنانەت دوای تەواوکردنی خوێندنی فەرمی، بەردەوام فێر دەبین و بە شێوازی جیاواز گەشە دەکەین.

نۆ جۆری زیرەکی هەن؟ نۆ جۆری زیرەکی هاوارد گاردنەر بریتین لە زیرەکی: لۆژیکی و بیرکاری – زمانەوانی – کۆمەڵایەتی – کەسی- مۆسیقی- بینراو و فەزایی -جەستەیی و جوڵەیی – سروشتناسی – بوونگەرایی.

١. زیرەکی لۆژیکی-بیرکاری: ڕەنگە لە نێو نۆ جۆری زیرەکیدا دیارترینیان بێت، زیرەکی لۆژیکی-بیرکاری ئاماژەیە بۆ توانای کەسێک بۆ چارەسەرکردنی کێشە بیرکارییەکان و دەستنیشانکردنی ڕەوت و نەخشەکان و تێگەیشتن لە پەیوەندییەکان. ئەگەر کەسێک خاوەنی زیرەکی لۆژیکی-بیرکاری بێت ئەوە مانای وایە کە ڕێکخستنی زۆر لە پرۆسەی بیرکردنەوەدا دەردەکەون و دەتوانێت بە شێوەیەکی چەمکی و ئەبستراکت بیربکاتەوە.

فێرخواز زیرەکی لۆژیکی-بیرکاری بەرزی هەیە ئەگەر: فێرخواز باشە لەگەڵ ژمارەکان و متمانەیان بەخۆیان هەیە لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی کە بریتین لە ژماردنی شتەکان، وەک پرسیارەکانی بیرکاری و ژمێریاری. چێژ لە ئەنجامدانی تاقیکردنەوە و ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان وەردەگرن. چێژ لە یاریکردنی یارییە لۆژیک و ستراتیژییەکان وەردەگرن. چێژ لە چارەسەرکردنی مەتەڵەکان و هەڵدانەوەی نهێنییەکان وەردەگرن. پەرۆشی پاڵیان پێوەدەنێت بۆ ئەوەی پرسیاری گەردوونی یان قووڵ بکەن.

پیشە گەورەکان بۆ ئەو کەسانەی کە زیرەکی لۆژیکی-بیرکارییان هەیە بریتین لە بیرکاریزان، ئابووریناس، وردبینیکەر، ژمێریار، زانا، تاکتیکزان، تەکنیکار، شیکارکەری کۆمپیوتەر.

٢. زیرەکی زمانەوانی: زیرەکی زمانەوانی توانای کەسێکە بۆ بەکارهێنانی وشەکان بە شێوەیەکی کاریگەر. مەرج نییە ئەمە بە مانای فێربوونی زمانێکی تر بێت، کەسێک کە بە شێوەیەکی شارەزایانە و تایبەتی زمانێک بەکاربهێنێت، توانای بەکارهێنانی وشەی دروست و دەربڕینی وشەسازی هەبێت، جۆرێکی کارامەیی ناوازەیە لە زیرەکی کە دەتوانرێت لە چەندین سیناریۆی جیاوازدا بەکاربهێنرێت.

زیرەکی زمانەوانی بەرزیان هەیە ئەگەر: فێرخوازان ئاسوودەن هەم لە قسەکردن و هەم لە نووسیندا، وشەکان بەکاردەهێنن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی وەک ڕازیکردنی خەڵك. وشەسازییەکی فراوانیان هەیە و تێدەگەن کەی و چۆن هەندێک وشە بەکاربهێنیت. چێژ لە خوێندنەوە و نووسین وەردەگرن. چێژ لە یاری وشەسازی وەردەگرن. تێگەیشتنێکی ئاسانیان لە زمان یان زاراوەی تر هەیە.

پیشە گەورەکان بۆ ئەو کەسانەی کە زیرەکی زمانەوانییان هەیە بریتین لە وتاردەردان، ڕۆمانوس، شاعیر، سیاسەتمەدار، بێژەری ڕادیۆ، پێشکەشکاری تەلەفزیۆن، یوتیوبەر، ڕۆژنامەنووس، پارێزەر، پزیشکی دەروونی، نووسەر یان فرۆشیار.

٣. زیرەکی کۆمەڵایەتی: زیرەکی کۆمەڵایەتی یان زیرەکی سۆزداری ئاماژەیە بۆ پەیوەندی نێوان زیرەکی و سۆز. کەسێک کە زیرەکی کۆمەڵایەتی هەبێ، ئەمجۆرە فێرخوازانە زیرەکن لە چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ چواردەوریان بە شێوەیەکی باش و دروست، ئەمەش دەتوانرێت ببەسترێتەوە بە هەردوو توانای پەیوەندیکردنی زارەکی و نازارەکی.

زیرەکی کۆمەڵایەتی بەرزە: ئەگەر فێرخوازەکە باشبێت لە دەستنیشانکردنی جیاوازی لە نێوان کۆمەڵێک کەسەکاندا. بازنەیەکی فراوانی هاوڕێی هەیە و ئاسوودەیە لەگەڵ کەسانی نوێدا. باشە لە هەستکردن بە باری دەروونی خەڵک. خاوەنی توانای ئەوەیە کە لە ڕوانگەی جیاوازەوە سەیری شتەکان بکات، لە ڕوانگەی کەسانی دیکە تێدەگات.

پیشە گەورەکان بۆ ئەو کەسانەی کە زیرەکی نێوان کەسییان هەیە بریتین لە سەرچاوە مرۆییەکان، ڕاوێژکار، بەڕێوەبردن، دەروونناس، پەیوەندییە گشتییەکان، بەڕێوەبەری کۆمەڵایەتی، مامۆستا یان توێژەری کۆمەڵایەتی.

٤. زیرەکی کەسی: زیرەکی کەسی ئاماژەیە بۆ خۆئاگاداری و توانای مرۆڤەکان بۆ تێگەیشتن لە خۆیان. ئایا تێدەگەیت کە هەست بە چی دەکەیت و بۆچی هەستی پێ دەکەیت؟ هەروەها زیرەکی کەسی بریتییە لە قەدرزانی و ڕێزگرتن لە بارودۆخی مرۆڤ، بە گشتی

مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی دیکە بەو شێوەیەی کە حەز دەکەیت خۆت مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت.

زیرەکی کەسی بەرزی هەیە ئەگەر: پاڵنەری خودی خۆی هەیە و دەتوانێت خۆی بخاتەوە پێشەوە لە کاتی پێویستدا. ئیرادە بەهێز و سەربەخۆیە. هەنگاو دەنێیت بە پشتبەستن بە هەستەکانی. چێژ لە تەرخانکردنی کات بۆ خۆی وەردەگریت کەسێکی زۆر خۆڕاگرە.

پیشە گەورەکان بۆ ئەو کەسانەی کە ئەم جۆرە زیرەکییەیان هەیە بریتین لە دەروونناس، نووسەر، چارەسەرکەر، ڕاوێژکار، توێژەری کۆمەڵایەتی، زانای ئایینی، خاوەنکار یان شاعیر.

٥. زیرەکی میوزیك: زیرەکی موزیك لە نۆ جۆری زیرەکیدا ئاشکراترینیانە، ئاماژەیە بۆ توانای کەسێک بۆ هەستکردن بە ڕیتم و دەنگ و بەکارهێنانی ئەمانە بۆ دروستکردنی میوزیك.

ئاستێکی بەرزی زیرەکی میوزیکیان هەیە ئەگەر: دەتوانێت بە ئاسانی پەستان و ڕیتم و تۆن و زەنگی دەنگەکان بشکێنیت. تۆنەکان دەناسێتەوە، دروستی دەکات یان بیری لێدەکاتەوە و زۆری خۆشدەوێت ئەو کارە بکات. ئاسوودەیە بە ژەنینی میوزیك لە پاشبنەمادا لەکاتێکدا کارەکانیتر دەکات. زۆر هەستیارە بەرامبەر بە دەنگەکان، گوێی لەوە دەبێت کە ئەوانی تر بیری دەکەن.

پیشە گەورەکان بۆ ئەو کەسانەی کە زیرەکی مۆسیقایان هەیە بریتین لە بەڕێوەبەر، مۆسیقاژەن، مامۆستای پیانۆ، ئاوازدانەر، مامۆستای سەما، چارەسەرکەری مۆسیقا یان بەڕێوەبەری کۆڕاڵ.

٦. زیرەکی بینین: زیرەکی بینین ئاماژەیە بۆ توانای مرۆڤەکان بۆ بینینی جیهان لە سێ ڕەهەندەکەیدا. لە کاتی باسکردنی بینینی جیهان بە شێوەی سێ ڕەهەندی، ئەم توانایانەی خوارەوە لەخۆدەگرێت: وێنەی دەروونی – توانای کێشانی وێنەیەک بەبێ هاندەرێکی دەرەکی، وێنەکێشان لە یادەوەری یان ئەزموونی پێشوو. بە واتایەکی تر وردەکاری خەیاڵی کەسێک. ئیستدلالکردنی فەزایی – توانای بیرکردنەوە لە شتەکان بە شێوەی سێ ڕەهەندی و کێشانی گشتاندنەکان سەرەڕای هەبوونی زانیاری سنووردار. باسی هەرەمێک بکە، ئەو کەسانەی کە زیرەکی بینراو-فەزاییان هەیە دەتوانن لە پێشەوە

یان سەرەوە ببینن کە ئەو هەرەمە چۆن دەردەکەوێت. دەستکاریکردنی وێنە – توانای بینینی گۆڕانکارییەکان لە وێنەیەکدا پێش ئەوەی جێبەجێ بکرێن. بۆ نموونە هونەرمەندێک پێش ئەوەی وێنەکەی بکێشێت، بە چاوی خۆی نیشان دەدات کە وێنەکەیان چۆن دەبێت. کارامەیی هونەری – توانای دروستکردنی کاری هونەری، ئەمەش کارامەیی گرافیکیش دەگرێتەوە. زیرەکی بینراو-فەزایی و داهێنان دەست بە دەست کاردەکەن، سوود لە خەیاڵێکی چالاک وەردەگرن بۆ بەرهەمهێنانی کاری بینراوی سەرنجڕاکێش.

زیرەکی بینراو-فەزایی بەرزی هەیە ئەگەر: هۆشیارییەکی بەرزی هەیە بۆ ژینگەی دەوروبەرت. هەستێکی باشی هەیە بۆ ئاراستەکردن. چێژ لە یاریکردنی مەتەڵ و یارییەکانی جیگسۆ وەردەگرێت کە لە دەوری گەشتکردن دامەزراون زۆر خەونی ڕۆژانە دەبینێت. چێژ لە داهێنەربوون وەردەگرێت.

پیشە گەورەکان بۆ ئەو کەسانەی کە ئەم جۆرە زیرەکییەیان هەیە بریتین لە تەلارساز، مامۆستای ئەندازەیی، ئەندازیار، ڕووپێوکار، پلاندانەری شار، هونەرمەندی گرافیک، دیکۆراتی ناوەوە، فۆتۆگرافەر، فڕۆکەوان یان نەخشەکێش.

٧. زیرەکی جەستەیی-لاشەیی: زیرەکی جەستەیی-جوڵەیی ئاماژەیە بۆ هەماهەنگی دەروون و جەستە و لە وەرزشواناندا زۆر گرنگە. زۆرجار توانای وەرزشی بە زیرەکی ناوزەد ناکرێت، بەڵام زیرەکی جەستەیی بە توانای کەسێک دەپێورێت بۆ بەکارهێنانی جەستەیی خۆی بۆ دەستکاریکردنی شتەکان و توخمەکانی تری دەوروبەری.

زیرەکی جەستەیی-جوڵەیی بەرزی هەیە ئەگەر: توانا و سنوورە جەستەییەکانی دەناسێتەوە. دەتوانێت بە بەکارهێنانی زمانی جەستە بە باشی پەیوەندی بکات، بە بەکارهێنانی ئاماژە و کردار بۆ گەیاندنی پەیامەکانی. هیچ کێشەیەکی ڕاستەقینەی نییە لەگەڵ بەرکەوتنی جەستەیی. هەستێکی باشی هەیە بۆ کاتی دیاریکراو کاتێک باس لە ئەرک و چالاکییە جەستەییەکان دەکرێت. دەتوانێت بە پلەیەکی بەرزی لێزانی و کۆنترۆڵ و ئابووری جوڵە مامەڵە لەگەڵ شتەکاندا بکات. حەزی لە کاری داهێنەرانەیە بە دەستەکانی. چالاکییەکانی دەرەوەی پرۆگرام و وەرزشی ڕێگەیەکی خەیاڵییە بۆ باشترکردنی زیرەکی جەستەیی-جوانکاری. ئەم چالاکییانە نەک هەر فەزایەک بۆ پەرەپێدانی کارامەیی وەرزشی پراکتیکی دەڕەخسێنن، بەڵکو پەرەپێدانی کارامەیی کۆمەڵایەتی گرنگ و بەگشتی ئاستی ئەکادیمی بەرز دەکەنەوە.

پیشە گەورەکان بۆ ئەو کەسانەی کە زیرەکی جەستەیی-جوانکارییان هەیە بریتین لە چارەسەرکەری جەستەیی، سەماکار، وەرزشوان، مامۆستا، مامۆستای لەشجوانی، خاوەن هۆڵی وەرزش، ئەکتەر، میکانیک یان دارتاش.

٨. زیرەکی سروشتناسی: زیرەکی سروشتناس ئاماژەیە بۆ توانای خوێندنەوە و تێگەیشتن لە سروشت. هەبوونی هەستیاری بەرامبەر بە توخمە نازیندووەکانی هەموو زیندەوەران بە "زیرەکی سروشت" دادەنرێت.

زیرەکی سروشتناسی بەرزی هەیە ئەگەر: سروشت و بەسەربردنی کاتەکانی لە دەرەوە خۆشدەوێت. بە ئاسانی پەیوەندی لەگەڵ ژینگە و ئاژەڵەکاندا هەیە، باشە لە بەخێوکردن یان گرنگیدان بە ئاژەڵ و ڕووەک.

 پیشە گەورەکان بۆ ئەو کەسانەی کە زیرەکی سروشتناسیان هەیە بریتین لە ڕووەکناس، ئۆقیانوسناس، ڕاوێژکاری کەمپ، سەرۆکی سەربازی سکاوت، باخەوان، فەلەکناس، کەشناسی، جیۆلۆجی.

٩. زیرەکی بوون: زیرەکی بوون ئاماژەیە بۆ هەستیاری قووڵ و توانای مرۆڤەکان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پرسیارە قووڵەکانی وەک مانای بوون، یەکێکە لە ئاڵۆزترین جۆری زیرەکی کە لە لێکۆڵینەوەکانی گاردنەردا هاتووە. کەسانی خاوەن زیرەکی وجودی نەک هەر ئاسوودەن لە قسەکردن لەسەر ئەم پرسیارە جددیانە بەڵکو هەوڵدەدەن بۆ دۆزینەوەی وەڵامەکە.

زیرەکی بوونی هەیە ئەگەر: بەڕاستی دەیەوێت وەڵامی پرسیارەکانی وەک "مانای ژیان چییە؟" یان "دوای مردن چی ڕوودەدات؟" هەستیارییەکی بەرزی لەسەر بابەتەکانی پەیوەست بە بوونی مرۆڤ نیشان دەدات. پیشە گەورەکان بۆ ئەو کەسانەی کە زیرەکی بوونیان هەیە بریتین لە قسەکەری ئیلهامبەخش، نووسەر، پیاوانی ئایینی، نووسەر، فەیلەسوف، ئابووریناس یان بلۆگەر.

ئەم بابەتە پێویستە یارمەتیت بدات باشتر لە نۆ جۆری زیرەکی تێبگەیت و خاڵە بەهێز و لاوازەکانی فێرخوازان لە کوێدایە. ئەگەر دەتەوێت زیاتر بزانیت دەربارەی ئەوەی کە چۆن جۆرە جیاوازەکانی زیرەکی، دەتوانیت لە ماڵپەڕەکانی پرۆگرامی خوێندنگەکان و شێوازی فێربوونی ناوازە بکۆڵیتەوە.

فێربوونی چالاکانە: فێربوونی چالاکانە هەموو توانا فێربوونت پیدەدا تا بلیمەتیەکەت دەدەکەوێ کە هەر یەکێك لە ئێمەدا شاراوەیە. شەشە هەنگاوەکانی فێربوونی مێشك:

یەکەم: ئامادەکردن و بەشدارییێکرنی مێشك: بەر لە دەستپێکردنی هەر باباەتێکی فێربوون وا باشترە مێشکی خۆت بەتاڵ بکەی، لە ترس و سترێس و دڵەڕاوکێ. بە باوەڕبەخۆبونەوە دەست بە خوێندن بکەیت. شەش هەنگاوەکانی فێربوونی مێشك:

١- ئامادەکردن و بەشدارییێکردنی مێشك: بەر لە دەستپێکردنی هەر بابەتێکی فێربوون وا باشترە مێشکی خۆت بەتاڵ بکەی، لە ترس و دڵەڕاوکێ. بە باوەڕبەخۆبونەوە دەست بە خوێندن بکەیت و خۆت بۆ خوێندن هانبدە، هەموو مەیت و مێشکی داهێنەرانەت بخە گەڕ. دیاریکردنی ئامانج و مەبەستی فێربوون مەرجی سەرکەوتنی باش فێربونتە، دەبێ بزانی دەتەوێ چی فێر ببیت؟ بۆچی فێر دەبی؟ دەبێت بە هۆشاریەوە باوەت بەو ئامانجە خۆت هەبێ. بەر لە دەستپێکردنی فێربوون دەبێ بزانی کۆتایی سەرکەوتنەکانت بە چیت دەگەیەنێ.

٢- هەڵبژاردنی میتۆدی فێربوون: شتە بنچینەکانی هەر بابەتێکی فێربوون پێویستە بەو جۆرە وەربیگری کە پێت خۆشە، باشتر تێیدەگەی لەگەڵ ئەوەی زۆر شتی ستراتیژی هاوبەش هەن کە پرۆسەی خوێندن ڕێکدەخەن، بەلام شێواز و حاڵەتی تێگەشتن لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر جیاوازە.

٣- گەڕان بە دوای مانادا: مارك تواین دەڵێ: کەسێك پشیلەی بە کلکەوە گرتبێ زۆرتر دەرابرەی پشیلە دەزانێ کە تەنیا هەندێ شتی دەربارەی پشیلە خوێندبێتەوە. بۆ ئەوەی زانیاریەکان لە مێشکا تۆمار تۆمار بکەی دەبێ هەوڵبدەی یەکەمجار دەر ئەنجام و ماناکەی هەڵبسەنگێنی. واتە حیکمەت و مەبەستی تەواوی زانیاریەکان بدۆزیتەوە.

٤- هێزی بزوێنەری مێشك: لە کاتی فێربوونی هەر باەبەتێکدا مرۆڤ دەبێ زۆر ژمارە، هۆکار، ناو، پێناسە و مێژوو لەبەر بکا و لە بیریان نەکا، واتە لە تۆمارکەری یادی درێژخایەندا تۆماریان بکا تا لە کاتی پێویستیدا بە بیری خۆی بهێنێتەوە. گرنگە هەر زانیاتریەکی نوێ کە تازە وەریدەگری بە زانیاریە کۆنەکانی ببەستیتەوە.

٥- هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی ئەوەی فێریبووی: بۆ ئەوەی بزانی ئەوەی خوێندوتە بە ڕاستی فێریبووی و تێیگەشتوی، ئەوە دەبێ تێستی بکەی و هەڵیبسەنگێنی، باشترین ڕێگەش بۆ ئەمە تاقیکردنەوەیە، یان لە گەڵ هاوڕێکەت پێکەوە پرسیار لە یەك بکەن.

٦- لابردنی بەربەستەکانی فێربوون: فێرخواز دەبێ بۆ خۆی پرۆسەی فێربوون و فێربوونی خۆی شیبکاتەوە و تاوتوێی بکا بزانێ کامە کێشەی هەیە، کامە میتۆدی فێربوون بۆ ئەو گونجاوە؟ کامە تەکنیکی فێروون باشە، لە چ کاتێکدا باشتر فێردەبی، زەحمەتییەکان چین و چارەیان چییە؟

چارڵس هاندی دەڵێ: فێربوون  تەنیا ئەوە نییە، وەڵامی پرسیارەکان بزانی. هەر کێشەیەك هۆی تایبەتی خۆی هەیە بە لابردنی هۆیەکان کێشەکە نامێنێ، ئەوکێشانەی لە پرۆسەی فێربووندا دێتە پێش چارەیان ئاسانە، بەڵام دەستنیشانکردنی کێشەکە مەرجێکی گرنگە بەر لە چارەکردنی.

ئەگەر هەستت کرد ئارەزووی خوێندنت کەمتر بوەتەوە، ئەوە جارێکیتر بە قوڵی بیر لە مەبەست و ئامانجی فێربوونت بکەرەوە.

بەشی سێیەم

خوێندنەوەی خێرا: لەبەر ئەوەی بەشێکی زۆری فێربوون و زانیاری وەرگرتن لە ڕێگەی خوێندنەوەیە، بۆیە دەبێ ئێمە ڕاهاتنمان لە سەر خوێندنەوەی لاسایی بگۆڕین بۆ بەکارهێنانی زۆر جۆر و تەکنیك و میتۆدی نوێ بە تایبەت خوێندنەوەی خێرا. بۆ ئەوەی بتوانین باشترین زانیارییەکان هەڵبژێرین و خێراتر بە دەستیان بهێنین و پتر لە یادمان بمێنێتەوە، پێویستە بە پێی پلان و بەرنامەیەکی دارێژراو دەست بە ڕاهێنان و فێربوونی خێرا بکەین.

باسی یەکەم : خوێندنەوەی خێرا: شارەزابونە بە کێشە، زەحمەتیەکانی خوێندنەوە، تێکست تێگەشتن، بەکارهێنانی هێڵکاری یاد، خوێندنەوەی خێرا و تێگەشتن وەك ڕەهەندێکی نوێی بیرکردنەوە.

خێرایی خوێندنەوە = ووشە/ خولەك. بەرزترین تۆماری جیهانی بۆ خوێندنەوەی خێرا ئێستا لە ١٥٠٠ وشە تا ٣٨٥٠ وشە/ خولەك دایە.

باسی دووەم: چاو یەکێکە لە کارە سەرسوڕهێنەرەکانی گەردوونە، خودا ئەم ئامێرە پڕ بایەخەی بە مرۆڤ بەخشیوە، مرۆڤیش دەتوانێ کۆنترۆڵی بکا و بە چاکی بەکاری بهێنێ. لە کاتی خوێندنەوەدا چاو بەسەر وشەکانی لاپەڕەیەکدا ناخلیسکێ بەڵکو بازدانی بچوك بەسەر وشەکاندا دەکات، ئەمە وا دەکات وەستان هەبێ لە نێوان هەر بازدانێکی چاودا.

بە کورتکردنەوەی ئەو کورتە وەستانانە لە نێوان جوڵەی چاو لە وشەیەکەوە بۆ وشەیەکیتر، دەتوانێ خێرای خوێندنەوە بگاتە خێرایی مەبەست. خوێنەری خێرا ناگەڕێتەوە بۆ دواوە، بەڵکو بازدانی خوێندنەوەکەشی درێژ دەکاتەوە، واە بە چاو تێبڕینێك لە جیاتی وشەیەك چوار بۆ پێنج وشە وەردەگرێ.

باسی سێیەم: تێگەشتنی تێکست: خوێندنەوەی لەسەرخۆ بۆ تێگەشتن وەحمەتی دەداتە مێشك، لەبەر ئەوەی وێنەکەی بە تەواوی و بە زوویی پێیناگا لە کاتی خوێندنەوەی خێرادا هەموو ڕستەکان پێکەوەن زانیارییەکان بە مانای تەواو دەگەیەنێتە مێشك ئەویش باشتر تێدەگا.

باسی چوارەم: هەلومەرجی دەرەکی و ناوەکیەکانی خوێندنەوە: چەند هەلومەرجێکی دەرەکی و ناوەکی ڕۆڵی کاریگەریان لە سەر خوێندنەوە هەیە:

أ: هەلومەرجە دەرەکیەکانی خوێندنەوە:

-جێگای کار: دەوروبەر کاریگەری لەسەر توانای ئەنجامدانی ئەرك و کاردا هەیە، دەبێ جێگای خوێندنەوەکەت گونجاو بێت.

- ڕوناکی: باشترین ڕوناکی بۆ خوێنجنەوە ڕوناکی ڕۆژە، بۆیە ئەوەندەی دەکرێ لە نزیك چەنجەرەدا بخوێنەرەوە، گەر شەویش بوو یان لە تاریکیدا بوو دەبێ ڕوناکیەکە بەسەر شانتدا تێپەڕیت و بەر ئەو دەستەت بکەوێ کە پێی دەنوسی، دەشتوانی گڵۆپی سەر مێز بەکار بهێنیت.

- دەوروبەر: بۆ ئەوەی بیرت ئاسوجە بێ، ئەو مادانەی پێتدەدرێ لەبەر دەستدابێ، ئەمە تەرکیزکردن، تێگەشتن و باری دەرونیت باش دەکات.

- هەڵکەوتنی شوێنی دانیشتن: شوێنی دانیشتن یەکجار خۆش نەبێ، نابێ نە زۆر ڕەق بێت و نە زۆر نەرم، دەبێت بە قینج و قیتی لەسەر کورسی دابنیشیت، بەرزی کورسی و مێزی نوسین گرنگە، کورسیەکە هێندە بەرز بێت تا ئاستی ڕانەکانت بن.

ب- هەلومەرجە ناوەکیەکانی خوێندنەوە:

- کات: کاتی دروست بۆ خوێندنەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە، بەڵام بە گشتی کاتی خوێندنەوە بەیانیان زووە.

- ئارامی: دەنگەدەنگ و نا ئارامی دەبێە هۆی تێکچونی تەرکیزکردن. هەر کاتێ بیر لە کێشەیەك بکەیتەوە یان هەست بکەی ڕەوشی لەشت تەوا نەبێ، ئەمانە دەبنە هۆی کەمبونونەوەی تەرکیز و تێگەشت.

- هەستکردن بە تەندروستی: پێویستە زۆر ئاگاداری تەندروستیت بیت، نەهێڵیت کەمترین نەخۆشیت توش ببێت.  خۆپاراستن و وەرزشکردن پێویستیەکی گرنگە.

باسی پێنجەم

خوێندنەوە بە هۆی یاریدەوە

لە منداڵیدا بە هۆی پەنجەمانەوە دەخوێنینەوە و ئاگایی و تەرکیزمان باشتر دەبوو، بەڵام ئەمە دەبێتە هێواش بوونی خوێندنەوە باشترین ئامراز بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێنانی قەڵەم یان چیلکەدارێکی باریك، ڕێگەی بینینت لێناگرێ هەروەها سوکە و بە ئاسانی دەجوڵێ. بەمە دەگوترێت ئامرازی یاریدەدەر.

دوو جۆری هێزی بینین هەیە: ئەگەر چاو ببڕیتە خاڵێکی بەرانبەرت بە ئاسۆیی بە ڕاست و چەپدا بڕوانی بۆت دەردەکەوێ مەودایەکی کەم دەبینی، خۆ ئەگەر بە ئەستونی بەلای سەرەوە و خوارەوە تەماشا بکەی دیسان گۆشەی بینینی چاوت بە بێ جوڵانی سەرت بوارێکی کەمە.  ئەو ڕوبورەی دەکەوێتە بەر بینایی پێدەگوترێ ڕوبەری نیگا.

خوێندنەوە بە هۆی مێشکەوە: ئەو میتۆدە نوێیەی خوێندنەوەی خێرا کە پێشکەشدەکرێ، خوێندنەوەی شتێکە کە جێگای بایەخ پێدان بێت، نەك بە چاە بیخوێنیتەوە.

چاوەکانتان ئامرازی دەستی مێشکە، دەبێ وەك ئامرازێکی چاك بەکاری بهێنی، خوێنەری خێرا ئەو کەسەیە کە دەتوانێ لە ئایندەدا سود لە هێزی بینینی دەوروپشت وەربگرێ. بتوانێ تەنها بە سەیرکردنێك پەرەگرافێك وەربگرێ و لە ماناکەی تێبگات. ڕێگەیەکی ئاسان بۆ گەیشتن بەو بەهرەیە لە گەشەپێدانی تەکنیکی پێشکەوتودا بەکارهێنانی میتۆدی میتایە.

تەکنیکی خوێندنەوە بە یارمەتی میتا: بە هۆی تەکنیکی میتاوە دەتوانێ هێزی بینینی دەوروبەر بەکاربهێنێ و بۆ خوێندنەوە سودی لێ ببینێ. سەیرکردنی بازنەیی تواناى چاو بۆ وێنەگرتن لە سیستەمی چاو، مێشك خێراتر و بەرفراوانتر دەکات، مێشك دەتوانێ بە خێراییەکی زۆر نوسراو بخوێنێتەوە بە بێ دابەزینی تواناى تێگەشتنی تێکست. لە سەرەتادا راهێنان لەسەر ئەو نوسراو تێکستانە بکە کە پێشتر خوێندوتەوە و تێیگەشتووی بۆ ئەوەی سیستەمی چاو لەگەڵ مێشك خۆی بگونجێنێت.

لەرینەوەی دوو ڕستە: دوو ڕستە پێکەوە بە یەکجار وەربگری، تەکنیکی بازدان لە نێوان دوو ڕستەدا لەرینەوەی دوو ڕستە دەگەیەنێت، لەم ڕاهێنانەدا قەڵەمی خوێندنەوە بە ناوەڕاستی دوو ڕستەکەدا ڕەت دەبێ لە کاتی گەڕانەودا بۆ دوو ڕستەی تر قەڵەمەکەت تۆزێك لە سەرووی پەڕەکە بەرز بکەرەوە دیسان لە نێوان دوو ڕستەی تری دابنێ و بخوێنەوە. ئەم میتۆدە مێشك لەسەر تواناى بینی ئەستوونی ڕادەهێنێ.

میتۆدی S: لەم میتۆدا بەرە و پێشچوون و گەڕانەوە بەرەو دواوە تاکە ڕستەیەك یان دوو ڕستە پێکەوەن بە جوڵە شێوەی S ڕستەکان دەخوێندرێتەوە.

میتۆدی زیك زاك: ئەمەش ڕێگایەکی تری خێرایە لە تەکنیکی میتادا، بەهۆیەوە هێزی بینینی دەوروپشت بەکاردەهێنرێ، لەم میتۆدا قەڵەمی خوێندنەوە بە سوکی بەسەردا بهێنێت.

باسی شەشەم

کێشەکانی فێربوون و خوێندنەوە:

کێشەی فێربوون:

کێشەی لاگستینی: ئەوە کێشەی ئەو کەو کەسانەیە کە زەحمەتیان لە ناسینەوەی پیتەکاندا هەیە و ناتوانن وشەکان بخوێنەوە لە هەندێ خوێندنگەدا ڕێژەی ئەو منداڵانەی زەحمەت فێربوونیان هەیە دەگاتە ٢٠٪ە، ئەو جۆرە منداڵانە یارمەتیدانی تایبەتی و ڕێگە و میتۆدی تریان بۆ ناسینەوەی پیت و وشەکان دەوێ. هەندێ جلر هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هێشتا بە تەواوەتی پیتێك فێرنەبووە بە باشی پیتێکتر فێر دەکرێ.

کێشەی هایپەراکتیڤیات: ئەم جۆرە کێشەیەی خوێندنەوە بۆ بێتوانایی و ناتەواوی دەروونی دەگەڕێتەوە کە بە شێوانی ئاگایی دەناسرێ، تەنیا لە ئەمریکادا پتر لە سێ ملیۆن منداڵ بەدەست ئەم زەحمەتییەوە دەناڵێنن، بەڵام دیاریکردنی ئەمجۆرە کێشانە لە منداڵ و یارمەتیدانیان پێویستی بە کەسانی پسپۆڕی دەروونیە.

بە پیت خوێندنەوە: ئەو کەسانەی ڕۆژانە ناخوێننەوە، هەروەك لە سەردەمی منداڵی لە خوێندنگە سەرەتایدا چۆن خوێندنەوە بە پیت دەخوێننەوە هەروا دەخوێننەوە.

وشە گوتنەوە: خوێندنەوە بەهۆی گوتنەوەی وشەکە لێڕاهاتنێکی خراپە، بە ئاسانی دەتوانی خۆت لە وشەگوتنەوە ڕزگاری بکەی بەهۆی ئەوەی پارچە کاغەزێکی بچووك نێو لێوەکانت یان جویێی بنێشت، ئەمە وا دەکات خێرای خوێندنەوە کەم بکاتەوە.

گەڕاندنەوەی چاو: گەڕاندنەوەی چاو بەسەر ئەو وشەیەی پێشتر خوێندراوەتەوە بەمجۆرە خێرایی خوێندنەوەکە سێ هەنگاو بەرەو پێش و دو هەنگاو بەرەو دواوە دەبێ.

بێ یارمەتی خوێندنەوە: بە یارمەتی پەنجە یان بە هۆی یاریدە خێراتر دەخوێنێتەوە، بەڵکو بە هۆی چاو بخوێنێتەوە چونکە بەمە خێراتر دەبێ.

خوێندنەوەی وشە بە وشە: خوێندنەوەی وشە بە وشە لێڕاهتنێکی خراپە، باشتر وایە کۆمەڵێك وشە پێکەوە بخوێنێتەوە.

گوتنەوەی بە بێ دەنگ: لە کاتی خوێندنەوەدا وشەکە کە لە دڵی خۆیدا دەڵێتەوە، هەروەك وشە گوتنەوە کە پێشتر باسمانکرد، بەڵام ئەمجارەیان دەنگی نییە و زمانی و دەم ناجوڵووڵێ، بەڵکو لە دڵی خۆیدا وشەکە دەڵێتەوە.

باسی حەوتەم

تەرکیزکردن و چاککردنی تێگەیشتنی تێکست

مانا و ئامانجی خوێندنەوە: یەکێك لە هۆکار و هۆیەکانی خوێندنەوە ئەوەیە کە ئامانجی دیاریکراوت لە خوێندنەوەکەتدا هەبێ، مرۆڤ بەر لە دەست پێکردنی بە خوێندنەوەی کتێبێك پێویستە ئامانج و مەبەستێکی هەبێ بۆ خوێندنەوەی کتێبەکە یان تێکستەکە پلانێك لە بەردەستدا بێت، هۆکارەکانی کەمبوونەوەی تەرکیز:

١- کەمی زانینی مانی وشەکان: زۆرجارارن لە کاتی خوێندنەوەدا وشەیەك یان زاراوەیەك دێتە بەرچاو کە ماناکەی نازانی یان بە تەواوی تێناگەی ئەمەش دەبێتە هۆی شێواندنی تەرکیزکردن، چونکە نەزانینی مانای وشەکە وات لێدەکات خوێندوەکە بپچڕێنی و بیر لە مانای وشەکە بکەیتەوە تا لە تێکستەکە بگەی. ڕێگا چارە ئەوەیە ئاستی زانینی مانای وشە و زاراوەکان بەرز بکەیتەوە.

٢- زەحمەتی تێکستەکە: ئەم کێشەیەیان لە هەمووان سەختترە زۆر جاران لە کتێبە زانستیەکاندا ڕوبەڕووی دەبیتەوەو هەندێك لە کتێبە زانستیەکان بە شێوازێکی ناخۆش و زمانێکی ناتەواو نوسراون.

٣- خراپی خوێندنەوە: لە منداڵیدا و لە کاتی خوێندن لە خوێندنگە هەرکاتێك مرۆڤ زەحمەتی لە خوێندنەوە یان تێگەشتن هەبوبێ پێیدەگوترێ لەسەر خۆ بخوێنەرەوە کەچی لە جاران خراپتر ناتوانێ هیچی لێ تێبگات. لەبەر ئەوە پێویستە خێرایی خوێندنەوە زیاتر بکات.

٤- خراپی باری دەروونی: بوونی هەندێ کێشە وەکو ئەرکی جێبەجێکردنی هەندێك کاری کۆمەڵایەتی یان کێشەی ماڵ و بێتاقەتی کە مرۆڤ بیری پێوە خەریك دەبێت دەبنە هۆی کەمبوونەوەی تەرکیز.

٥- خراپی ئۆرگانیزم: ئەم کێشەیە زۆر کەس دەگرێتەوە کاتێك دەچێتە سەر مێزی نوسین دەیەوێ بخوێنێتەوە، پێنوس، چاویلکە، کتێب و دەفتەرەکەی نادۆزێتەوە، ئەمانەش ئارەزووی خوێندنەوە و تەرکیزکردن دەشێوێنێ.

٦- کەمی ئارەزوو: ئەم فاکتەری کەمی ئارەزووە زۆرکات بە هۆکاری تری وەکو زەحمەتی بابەتەکە کێشەی مانای وشەکان و تێنەگەشتنی تێکستانەکەوە بەستراوەتەوە.

٧-کەمی هاندان: ئەم کێشەیە زۆربەی کات دێتە پێش، ئەگەر سود و کەڵك لە خوێندنەوە نەبینێ، بەڵام ئەگەر هۆیەکانی خوێندنەوەی کتێبەکە شیبکەیتەوە و دەستنیشانی بکەی و بزانی خوێندنەوە سودی پێبگەیەنێ، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هانی خوێندنەوە و تەرکیزکردنت دەدا.

٨- ئەسپی تەرکیزکردن: لە کاتی خوێندنەوەدا وا باشترە لە دوای هەر (٣٠ بۆ ٤٠) خولەکێك پشویەك بدەی، ڕێگە بە ئەسپی خەیاڵت نەدەی بفڕێ و لە بیرت نەمێنێ لە

کوێ و چی دەکەی. وا بێنە بەرچاوت تەرکیزکردن ئەسپێکی کێوییە و دەبێ ڕکێفی جلەوەکەی توند بکەی.

هێڵکاری خوێندنەوە: هێڵکاری یاد هەموو توانا و بەهرەکانی مێشك بەکار دەهێنی، کە پێدەوترێت نەخشەی بیرکردنەوە، کە بە کورت پوختی و بە وشە و هێڵکاری و وێن زانیاریەکان دەخرێتە ڕوو.

ڕاهێنانی پێوەری تاکت: لەبەر ئەوە مێشك سروشتێکی ڕێژەیی هەیە واتە بە شتێکی دیکە دەپێورێ، دەکرێ خێرای خوێندنەوەکەت بە دەنگی تەکی ئامێرێکەوە ئەم ڕیتمە ڕێکبخەی، دەتوانی لەگەڵ هەر (تاکت تەك)ێك چاو بەسەر ڕستەیەکدا ئامێرەکە بجوڵێنی.

باسی هەشتەم: میتۆدەکانی خوێندنەوە بۆ فێربوون.

خوێننەوە بە مەبەستی فێربوون یەکێکە بە بوارەکانی خوێندن کە هەموو تەکنیك و میتۆدەکانی خوێندنەوەی خێرا بۆی دەگونجێ و جێگەی بەکارهێنانە، زانایانی پەروەردە لە سەدەی نۆزدەیەم گەشتنە ئەو ڕاستییەی کە بە هۆی فرە ئاستەوە، خوێندنەوەی کتێبی فێربوون خوێندنگەکان لە جارێك خوێندنەوە بەسەردا ڕۆشتن باشترە. ئەم تەکنیك و میتۆدانە لە دوو بەشی بنەڕەتی پێکدێن:

یەکەم: خۆئامادەکردن: ئەمەش لە چەند بەشێك پێکهاتووە.

١-چاو پێداخشاندن: بەر لە دەستکردن بە خوێدنەوە چاوێك بەسەرلەبەریدا بخشێنە یان پەڕەکانی هەڵدەوە، هەروەك چۆن لە کتێبخانەیەکدا دەتەوێت کتێبێك بکڕیت، بە خێرایی سەیرێ کتێبەکە بکە.

٢- کات و چەندایەتی: هەردوو لایەن لە زۆر ڕووەوە لەیەك دەچن و بەیەکەوە بەستراون، کاتێ دەتەوێ بخوێنی دەبێ بڕیاری ئەوە بدەی چەند بڕ بخوێنی و بە چەند کات تەواوی بکەی. گرنگە کات بۆ پشوودانانیش دابنێیت.

٣- پرسیارکردن و دیاریکردنی ئامانج: دەبێ دیاری بکەین چاوەڕێی کامە دەرئەنجامین، ئەمە ئەو پرسیارە مەعریفیەیە کە دەمانەوێت وەڵامەکەی لە خوێندنەوەی کتێبەکەدا بە دەستی بهێنین.

دووەم: جێبەجێکردن: ئەمەش لە چەند بەشێك پێکهاتووە.

١- گەڕان  بە دوای باسەکاندا: مەبەست لەم گەڕانە بە نێو باسەکانی کتێبەکەدا تەماشاکردنێکی گشتی گشتی بابەت و باسەکانی کتێبەکەیە، وەکو: دەرئەنجامەکان، هێڵکاریەکان، وێنە، خشتە...، بەم گەڕانە ئەو بابەت و باسانەت بەرچاو دەکەوێت کە بە دوایاندا دەگەڕێی.

٢- پیشاندان: پیشاندان لەم هەنگاوەدا پێویستە بە ئاگایەوە تەرکیز بکرێتە سەر سەرەتا و کۆتایی پەرەگرافەکان، پارچە تێکست، بە کورتیەکەی ناوەڕۆك یان پوختەی بابەتەکە بخوێنەرەوە.

٣- تەواوکاری مەبەستی تێکست: دوای چاوخشانجن و پیشاندان هێشتا زانیاری پێویست ماون کە دەبێت بەدەستیان بهێنین ئەمە وەکو تەواکردنی باەتی خوێندنەوەکەتە.

٤- پشکنین و تاقیکردنەوە: ئەگەر پاش هەنگاوەکانی پێشوو هێشتا پێویستت بە زانیاری هەبوو ئەوە دەبێ ئەم هەنگاوەش ئەنجام بدەی، لەم هەنگاوەدا دەبێ هەموو ئەو شوێنانەی کە هێشتا تێینەگەشتووی جارێکیتر بەسەریدا بچیتەوە.

بەشی چوارەم

کارگێری کات: باسەکانی پلانی فێربوون و ڕۆڵی ئاگا لەخۆبوون دەگرێتەوە.

لۆتەر جەی سیوێرت دەڵێت: کات وەك با وایە، ئەگەر بە دروستی بەکاری بهێنین، دەمانگەیەنێتە شوێنی مەبەست.

باسی یەکەم: پلانی فێربوونی داهێنەرانە: یەکێکە لە ستراتیژەکانی زانستی کارگێڕی بە هۆی ئەو پلانەوە خێرایی تیمپۆی فێربونەکەت، کاتی فێربونەکەت، خۆ هاندان و هەوڵدانەکانت بۆ گەیشتن بە ئامانج لە کاتێکی دیاریکراودا ڕێکدەخا. بە هۆی دارشتنی ئامانجی نزیك و دوور ڕێکخستنیان لە پلانی کاتدا بە ئاسانی بەسەر کێشە ئاڵۆزەکاندا زاڵ دەبێ و بە خێرایی دەگەیتە ئامانجی سەرکەوتوو. مرۆڤی ئەم سەردەمە هەمیشە هەستدەکەن لە شتێکدا بە جێماون دەیانەوێت کارەکانیان بە زووی ڕای بکەن، -کاتمان نییە – بوە بە دروشمی مۆدێرنی ئەمرۆ.

١-شیکردنەوەی چۆنیەتی کات بەسەر بردن: دانانی خشتەیەك بۆ ئەوەی بزانیت چۆن کاتەکانت ڕێکدەخەیت.

٢- پلانی فێربوونی داهێنەرانە لە کاتێکی دیاریکراودا: دەبێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەیتەوە:

- بۆ کام ئامانجی سەرەکی هەوڵدەدەم؟
- کام ئامانجە لاوەکیانە دەمگەیەنێتە ئامانجە سەرەکیەکە؟
- بۆ دەستپێکردنی خوێندن پێویستە چ هەنگاوێك هەڵبژێرم.
- ئایا پێویستە کار بە گروپات بکەم؟

٣- دانانی پلانی هەفتانە: دانای پلانی هەفتانە زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بزانیت چۆن کارەکانت ڕێك دەخەیت.

٤- پلانی ڕۆژانە: ئەمەیان لە هەموو پلانەکانی تر گرنگترە، چونکە ئەمەیان دواناخرێ، بەڵکو دەبێت دەمودەست جێبەجێیان بکەیت، هەروەها دەتوانی هەموو ڕۆژێ بیگۆڕێ.

٥- هەڵسەنگاندنی پلانی ڕۆژانەی کاتی ڕۆژەوەختێك: دەتەوێ دوای نانخواردن نیوەڕۆ دەست بە وانە خوێندن بکەیت یان خەریکی نوسین دەبێت.

بەشی پێنجەم

ناوەندەکانی فێربوون: لەم بەشەدا بناغەی دو بابەتی تایبەتمەندی جیاواز کە بۆ فێربوونیان ڕیگەی جیاوازیان پێویستە، فێربوون واتە زانیاریەکان لە مێشکی خۆتدا (یادی درێژخایەندا) تۆمار بکە.

باسی یەکەم: فێربوونی زمان: ئەو زمانەی گەورەترین گەشەکردنیان بەخۆوە بینیوە لەگەڵ ئەوەی زیاتر لە چەند سەد هەزار وشە پێکدێت، کەچی باشترین فەرهەنگی زمان لە ٥٠٠٠٠ هەزار وشو تێناپەڕێ. بە هۆی فێربونی ٢٥٠٠ وشەوە مرۆڤ دەتوانێ لە ٨٥٪ی زمانی ڕۆژانە تێدگات. ئەگەر کەسێك ڕۆژانە ٩ وشە فێربێ لە ماوەی ساڵێکدا دەتوانێ ئەو زمانەی مەبەستێتی فێربێ. بەڵام زمان فێربوون تەنها وشەی لەبەرکردن نییە، بەڵکو ڕێزمان، ئەدەب، مێژوو و جوگرافیای وڵاتیش دەگرێتەوە، بۆ کەسێکی پێگەشتوو دەتوانێ بە سێیەکی کاتەکە ئەگەر حەزی لە زمانەکە فێردەبێت.

لەبیرچونەوە بە زۆر لە دوای چەند کاتژمێرێك لە فێربوون ڕودەدات، هۆکەشی ئەوەیە نەبونی پێداچونەوەیە. ئەوەی گرنگەپێویستە وشەکە لە ڕستەدا بەکار بهێنین، چۆنیەتی

دەربڕینی فۆنەتیکی وشەکە، نوسینی وشەکە، گوێگرتن لە زمانەکە. بەم ڕێگایانە دەتوانیت بە ئاسانی فێری زمانێك ببیت:

١- زۆر کەناڵی فێربوون: تا چەند کەناڵی زیاتر بۆ فێربوون بەکاربهێنی ئەوەندە زووتر و باشتر وشە و زاراوەکەی لە مێشك دەچەسپێ، قسەکردن یارمەتی فێربوونی زمان دەدات.

٢- ڕاهێنانی فۆنەتیك: تێکست بە زمانی بیانی لەسەر کاسێت یان مۆبایل گوێی لێبگرە، بە ڕستەیەك دەست پێبکە و چەند جارێك کاسێتەکە ڕاگرە و گوێی لێبگرەوە و پاشان چەند جارێك ڕستەکە بڵێرەوە.

٣- پرۆگرامی فێربوون: کۆمپیوتەر و مۆبایل ناتوانێ جێگای مامۆستا بگرێتەوە، بەڵام بەرنامەیەکی چاکی زمانی فێربوون ڕۆڵێکی بەرچاوی خۆی هەیە لە فێربوونی زماندا. لە خوارەوە بە کورتی باسی بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە دەکەین:

- هاندەر: بە هۆی خەریك بوونت بە ڤیدیۆ کلیپ، میوزیك، مەتەڵ، ڕاهێنان و ئەرکی سەرنجڕاکێش وەك پردێك وان بۆ تێپەڕبوونی بێزاری لە فێربوونی زمانە بیانیەکە.
- زانیاری پێدان: هەر زوو بۆ خۆت دەزانی ئاستی فێربوونت چەندەیە، تا تاقیکردنەوەکانت نەوەستێ.
- پەیوەندی دروستکەر: کۆمپیوتەر و مۆبایل ئەو نێوەندەن کە مرۆڤ هەرچی توانای گفتوگۆکردن و قسەکردنی تێدایە بەکاری بهێنێ.
- پیا هەڵدان و ستایش و هەڵسەنگاندن: بەرنامەی کۆمپیوتەر و مۆبایل ستایشت دەکەن و هەڵتدەسەنگێنن، فێری ئارامگریت دەکەن.
- کات پاشەکەوتکردن: پێویست ناکات لە ماڵ دورکەویتەوە بەمە کۆتایی ڕۆشتن بۆ کۆرست لە کۆڵ دەکاتەوە، کاتێکی زۆرت بۆ دەگەڕێتەوە.
- ڕەخساندنی دەرفەتی هەڵبژاردن: گەر لە کاتی فێربون زەحەمەتیت هەبوو دەتوانی چەند جارێك دوبارەی بکەیتەوە.
- کاریگەری فێربوون: بە بێ ئەوەی هەستی پێبکەیت کاتژمێرێك بە چڕی دەخوێنی لەو ماوەیەدا هەست بە بێزاری ناکەی.
- هاوڕێی خوێندن: بە هۆی چات و ئیمێڵ و سۆشیال میدیاوە دەتوانی هاوڕێ بۆ خۆت پەیدا بکەی و فێری زمانە بیانەکە ببیت.

- تاقیگەی زمان: پرۆگرامی چاك لە تاقیگەی زمان باشترە، فۆنەتیك و دەربڕینی وشەکانت لەگەڵ دەڵێ.

باسی دووەم

فێربوونی ماتماتیك: لە زۆربەی قۆناغەکانی خوێندن ماتماتیك یەکێکە لە وانە سەرەکیەکان و زانستێکی بنچینەییە، بەڵام بە داخەوە زۆر کەس زەحمەتیان لەگەڵ ئەم زانستەدا لە تێگەشتن و فێربووندا هەیە. لەگەڵ ئەم زانستەدا، مرۆڤ تەنیا زانست فێرنابێت، بەڵکو تەسەور و پێشبینیش فێر دەبێت.

پێشنیار بۆ فێربوونی ماتماتیك:

بە گرووپ فێربوون لەگەڵ کۆمەڵ پێکەوە بخوێنن هەوڵبدە هەمیشە ماتماتیك لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە پێکەوە بخوێنن کاتی گفتوگۆکردن لەسەر ڕێگەی شیکارکردنی جیاجیا بۆ هەر ڕاهێنانێك بۆ بەرفراوان بوونی مێشکی ماتماتیکت یارمەتیت دەدا.

میتۆدەکانی فێربوونی ماتماتیك:

- لەسەر ئەرکە لێکچوەکان کار بکە: لە سەرەتادا ئەو ڕاهێنانە شیکار بکە کە زۆر بەو ڕاهێنان و پرسیارانە دەچن کە لە پۆل شیکار کراون و باسکراون، دواتر برۆ سەر ئەو ڕاهێنانەی کەمێك جیاوازترن.
- لەگەڵ کورتە باسەکاندا کار بکە: ئەوەندەی پێدەکرێت لەگەڵ کورتە باسەکاندا کار بکە، ئەو نمونەیە یاریدەدەرێکی باشە بۆ شیتەڵی ڕاست و دروست. هەموو کارگە گەورەکان لە سەرەتادا بچوك بوون.
- تاقیکردنەوەی ماتماتیك: تاقیکردنەوەی ماتماتیك، وەك تاقیکردنەوەکانی زمان و کۆمەڵایەتی نییە، تاقیکردنەوەی بیرکاری هەڵچون و گرژبوونی زۆری تێدایە.
- بەشێك لە شیکارکردنی پرسیارەکە زوو ڕاگرە: شیکارکردنی پرسیارەکانی تاقیکردنەوە هەروەکوماڵەوە نییە بە ئارەزووی خۆت چەندە خەریك بیت و خۆت پێوە ماندوو بکەی باشتر بێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە تاقیکردنەوەی بیرکاری دەبێت زوو واز لەو بەشە پرسیارانە بهێنی کە ناتوانی شیکاری بکەی.
- کات دابەشکردن: لە تاقیکردنەوەی ماتماتیکدا باشتر کار دابەشکردنی کارە.

- خاڵ کۆکردنەوە: بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین نمرە پێویستە، زۆربەی پرسیارەکان یان بەشێکی زۆری پرسیارەکان شیکار بکەی.
- زانینی ڕێگەی شیکارکردنی پرسیارەکان: هەندێکجار باشترین ماتماتیك زانیش بیرۆکەی شیکارکردنیان لە دواین خولەکەکانی تاقیکردنەوەدا بۆ دێت. لەبەر ئەوە پێویستە ئەوەندە ڕاهێنان بکەی تا مێشکت چالاك دەبێتز
- لێبگەڕێ با شیکارەکە بمێنێ: بەر لەوەی شیکاری نوێ بنوسیتەوە شیکارەکەت ڕەش مەکەرەوە، لەبەر ئەوە لەسەر شیکارکردنی هەڵەش هەر نمرە وەردەگریز

بەشی شەشەم

نوسین

ئەم بەشە بۆ نوسین و کارگێڕی کات لە نوسیندا تەرخانکراوە بەم شێوەی خوارەوە:

باسی یەکەم: کارکردن لەگەڵ سیمینار

ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان دوای نوسینی ڕاپۆرتە لێکۆڵینەوەیەك، سیمینارێکت لێکرا، پێویستە ڕەچاوی ئم خاڵانە بکەیت:

١- دیاریکردنی بابەت و کێشەکان: لە سەرەتادا دەبێ بابەتی پێشنیارکراو بە تەواوەتی سەیر بکەی ئەم پرسیارانە بکەی:

- بابەتەکە لە چ کێشەیەك دەدوێ.
- کێ سەرپەرەشتی بابەتەکە دەکات.
- لە سیمینارەکە چی بەدەست دەهێنی.

٢- کارتی ڕونکردنەوە: بۆ پیشاندانی بابەتەکەت لەسەر کارت و فایل، هەوڵبدە ڕەنگ زۆر بەکار نەهێنی نەگاتە شەش ڕەنگ.

٣- کۆتایی: لە بەشی زۆر لەوە ئاگاداربە کە دوا وشەی بە باشی لە یادی مرۆڤدا دەمێنێتەوە. لەبەر ئەوە دەبێت بایەخ بە بەشی کۆتایی بدەی.

٤- ڕاهێنان: موحازەرەکەت بە دەنگێکی بەرز و ساف بخوێنەرەوە، کات بگرەوە بزانە چەند کاتت دەوێ.

٥- بەکارهێنانی هۆیەکانی ڕوونکردنەوە: ئەگەر بابەتەکە سەخت و ئاڵۆز بوو، دەبێ تەختە یان ئۆڤەر هێد یان کارت و کۆمپیوتەر بەکار بهێنیت.

باسی دووەم: کارگێڕی کات لە نووسیندا

کارگێڕی کات لە هەموو کار و پیشەیەکدا ڕۆڵێکی گەورەی هەیە، کەس ناتوانێ زۆرتر لەو کاتەی هەیەتی کاربکا، ئەو کاتەی پێویستە بۆ ئەنجامدانی کارەکە دەتەوێ ڕێکی بخەی، بەم جۆرە ڕێکی بخە:

ڕێکخستن و پلاندانان    پێنج هەفتە

ئامادەکردنی بابەتی توێژینەوەکە    پێنج هەفتە

دامەزراندن و دارشتنی پێکهاتەکان   پێنج هەفتە

فۆرمەلەکردنی بابەتە یەکەمینەکان  پێنج هەفتە

پێداچونەوە پێنج هەفتە

پاکنووس یەك هەفتە

بەر لەوەی دەست بە هەر کارێك بکەی دەبێ ئەو جۆرە پلانانە دابنێی بۆ ئەوەی کاتەکەت بە فیڕۆ نەڕوات، نوسینەکەت لە ماوەی خۆیدا تەواو بکەی.

بەشی حەوتەم

ترسی تاقیکردنەوە

ئەم بەشە بەسەر ئەم باسانەی خوارەوەدا دابەشکراوە

باسی یەکەم: پێناسەی ترسی تاقیکردنەوە: ترسی تاقیکردنەوە دیاردەیەکی ئاڵۆزە، ئەوکاتە بەدیاردەکەوێ کە ترس وەکو کاردانەوەیەك بەرامبەر بە ڕەوشێکی تایبەت دێتە بەرچاو، ترسی تاقیکردنەوە لە ئەنجامی هەستکردن بە ترس لە کەوتن دوچاری هەڵچوون دەبێ.

باسی دووەم: دەرکەوتەکانی ترسی تاقیکردنەوە: لەم خاڵانەدا خۆی دەنوێنێ:

١-دەرکەوتەی دەروونی: ترس، نیگەرانی، هەڵچوون، گۆڕانی میزاج خۆ ئەگەر ئەم ترسە بۆ ماوەیەك بمێنێتەوە، خۆی لە ترسنۆکی و دڵتەنگی و تورەبوندا خۆی دەنوێنێ.

٢- دەركەوتەی لە لەشدا: گرژبوون، نا ئارامی ناخ، خەوزڕاندن، سەر ئێشە، گەدە ئێشە، ماندوێتی، ئارەقکردن، سورهەڵگەڕان، دڵ ئێشە.

٣-دەركەوتەی لە توانای كاركردنی دەروونیدا: وەستانی بیركردنەوە، شێوانی تەركیز و سەرنجدان، تێكچونی ئاگایی، دڵەوراكێ و دوودڵی.

٤- دەركەوتەی لە هەڵسوكەوتدا: خۆلادان لە تاقیكردنەوە، خواردنی حەب، گۆڕانكاری لە مامەڵەكردنیاندا.

باسی سێیەم: ڕەهەندەكانی ترسی تاقیكردنەوە: ترسی تاقیكردنەوە ئەم ڕەهەندانەی هەیە:

ئاستی پێشبینیكردن.

لایەنی دەرونی - هەڵچوون.

ئاستی هەستپێكردن – تیادا ژیان

لایەنی پەیوەندی گرتن – ڕەفتاركردن – هەڵسوكەوت بە پێی كاردانەوە وەكو سەرلێشێوان.

ترسی تاقیكردنەوە نەخۆشی نییە، بە ئاسانی لە دوای تەوابونی تێست وتاقیكردنەوە ترسەكە نامێنێ. هۆیەكانی ترسی تاقیكردنەوە ئەوەیە كاتێ كەسەكە بیر لە ژێركەوتن دەكاتەوە تەسەوری ئەوە دەكات، ئەگەر لە ئەزمونەكە دەرنەچێ دەبێتە جێگای گاڵتەپێكردن و پێكەنینی كەسیانی ناسیاوی.

باسی پێنجەم: خۆ ئامادەكردن بۆ تاقیكردنەوە: خۆ ئاماداەكرد بۆ تاقیكردنەوە بەم سێ گەوهەرە بەستراوەتەوە.

١-پێویستە كاتێكی پێویستی لەبەردەستدا هەبێت بۆ خۆئامادەكردن بۆ تاقیكردنەوە.

٢-پێویستە بابەتی تاقیكردنەوە زۆر دیار و جێگەی تێگەشتن بێت.

٣-پێویستە داوكان تاقیكردنەوە ڕوون و ڕەوان بێت، پرسیارەكان هێندە ڕوون بێت فێرخواز لێی تێبگات.

باسی شەشەم:زاڵبوون بەسەر ترسی تاقیکردنەوە: ترسی تاقیکردنەوە بیرۆکەیەکی ترسنۆکانەیە لە خەیاڵدا دروست دەبێت، خەیالکردن و تەسەورکردنی ژێرکەوتن لە تاقیکردنەوەدا دەبێتە ترس لەسەر هەست و بیرکردنەوە، ئەمەش کاریگەری خراپی دەبێت لەسەر ئەنجامی تاقیکردنەوە.

ئەم خاڵانە هۆکارن بۆ ەمکردنەوەی ترسی تاقیکردنەوە:

١- کاریگەری هاندان: خۆت بەوەوە هانبدە کە بە هۆی دەرچون و تەواکردنی خوێندن، کار و پیشەی باشت دەستدەکەوێت.

٢- خۆ خاوکردنەوە: خۆ خاوکردنەوەی ماسولکەکان و هەناسەدانی لەسەر خۆ تەکنیکی گرنگە بۆ خاوکردنەوەی گرژی ماسولکەکان. پەیوەندیەك بەهێز لە نێوان گرژبوونی ماسولکەکان و توانای چالاکبوون و کارکردنی مێشکدا هەیە.

٣- تەکنیکی هەناسەدانی قوڵ: هەناسەیەکی قوڵتر لە هەناسەدانی ئاسای هەڵبکێشە، هەناسەکە بدەرەوە بۆ ئەوەی هەواکە لە سیەکاندا ڕابگری، کاتێك هەناسەت دایەوە بۆ چەند چرکەیەك پشوو وەربگرە، ئەوجا دیسان کردارەکە چەند بارە بکەرەوە بۆماوەی سێ خولەك.

٤- خاوکردنەوەی ماسولکەکانی لەش: ڕاهێنانی سوك و ئاسان بە ئەندامەکانی جەستەت بکە، بە مەرجێك نابێت خۆت زۆر ماندوو بکەی.

٥- دارِشتنی پلانی کات: دارِشتنی پلانی کۆنکرێتی زۆر گرنگە، بە مەرجێك بە شێوازێك بێت توانای جێبەجێکردنی هەبێت و نابێت ئەو پلانەی دانراوە لێی لابدەیت.

٦- ڕێکخستنی خواردن: دەبێت خۆراك بە شێوازێك بخورێت نە زۆر چەور بێت نە زۆر شیرین، وە دوربکەوەرەوە لە جگەرە کێشان و بەکارهێنانی ئەو خواردنەوانەی مادەی کافاینیان تێدایە.

کتێبی دەیەم: پێداگۆگی ستەملێکراوان - نوسینی: پاولۆ فرێری
وەرگێڕانی: جیهاد محەمەد

چاپی دووەم – ٢٠١٩

مرۆڤ تەنیا بە سەرکێشکردن و ڕیسککردن بە ژیانەوە دەتوانێت ئازادی بەدەست بهێنێت، ئەو کەسەی سەرچڵی بە ژیانیەوە نەکات، ڕەنگە بتوانێت بگات بەو ئاستەی وەکو کەسێکی ئاسایی بناسرێت، بەڵام هەرگیز ناتوانێت بگات بەو ئاستەی وەکو کەسێکی هۆشمەند و ئازاد و سەربەخۆ بناسرێت.

تەنها لێکدانەوە ئەکادیمیەکان هۆکارنەبوون بۆ دروستبوونی کتێبی پێداگۆکی ستەملێکراوان، بەڵکو ئەم کتێبە بەنێو ڕەگوڕیشەی جیهانە بەرجەستەبوەکەدا ڕۆچوەتە قوڵایەوە، پەرچەکرداری جوتیاران و کرێکارە پیشەسازیەکان، هۆکارێك بوون، هەروەها تاکەکانی چینی ناوەڕاستیش کە لە میانەی ڕێڕەوی کارە پەروەردەیەکانمەوە چاودێریم دەکردن.

سێکتاریانیزم (دەمارگیری) کە نزیك لە توندڕەویە؛ هەمیشە دەبێتە هۆکاری ناتەواوی و خەوشداری، بیرتەسکی و گۆشەگیری ئەفسانە و نامۆیی دروستدەکات، بەڵام ڕادیکاڵیزم، کە نزیکە لە هەڵوێستی ڕەخنەگرانە بەردەوام بیناکارە و دەبێتە هۆی ڕزگاری، خودگەرا نییە. ڕاستڕەوی دەمارگیر هەوڵدەدات ئێستا دەستەمۆ بکات بۆ ئەوەی پاشەڕۆژی لەسەر ڕابگرێت (ئەمرۆ گۆڕانی تێدا ناکرێت و گرێدراوی ڕابردویەکی سەپێنراوە) گیرۆدە و زیندانی ئەو ڕاستیەیە کە بڕوای پێیەتی. بەڵام چەپڕەوی دەمارگیر پاشەڕۆژ وا دەبینێت کە پێشوەخت بڕیاری لەسەر دراوە (سبەینێ پاشەڕۆژێکی بڕیار لەسەر دراوە، ئەمە چارەنوس و گەڕانەوەی بۆ نییە) بە نکوڵیکردنی لە سروشتی خۆی گیریخواردووە. هەردوو بۆچونەکە کەموکورتن چون ڕوانگەیان بۆ مێژوو هەڵەیە و لەبەردەم کار و چالاکیدا کێشە و گرفت دروستدەکەن و نکۆڵی لە ڕزگاری دەکەن.

بەشی یەکەم

سەبارەت بە دیالۆگ

مەسەلەی بوون بە مرۆڤ لە ڕوانگەی بەهاوە بە بەردەوامی مەسەلەیەکی تەوەرەییە، خەسڵەتێکی هێندەش گرنگە بۆ مرۆڤەکان کە ناتوانرێت فەرامۆش بکرێت. مرۆڤبوون و نامرۆڤبوون هەردووکیان دوو ئاکاری شیاو و گونجاوی مرۆڤن، مادەم مرۆڤ بونەوەرێکی

بێخەوش نییە و هۆشیاریشە بۆ ئەو بێخەوشیە، هەردوو خەسڵەتی مرۆڤبوون و نامرۆڤبوون لە مێژووی مرۆڤایەتیدا و لە بارودۆخی دیاریکراودا و بە گوێرەی ئەو بێخەوشی و خەوشداری دوو خەسڵەتی مرۆڤن. دەشبێت هەبن و ببن بە ئاکاریان، بەڵام هەڵبژاردەی مرۆڤبوون و نامرۆڤبوون وەك دوو هەڵبژاردەی ڕاستەقینە لە بەردەم مرۆڤدا، کارو پیشەی مرۆڤ هەڵبژاردنی یەکەمە بەڵام کەچی لە هەمانکاتدا دووەمیان هەڵدەبژێرێت.

ڕەوشی خراپی چەوساوەکان، کە ئاستێکی نزمی مرۆڤبوونە، ئەمڕۆ بێت یان سبەی؛ هەستکردنیان بەو دۆخە خراپەی نامرۆڤبوون، پاڵیان پێوە دەنێت بۆ خەباتکردن دژی ئەوانەی بە ستەم مرۆڤبونیان لێ زەوتکردوون. هەڵبەت ستەملێکراو و چەوساوەکان بۆ ئەوەی خەباتیات واتا بەخشبێت پێویستە هەوڵنەدەن جێگۆڕکێ بکەن و خۆیان بچنە جێگەی ستەمکاران. بەڵکو بە جۆرێك ڕەوشی مرۆڤبوون بگێڕنەوە؛ ستەملێکراو و ستەمکار وەك یەك ببنەوە بە مرۆڤ. ئازادی و ڕزگاری بە ڕێکەوت بەدەست ناهێنن، بەڵکو دەبێت هەوڵەکانیان بکەن بە کردار.

بەشی دووەم

پەیوەندی نێوان مامۆستا و فێرخواز زەقدەبێتەوە لە گێڕانەوە و حیکایەتخوانی، لەم پەیوەندیێدا مامۆستا خودێکە کە چیرۆك دەگێڕێتەوە و فێرخوازیش گوێگر و گوێڕایەڵ و ملکەچە، بە واتایەکیتر؛ مامۆستا دەبێت بە بکەر و هەڵسوڕێنەر، فێرخوازیش کارتێکراو و ئامانج. مامۆستا وا باسی بارودۆخ دەکات وەك ئەوەی دۆخێکی ڕاوەستاو، بێگیان، بێجوڵە و بەشبەشکراو بێت ولە تواناادا بێت پێشبینی بکرێت، نەك خوێندنەوە و لێکدانەوە لەسەر ئەو بناغەیەی کە بارودۆغ دروستکراوی دەستی مرۆڤەکان خۆیانە.

دیسان مامۆستا وا باسی واقیع دەکات، وەك ئەوەی باسی بابەتێکی زۆر نامۆ و سەیر بکات کە کەوتوەتە دەرەوەی ژیانی قوتابیانەوە. لێرەدا ئەرکی مامۆستا دەبێت هەوڵدان بۆ پڕکردنی مێشکی فێرخواز  بە ناواخنی ئەو چیرۆکانەی بۆیان باسدەکات وەك ئەوەی واقیع بەدەر بێت لە هەموو شت، بە جۆرێك مرۆڤەکان نامۆ دەکات لە واقیع و واقعیش نامۆ دەکات لە مرۆڤەکان. باشترین وەسفی ئەمجۆرە لە فێربوون بریتیە لەوەی فێرخواز تۆماری دەکات دواتر ئەزبەر دەکات پاشان وشەو دەستەواژەکان وەك خۆی دەڵێتەوە.

لەمەش خراپتر، مامۆستا مێشکی فێرخواز دەکات بە دەفرێك بۆ پڕکردنەوە، هەتا مامۆستا زیاتر بکاتە ئەو دەفرەوە مامستایەکی باشترە. هەتا فێرخوازیش وەرگرێکی باش بێت و

قبوڵی هەموو گێڕانەوەکانی مامۆستا بکات و ملکەچ و گوێڕایەڵ بێت بۆ فەرمانەکانی مامۆستا ئەوە فێرخوازێکی سەرکەوتووە. بەم جۆرە؛ فێربوون دەبێتە پرۆسێسی تیادانان، فێرخوازیش دەبێتە لایەنی تیادانراو، لەبری ئەوەی لە نێوان مامۆستا و فێرخوازدا دیالۆگ، ڕاگۆڕینەوە، گومان و پرسیارکردن هەبێت. مامۆستا ئەوەی لای خۆی پێی وایە زانست و زانیاری بێخەوش و ئەملاولایە دەگەینێت بۆ فێرخواز ، فێرخوازیش لەسەرێتی بێ هیچ پرسیارێکی گوماناوی وەك خۆی وەریبگرێت ئەزبەری بکات و لە مێشکی خۆی تۆماری بکات. لەمجۆرە فێربوونەدا مێشکی فێرخواز دەبێت بە بانك، واتا چەمکی لە بانکنان هەڵدەگرێت. ئەوەی تێی فڕێدراوە دەیداتەوە، بە بێ لێکدانەوە و گومانکردن لە ڕاستی و ناڕاستی تێفڕێدراوەکە. ئەمجۆرە فێربوونە هیچ دەرفەتێك ناهێڵێتەوە بۆ چالاکی و چاپوکی و بەدواداچون و گومان و پرسیاری فێرخواز، تەنیا وەك تۆمارکەرێك مێشکی دەکات بە تۆمارگە. ئەمەش وا لە فێرخوازان دەکات دەستوپێ سپیبن بۆ بونیاتنان و داهێنان و گۆڕانکاری. خەڵکیش نابن بە مرۆڤ بە بێ توێژینەوە و پراکتیزەکردن.

مامۆستا فێردەکات، هەمەشتزانە، بیردەکاتەوە، ئاخێوەرە، ئامۆژگاری دەکات، هەڵدەبژێرێت و بژاردەکانیشی دەسەپێنێت، چاپوك و چالاکە، ناوەڕۆکی بەرنامەکان هەڵدەبژێرێت، سەبجێکتە.

فێرخواز فێردەبێت، هیچ نەزانە، بیری پێدەکرێتەوە، گوێگرێکی ملکەچە، ئامۆژگاری وەردەگرێت، ئەکتەرە و بژاردەکانی مامۆستا نمایش دەکات، بە خەیاڵ و لەمیانی مامۆستاوە کاردەکات، دەبێت خۆی لەگەڵ ئو ناوەڕۆکەدا بگونجێنێت، ئۆبجێکتە.

کارایی ڕێبازی فێرکردنی بانکی؛ لە کەمکردنەوەی یان سڕینەوەی هێزی داهێنان و ئەفراندن و بونیادنان لای فێرخواز و هاندانیان بۆ بە خێرای بڕواکردن و قبوڵکردن خزمەتی ستەمکاران دەکات، ئەوان نایانەوێت جیهانی واقیع بدۆزرێتەوە و گۆڕانکاری تێدا بکرێت. ستەمکاران خواستە مرۆییەکانی خۆیان بەکاردەهێنن بۆ پاراستن و مانەوەی ئەو ڕەوشەی لە بەرژەوەندیانە. بەرەنگاری هەر ئەمونێك دەبنەوە لە سیتەمی فێربوندا کە هانی بەرهەمهێنانی توانا ڕەخنەیەکانی چەوساوان بدات. بەرژەوەندی ستەمکاران لەوێدا شاراوە و پەنهانە کە هەمیشە دەخوازێت لە جێی گۆڕینی ڕەوشی ستەملێکراوان بۆ ڕەوشێکی دوور لە ستەم، هۆشیاری ستەملێکراوان بگۆڕێت بۆ  هۆشیاری خۆیان. ستەمکاران وا سەیری ستەملێکراوان دەکەن کە کەسانی پەراوێزخراو و نامۆن بە کۆمەڵگەی گشتی لەبەر ئەوە پێیان وایە پێویستە چاککبرێن و بخرێنە ژێر ڕکێفی کۆمەڵگەوە. هەر لەبەر ئەمەشە مامۆستایان بە جۆرێك لەگەڵ فێرخوازەکان مامەڵە

دەکەن کە لەگەڵ واقیعەکەدا ڕابێن و بگونجێن، لەم ڕێگاشەوە هەوڵئەدەن خەڵك بگۆڕن بۆ ئامێر و کاڵا. کاتێکیش بوون بە کاڵا ئیتر چۆنیان دەوێت وا دەکەن.

ستەمکاران یکە مانەوەی واقیعە چەوسێنەرەکە لە بەرژەوەندیانە بەردەوام برەو بە فێربووونی بانکی دەدەن، واتە بە پەنهانی هەڵگری گریمانەی جیاکردنەوەی مرۆڤە لە جیهانی دەوروپشتی. گریمانەی ئەوەی مرۆڤ تەنیا لە جیهاندا هەیە نەك لەگەڵ جیهاندا. مرۆڤ تەماشاکەرە نەك داهێنەر، بونەوەرێکی هۆشمەند نییە بەڵکو دەکرێتە خاوەن هۆش. کەواتە جیاوازی زۆرە لە نێوان ئەوەی دەخرێتە ناو هۆشمانەوە لەگەڵ ئەوەی هۆشمان بە ئازادی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

بە گوێرەی مێنتەلێتی بانکی وەك ڕێبازێك بۆ فێرکردن، ڕۆڵی مامۆستا ڕێکخستنی ڕێچکە و ڕێبازێکە بۆ ناردنی هەموو شتەکانی دەوروپشتمان بۆ نێو مێشکی فێرخواز. لێرەدا ئەرکی مامۆستا ڕێکخستنی پرۆسێسی ناردنە بۆ پڕکردنەوەی مێشکی فێرخواز بەو شتانەی کە بە مەعریفەیەکی ڕاستەقینەیان دادەنێت. سارتەر ناوی ناوە کۆنسێپتی خۆراکپێدان، کە مامۆستا هەڵدەستێت بە خۆراکپێدانی فێرخوازان بۆ ئەوەی تێریان بکات.

خەڵکی جیهان بە جیهانێکی نەرێنی و سەپاو و نەگۆڕ وەردەگرن، ئیتر ئەم میتۆدی فێربونە زیاتر دەیانکاتە بونەوەرێکی نەرێنی ناچاربن خۆیانی لەگەڵ بگونجێن. کەسی فێرکراو دەبێت بە کەسێکی زۆر گونجاو و ڕاهێنراو بۆ جیهان، ئەگەر لەم جۆرە فێربونە وردبینەوە لەگەڵ ئامانجی ستەمکاراندا گونجاوە. ئیتر واقیعە چەوسێنەرەکە بەردەوام دەبێت و ستەملێکراوانیش قبوڵیانە، چونکە وافێرکراون ئەم ئارامیە لە بەرژەوەندی گشت خەڵکدایە. هەتا تەبایی زۆرینە لەگەڵ ئامانجی کەمینەی هەژمونکار زیاتر بێت، زۆرینە بێبەش دەبن لە ئامانج و خەونە تایبەتیەکەیان. کەمینەی هەژمونکاریش ئاسود دەبن لە بێدەنگی و مێگەلێتی زۆرینە.

بەشی سێیەم

کاتێك وشە لە ڕەهەندە تایبەتەکەی خۆی کە پراکتیکە پەرت دەکرێت بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کاریگەری لەسەر بیرکردنەوە دەبێت، بەمجۆرە وشەکە دەگۆڕێت بۆ زۆر بڵێیی؛ واتە تەنها ڕازاندنەوە و جوانکاری لە وشەدا. لە لایەکیترەوە ئەگەر پێداگیری بکەین لەسەر پراکتیك واز لە بیرکردنەوە بهێنن ئەوە ئاقاری وشە دەگۆڕێت بۆ چالاکی سیاسی؛ واتە کار تەیا لە پێناو کار.

دیالۆگ بریتیە لە ڕوبەڕوبونەوەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدیدا، کە جیهان دەخەنە نێوان خۆیانەوە لە پێناوی ناولێناندا، دیالۆگ ئەو ئامرازە پێویستیەیە کە مرۆڤەکان تێیدا گرنگیی خۆیانی تیا بەدەستدەهێنن. دیالۆگی بونێکی پێویستە. دیالۆگ بەبێبونی خۆشەویستی قوڵ بۆ جیهان بۆ خەڵك نایەتەدی، زۆرجار ڕاهێنەرە سیاسیەکان قسەدەکەن، بەڵام ئامانج ناپێکن، چونکە خەڵکەکە لە قسەکانیان تێناگەن، چون بە زمانێك قسە دەکەن، لەگەڵ ڕەوشی ژیان و بژێوی و ئاستی ڕۆشنبیری و بیرکردنەوەی قسەبۆکراوەکاندا ناگونجێت و نایەتەوە قسەکانیان دەبێت بە گوتارگەلێکی و نامۆبوون دروستدەکات.

جیاوازی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ

ئاژەڵەکان ناتوانن بەرهەمێکی جیاوازیان هەبێت لە خۆیان، چەنکە چالاکیەکانیان کارێك نییە ڕوبەڕوبونەوەی پێکبێنێت. تەنیا مرۆڤەکان بونەوەرگەلێکی سەرقاڵ و خەریك و شارەزان دەتوانن پراکتیك بکەن. لەبەر ئەوە مرۆڤ بونەوەرێکە لەسەر گۆڕان و بونیادنان کاردەکات؛ بەردەوام لەگەڵ واقیعدا لە پێوەندیدا بۆ بەرهەمێنان، نەك تەنیا بەرهەمێکی ماددی، بەڵکو بەرهەمی دامەزراوەی کۆمەڵایەتیش.

کتێبی یانزەیەم: پەروەردە پێشەکیەکی زۆر کورت. - نوسینی: گاری تۆماس.
وەرگێرانی: پەرۆش محەمەد ساڵح.

چاپی یەکەم ٢٠٢٢

پرۆسەی پەروەردە گەشەپێدانە نەك گواستنەوە. سەرمایەداری بەڕێوبەرە و قوتابخانەش خزمەتکار.

ڕێڕەوی پێشکەوتنی مرۆڤی عاقڵ هەتا بێت زیاتر بەرزدەبێتەوە نەك تەنها لەبەر زیرەکی، بەڵکو لەبەر ئەوەشە کە ئەم چەشنەی ئێمە توانای شێوەپێدان و هەڵگرتنی مەعریفەی لە دەنگی تایبەت و زماندا هەیە. لە قسە نەمرەکانی ڕیفەوە لە فیلمی چیرۆکی بەشی ڕۆژئاوا: لە لەدایك بونەوە تاوەکو مردن هەمووی هەر پەروەردەیە. هەروەها ئێمەش ئەبێ بە گرنگیەوە لە بیرمان بێت کە پەروەردە تەنها ئەوە نییە لە قوتابخانەو کۆلێژ ڕوودەدات، بەڵکو هەموو ژیان هەر پەروەردەیە.

بۆ نمونە، مارك تواین دەڵێت: هەرگیز نەمهێشتوە فێرکردن لە قوتابخانە دەستوەربداتە پەروەردەمەوە. ئەمە لەو قسەی چەرچڵ دەچێت کە ئەڵێت: تەنها جارێك پەروەردەم گرفتی بۆ دروست بووبێت ئەو کاتە بووە لە قوتابخانە بووم. هەروەها ئەلبێرت ئەنیشتاین ڕایگەیاندووە کە: پەروەردە ئەو شتەیە کە دەمێنێتەوە دوای ئەوەی هەرچی فێربووین لە قوتابخانە بیرمان دەچێتەوە. پەیامی ئەم کەسانە ئەوەیە قوتابخانەکان پێویست نین بۆ پەروەردە، لەوانەیە گرفتیشی بۆ دروستکردبن. ئێمە چۆن گەشتین بەو جێگایەی کە زۆرێك لە مێشکە باشترینەکان، ڕقیان لەو کاتە بێتەوە لە قوتابخانە بەسەریان بردووە؟

قوتابخانە و پەروەردە

زانیاری ورد لەبارەی ئەوەی کە قوتابخانە لەسەرتاوە چۆن کاری کردووە، وشەی قوتابخانە لە وشەی (Schole)ی یۆنانییەوە هاتووە ئەوەی سەیرە ئەم وشەیە بە مانای کاتی دەستبەتاڵی دێت. ئایا ئەبێ ئێمە هەقیقەت و ئایدیاکان بە منداڵان بڵێینەوە و پێیان بڵێین لەبەر بکەن یان ئەبێ ئێمە هانیان بدەین کە خۆیان زانین بدۆزنەوە؟

دڕەندەی دیسپلین لە قوتابخانە گەشتوەتە ئاستێك، یەکێك لە چیرۆکەکانی نواندکانی هیرۆنداس ڕاست بێت. باس لەوە دەکات، دایکێك کوڕە لاسارەکەی دەبات بۆ لای مامۆستاکەی، گلەیی لاساری و تەمبەڵی کوڕەکەی دەکات لای مامۆستاکەی. دایکەکە

داوا لە مامۆستاکەی ئەکات: ئەونە لە کوڕەکەی بدات تا نیوە گیانی ئەکات. وە بە مامۆستاکەی دەڵێت: ئەمە تەنانەت ئەلفبێش نازانێت تاوەکو پێنجار هاوار نەکەیت بەسەریدا. مامۆستای قوتابخانەکەش کە ناوی لامپریسکۆسە هەر زوو ڕازی دەبێت و دەڵێت: شوڵەکەم کوا؛ ئەو شوڵی مانگاییە، بەکاری دێنم بۆ لێدانی ئەو ساختەچیە بێزخانە، بیدە دەستم بەر لەوەی ڕق و تورەی بمخکێنێ. لێدانەکە بەردەوام دەبێت لە کۆتایدا لامپریسکۆس وازی لێدێنێت، چونکە کوڕەکە نیوە گیان بووە بەڵام دایکی دەڵێت: مەوەستە تاوەکو خۆرئاوابوون.

ئۆگەستینی هیپۆ لە سەدەی چواردا دەڵێت: من نێردراومەتە قوتابخانە بۆ فێربوون کە نەمدەزانی سوودی ئەم فێرکردنە چیە، بەڵام هێشتاش ئەگەر هێواش بووایەم لە فێربوون لێدانم ئەخوارد. ئەگەر سەیری قوتابخانە بکەین بە درێژایی مێژوو ناچار بەو دەر ئەنجامە دەگەین کە بەردەوامی لە بەکارهێنانی سزادانی جەستەیی بەستراوەتەوە بەو چاوەڕوانیەی لەو منداڵانەی هەبووە کە تێیدا بوون. لێدان لە ڕاستیدا بیرێکە جەختی زۆری لێکراوەتەوە.

بە نابەدڵی بۆ قوتابخانە

هەنگاوێ برۆ پێشەوە ئەوروپای سەردەمی شکسپیر و ساڵی ١٩٥٧؛ خۆری ڕێنسانس ئەدرەوشێتەوە و فێربوون دیسانەوە باوی هەیە. لەوکاتەدا قوتابخانەی شێوەی ئێستای وەرگرتووە. داهێنانی چاپ لە سەدەی پانزە(١٥) وایکرد خوێندەواری بۆ بڕێکی زیاتری خەڵك گرنگ بێت و بڕەخسێ. ئەو پەنجەرانەی بەڕووی فێربوندا کرانەوە هێندە فراوان بوونن کە پەروەردە ساواکان لە ئاستیدا حەپەساوین. پەروەردەکاران دەیانویست منداڵ هەموو شت فێربێت، بابەت لە دوای بابەت هەقیقەت لە دوای هەقیقەت، یاسا لە دوای یاسا بە منداڵ ئەوترایەوە، بەم شێوەیە قوتابخانەکان پرۆگرامیان برەو پێدەدا. لە فێربوندا بابەت بوو بە سەنتەر نەك فێرخواز. زۆرینە فێربوون بۆ زۆربەی فێرخوازان شتێکی وشك و بێڕۆحە؛ بە ئەگەرێکی زۆرەوە حەزی فێربوون هە لە سەرەتاوە دەکوژێت لەبری ئەوەی گەشەی پێبدرێت و بەرهەمی هەبێت. شکسپیر لە درامای چۆنت ئەوێتدا جوان باسی کردوە: پاشان منداڵەکە بە نوزەنوز، بە جانتا و بە ڕوخسارە درەوشاوەی بەیانیان، وەکو شەیتانۆکە لەسەرخۆ و بە نابەدڵی دەڕۆشت بۆ قوتابخانە.

بانگەوازەکان بۆ گۆڕانکاری

ڕۆژێك لە ڕۆژان شتەكان زۆر سادەبوون: منداڵ ئەو شتانە فێردەبوون كە پێویست بوو فێریبن بۆ پیشەیەك یان كارێك ئامانجێكی ڕوون هەبوو لە شتەكەدا. پاشان ڕێنیسانس هات و دونیایەك فێربوونی خستە بەردەست بۆ چێژ لەوە ببینین پێشتر فێری بوون. فێربوون بۆ ئەوە بوو خۆت بیربكەیتەوە. بەڵام كۆمەڵێك دەنگ پەیدا بوون كە دەیانوت دەكرێت شتەكان جیاوازبن. فێربوون لە پێناوی فێربوون. ڕۆجەر ئاشام مامۆستای ئێلیزابێسی یەكەم، برەویدا بە فێربوون لە ڕێگەی ئەنجامدانەوە. لە كتێبی مامۆستای قوتابخانە: منداڵەكەت گەورە مەكە بە فێركردن لە ڕێگەی ترس و تۆقینەوە، بەڵكو بە یاری و بە خۆشی فێری بكە.

یەكێك لەو كەسانە بۆ یەكەمجار بە شێوەیەكی سیستەماتیك بیری لەوە كردوەتەوە بە جدی بیر لەوە بكرێتەوە ئێمە بۆچی وانە بە منداڵ ئەڵێینەوە مامۆستایەكی چیكی بوو بە ناوی كۆمینۆس (١٥٩٢-١٦٧٠) ئەو داوای دەكرد پەروەردە بۆ هەمووان بێت، لە كتێبی دیداكتیكا ماگنا جەختی لە گشتیبونی پەروەردە ئەكاتەوە. كۆمینۆس دەڵێت: نابێت هیچ شتێك بە منداڵ بوترێتەوە تاوەكو نەك هەر ڕێگەپێدراو بێت، بەڵكو پێویستە لەگەڵ تەمەن و توانای زیهنیشیدا گونجاو بێت.

فەیلەسوفی سویسری جان جاك ڕۆسۆ بە كتێبی ئێمیل دونیای توشی شۆككرد، ئێمیل ناوی فێرخوازە پاڵەوانەكەی ڕۆسۆیە، لە لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی منداڵ پەروەردەكردنەوە ڕۆسۆ دەڵێت: لە جێی ئەوەی ئێمیل لە ژورێكی پڕ لە شتدا بیهێڵیتەوە بیبە دەرەوە بۆ مێرگێك؛ با بۆ خۆی بگەڕێت، لێیگەڕێ هەوڵبدات و بكەوێت دوبارەوە چەندبارە، تا زیاتر بكەوێت باشتر چون زووتر فێردەبێت هەستێتەوە. فێرخوازەكەی من لە فێرخوازەكانی ئێوە زیاتر ئازاری بەردەكەوێت، بەڵام هەمیشە دڵی خۆشە. ڕەنگە فێرخوازەكانی ئێوە برینی كەمتریان پێبكەوێت، بەڵام هەمیشە خنكاون، بەستراونەتەوە و دڵتەنگن. كتێبی ئێمیل بوو بە پڕفرۆشترین كتێبەكانی پاریس، بەڵام لە كۆتایدا لە پاریس قەدەغەكرا و لە جنێفیش سوتێنرا.

دوای ڤیكتۆریا

ساموێل باوڵز و هێربەرت گینتس لە كتێبەكەیان بە ناوی فێركردنی قوتابخانە لە ئەمریكای سەرمایەداری باس لەوە دەكەن و دەڵێن: قوتابخانەكان ئێستا بوون بە ئامرازی سیستەمی ئابوری باڵادەست. سەرمایەداری؛ ئامێرە پیشەسازیە سەربازیەكە بووە بە بەڕێوبەری جێبەجێكار و قوتابخانەش خزمەتكاری. سەرمایەداری پێویستی بە

کرێکارێك بوو کە جۆرێك زانیاری تایبەتی هەبوایە و بیتوانیبایە ئیشی پێبکات، قوتابخانەش ئەوەی بۆ دابینکرد. لە ساڵی ١٨٧٠دا لە پەرلەمانی بەریتانیا یاسایەك دەرکرا کە پەروەردەی منداڵ تاوەکو تەمەنی دە (١٠)ساڵیکرد بە ئیلزامی. ئەزانین کە یاساکە دەرکرا نەك لە ڕوانگەی هەستکردن بەوەی کە خەڵکی پێویست بوو بیریان فراوان بکەن؛ پاڵنەرەکە نە خۆشویستنی فێربوون بوو، نە ئارەزووی زیندوو هێشتنەوەی داهێنانەکانی زانست و شکۆمەندیەکانی ڕابردوو لە نەستی کرێکاراندا، بەڵکو پاڵنەرەکە زیاتر لەو ترسەوە سەرچاوەی گرتبوو کە نەتەوەکەیان لە پێشبڕکێدا بدۆڕێت، بەهۆی نەبوونی هێزی کارەوە کە پەروەردەیەکی بنەڕەتی هەبێت. سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا ویلیام گلادستۆن لە گۆڤاری ئێدنبرە ڕیڤیو لەبارەی سەرکەوتنە گرنگەکانی پروسیاوە لە دژی فرانکەکان دەدوێت و دەڵێت: بێگومان شێوازی کامپەینی لایەنی ئەڵمانی سەرکەوتنێکی دیاری پەروەردەی گشتی بوو  بە شێوەیەکی سیستەماتیکی. کەواتە هۆکارەکە لە  پشت خوێندنی زۆرەملێوە سودگەرایی بوو: لەو  چاوەڕوانەییەوە سەرچاوەی گرتبوو کە ئەمە ئەبێتە هۆی سەرکەوتنی پیشەسازی و هەتا سەربازیش. مێژونوسی کۆمەڵایەتی جی ئێم ترێڤلیان (١٩٧٨) ئەڵێت: پەروەردە، دانیشتوانێکی زۆری پێداوین کە ئەتوانن بخوێننەوە، بەڵام ناتوانن ئەوە جیابکەنەوە کە شایەنی خوێندنەوەیە. پرسیارێك دێتە ئاراوە. ئایا منداڵ و گەنجان بۆچی لە قوتابخانەن؟ ئێمە ئەبێت بیربکەینەوە لەبارەی ئامانج و ئایدیاڵەکانی پەروەردەوە نەك تەنها ئەو پرۆسانەی لە ڕێگەیانەوە پەروەردە ئەنجامدەدرێت.

بەشی دووەم

نەوت و ئاو: فەرمی و پێشکەوتنخواز

ئایا قوتابخانە بە شێوەیەکی سەرەکی کاری ئەوەیە زانین و شارەزایی بگەیەنیت بە نەوەی نوێ، ئەگەر وایە کام شارەزای و کام زانین؟  یان کاری ئەوەیە جەختبکاتەوە لە گواستنەوەی ڕەوشت و هەڵسوکەوت و نەریتی کلتورێك؟ ئایا پەروەردە ئەبێ پابەندبوون بە ئایدیا و بەهاکانی کۆمەڵگایەکەوە هانبدات یاخود ئەبێت خەمی برەودان بێت بە کەسێتیەکی پرسیارکەر، بیرئازاد و ئاڵنگار؟ پوختەی دیبەیتە گەورەکەی پەروەردە لەسەر ئەوەیە کە چەندێ گرنگی بدرێت بە فێربونی ڕاستیەکان و چەندێك بە هاندان بۆ بیرکردنەوە.

دوو دەستە ئایدیا: دوو نەریت

ئەو ناکۆکیانەی لەسەر ئەوەی کە پێویستە پەروەردە دەربارەی چی بێت شتێکی نوێ نییە. گریمانەیەکمان نییە لەلایەن هەمووانەوە قبوڵکراو بێت دەربارەی ئەوەی منداڵ چی پێویستە فێربێت وەکو فەزیلەت یان باشترینەکانی ژیان. هەروەها ئەوەش ڕوون نییە کە ئایا پەروەردەکەیان بەو شێوە بکرێت کە بایەخی زیاتر بە مێشکیان بدرێت یاخود کارەکتەری ڕۆحیان. پرسیارەکان بەم شێوەیە کورتکراونەتەوە.

١-ئەبێ چۆن لە زانین بڕوانین؟ ئایا بڕێك زانین هەیە ئێمە پێویستە تۆمار بکەین، کۆی بکەینەوە و بیگوازینەوە بۆ نەوەی دواتر؟ یاخود زانین شل و کاتیە و سودی زۆری هەیە ئەوکاتەی خۆت ئەیدۆزیتەوە و وەریئەگریت؟

٢-ئەبێ چۆن لە فێربوون بڕوانین؟ ئایا فێربوون ئەوەیە ئەوەیە بە سەلماندنەوە نیشانی بدەیت کە ڕاستی و شارەزاییەك فێربوویت یاخود نیشاندانی توانای بیرکردنەوە و چارەسەر کێشە؟

٣-ئەبێ چۆن لە منداڵ بڕوانین؟ ڕۆڵی ئێمە لە گەشەکردنی ئەواندا ئەوەیە کەمتر بیر لە ئامادەکردن بکەینەوە و زیاتر بیر لە گەشەپێدانیان بکەینەوە؟ لەبەر ڕۆشنایی ئەم پرسیارانەدا دوو نەریتی پەروەردەی هەیە.

پێشکەوتنخوازان

یەکەم کەس جان جاك ڕۆسۆ لە کتێبی ئێمیل ئەم پرسەی وروژاند، ڕۆسۆ پێیوایە: منداڵ بیرفراوانە، فێرخوازێکی ئامادە و بە پەرۆشە. سەرنجی دابوو منداڵ لە ئەزمونەوە فێردەبێت نەك بەوەی ڕاستیەکانی بە زۆر پێبدرێت. منداڵ زانای بچوکن. بە تاقیکردنەوە و ئەزموون، هەوڵدان و هەڵەکردن لە کاتی مامەڵەکردن فێردەبن.

جۆن لۆك لە کتێبی چەند بیرێك لە بارەی پەروەردەدا لە بارەی فێربونی خوێندنەوەو دەڵێت: ئەبێ بایەخ زۆر بەوە بدرێت کە منداڵ شتەکە وەك ئیش وەرنەگرێ یان وەك ئەرك تەماشای نەکات. ئێمە بە سروشتی... هەر لە بێشکەوە شەیدای ئازادین هەر لەبەر ئەوەشە ڕقمان لە زۆر شتە لەبەر هیچ نا تەنها لەبەر ئەوەی پێمان ئەوترێت ئەنجامیبدەین. جۆن لۆك پێیوایە فێربوون بە خۆشیەوە دژی زۆرلێکردن بوو، دروشمەکەی لۆك ئەوەیە (بیکە بە یاری). تەنانەت لۆك داوا دەکات لە دایبابان و مامۆستایان خەمی ئەویان نەبێت کە منداڵەکان زوو فێری خوێندنەوە بکەن. وە دەڵێت (باشتر وایە ساڵێك درەنگتر فێری خوێندنەوە بێت باشترە لەوەی بەم هۆیەوە ڕقی لە

فێربوون بێت). جۆن زۆر دووربین بووە لە ئێستادا ئەو وڵاتەی بەرزترین ڕێژەی خوێندەوارەی لە ناو منداڵاندا هەیە فیلنەدایە، شتەکەش ڕوونە کە تەمەنی چوون بۆ قوتابخانە لە فیلەندا درەنگترە لە هەموو وڵاتانی جیهان. کتێبەکەی جۆن لۆك پاش ئەوە نوسی کە ساموێل بەتلەر دروشمی (گەر دار بەکارنەهێنی منداڵ پەروەردە نابێت)ی لە شیعرە ساتیریەکەدا بە ناوی هودیبراس نەمر کردبوو. ئەتوانین بڵێین لۆك یەکەم پەروەردەکاری پێشکەوتنخواز بووە نەك تەنها لەبەر ئەوەی هانی هاوسەردەمەکانی خۆی و ئەوانیتریشیداوە کە بیر لە منداڵ بکەنەوەوەکو جۆرێکی تایبەتی فێرخواز، بەڵکو لەبەر بۆچونەکانی لەبارەی ڕۆڵی پەروەردە لە برەودان بە شێوازێکی حوکمڕانی لیبراڵ و کراوە.پەروەردە هەمیشە جێگای بایەخی ئەوانەبووە کە ویستویانە کۆمەڵگە بگۆڕن و چاکی بکەن.

یۆهان پێستالۆزی سویسری پێشوازی لەم بیرۆکەی لۆك و ڕۆسۆی کرد، پاشان فریدریك فرۆبێل فێرخوازی پێستالۆزی جەختیکردەوە لەسەر منداڵی بچوکتر یەکەم کەس بوو وشەی (Kindergarten) وشەی دانا بە مانای باخێ بۆ منداڵ. لە ساڵی ١٨٢٦ کتێبی پەروەردەی مرۆڤی بڵاوکردەوە، کە جەختدەکاتەوە لەسەر چالاکی داهێنەرانە و کردەیی لەگەڵ یاریکردن. فرۆبێل پێیوایە: پەروەردە پڕۆسەی گەشەپێدانە نەك گواستنەوە.

ماریا مۆنتسیۆری لە ئایدیاکانی پێستالۆزی و فرۆبێلەوە میتۆدەکەی خۆی لە ساڵی ١٩٠٠ کانەوە گەشەپێدا، کە پشت ئەبەستێ بە کۆمەڵێ ئەرکی کرداری وەکو پاراستن و چاودێری کەسی و پاراستنی ژینگە، هەروەها سەربەخۆی کردبووە سەنتەری پرۆگرام. جوڵەکان بە ئاڕاستەی پەروەردەیەکی پێشکەوتنخوازی سەرانسەری زیاتر تاقیکاری بوون بە بچڕ بچڕی و لە پرۆژەی بچوك تایبەتدا ڕوویاندەدا. یەکێك لەمانە قوتابخانەی هامپستێد بوو لە ساڵی ١٨٩٧ کرایەوە بۆ ئەوەی باشترین میتۆدەکانی پەروەردە هەیە بکاتە پراکتیك، بەتایبەت ئەوانەی پێستالۆزی و فرۆبێل، گرنگی بە حەز و ویست دەدا تاوەکو زاکیرە، سزا و پێشبڕکێ بوونی نەبوو.

قوتابخانەی تاقیگەیەکی جۆن دیوی لە ساڵی ١٨٩٦ بەو مەبەستە دامەزرا کە پەروەردەیەکی پێشکەوتنخواز پێشکەش بکرێت کە لەو کاتەدا لە قوتابخانەکانیتری ئەمریکا بوونی نەبوو. ئامانجی دیوی ئەوە بوو قوتابخانەیەك دروست بکات کە ببێ بە کۆمەڵگایەکی هەرەوەزی تێیدا فێربوون لە ڕێگای پەیوەست بە ژیانی ڕاستەقینەوە جێگای میتۆدە میکانیکی و دوبارەکانی وانە وتنەوە بگرێتەوە.

فەرمی لە بەرامبەر پێشکەوتنخواز

لای فەرمییەکان کەلتور و شارستانییەت زەخیرەیەکن لە ئایدیا و حیکمەت کە پێویستە بدرێنە دەست نەوەی تازە. فێرکردن چەقی ئەم گواستنەیە پێکدەهێنێت و ئەم پرۆسەی گواستنەوەش خودی پەروەردەیە. لە کاتێکدا پەروەردەکارە پێشکەوتنخوازەکان گرنگی ئەدەن بە گەشەکردنی منداڵ لە ناوەوە، فەرمییەکان بە پێچەوانەوە جەخت ئەکەنەوە لە پێکهێنانی منداڵ لە دەرەوە، پێکهێنانێك کە لە نقومبوون لە زانیاری، ئایدیا، باوەڕ، تێگەشتن و دنیابینینی کۆمەڵگە – فەرمییەکان جەختدەکەنەوە لە خودی گواستنەوەکە. پێشکەوتنخوازەکانیش زیاتر جەختدەکەنەوە لەسەر ئیندەکشن، لە دەستپێکردن بە دەرگیربوون لەگەڵ ئایدیا دامەزراوەکانی کلتورەوە. ئەم بیرۆکەی ئیندەکشنە لە لایەن فەیلەسوفی سەدەی بیستەمەوە مایکڵ ئۆکیشۆتەوە بە وردی و جوانی ڕونکراوەتەوە. ئۆکیشۆت پەروەردەی وەك گفتوگۆی مرۆڤایەتی تەماشا دەکرد، کە مامۆستایان فێرخوازان دەبەنە نێو گفتوگۆکەوە کە چۆن گوێبیستی دەنگی نەوەکانی پێشتر ببین و لە هەمانکاتدا دەنگی تایبەتی خۆیان چێبکەن.

پەروەردە ئایا دۆزینەوەی ڕێگایە یان فێربوونی زانیاری و شارەزاییە؟

بۆ پێشکەوتنخوازەکان پەروەردە پاڵپشتیکردنە لە توانای ڕەخنەیی؛ ئەبێ منداڵ ناوەند بێت و تیشکی لەسەر چارەسەری کێشە بێت. بەڵام لای فەرمییەکان پەروەردە پرۆسەی گواستنەوە و وەرگرتنی شارەزای و زانیاری پێویستە بۆ ئاسودەی و سەرکەوتن لە ژیاندا.

فێربوون... ئاسان یان گران.

بۆ پێشکەوتنخوازەکان فێربوون سروشتیە؛ شتێکە هەموو کاتێ لە ڕووداندایە و مرۆڤ بۆ فێربوون بەرنامە کراوە. بۆ نمونە منداڵ بە بێ فێرکردن فێری قسەکردن ئەبن. بە مەرجێك منداڵان لە جێگەیەك دابنێین کەدەرفەتی بیرکردنەوەیان هەبێت نەك پێیان بڵێین بیر لەچیدەکەنەوە. بەڵام بۆ فۆرمەلیستەکان فێربوون کارێکی سەختە، ئازار نەچێژی هیچت دەستناکەوێت.

دۆزینەوە یان دەسەڵات؟

پێشکەوتنخوازەکان پەروەردە وەك دۆزینەوە و یاری دەبینن، بەڵام فۆرمالیستەکان ئەڵێن جەختکردنەوە لە دۆزینەوە پشتگوێخستنی ئەو نیگارەیە لە ئایدیا، یاسا و نەریتە چەسپاوانەیە کە لە پێشینانەوە پێمانگەشتووە. شتێکی هەڵەیە چاوەڕوانی ئەوەبین

منداڵ ڕاستیەکان بۆ خۆی و بە تەنها بدۆزێتەوە. هەروەها دەڵێن هیچ شەرم و خیانەتێکی فیکری نییە کە ئەوترێت شتەکان باشتر فێر ئەبین کاتێك خۆمان بیدۆزینەوە، بەڵام ئەمە ئینکاریکردنی میراتێکە لەو ئایدیانەی کە کۆ تێگەشتنیان لەبارەی دونیای هاوچەرخ پێکهێناوە.

پرسیار لەبارامبەر چواچێوە و ئاسایش

شێوازی پێشکەوتنخواز دەیەوێت مێشکێکی پرسیارکەر لە منداڵدا گەشەپێبدات. بەدەر لەو ڕاستیەی کە کرۆکی مەیلی زانستی ئەوەیە پرسیارکەر و گومانکەربیت، ئێمە پێویستە هانی پێکهێنانی زەینی ڕەخنەش بدەین. پێویستە هەمیشە سیاسەتمەدار و سەرکردەکان بخرێنە ژێر لێپرسینەوەوە. فۆرمالیستەکان هاوران لەسەر پێویستی هاوڵاتیەکی پرسیارکەر کە قسەی سیاسیەکان وەك خۆی وەرناگرێت، بەڵام پێیان وایە ئەم تەمەنە ناسکەی منداڵ کاتێکی گونجاو نییە بۆ تاقیکردنەوە و هاندانی ئەم ڕوانینە. لە ڕاستیدا منداڵان حەزیان لەوەیە بزانن ڕوانینیان چییە نەك ئیەی خۆیان لەباری کێشە گەورەکانەوە بڕیار بدەن.

شاگردی یان فێرکردن؟ تاکەکان یان گروپەکان یان هەموو پۆلەکە

پێشکەوتنخوازەکان دەڵێن منداڵ یەك یەك یان بە گروپ باشتر فێردەبن فۆرمەلیستەکان ئەمە لە هەردوو بارەکەدا پراکتیکی نییە چونکە یەك مامۆستا هەیە بۆ سی فێرخواز، ئەی چسبکەین بۆ ئەوانیتر کاتێك تۆ تەنها وانە بەیەك فێرخواز دەڵێتەوە.

هاندانی ناوەکی یان دەرەکی؟

چۆن فێرخوازی منداڵ هانبدرێ کە ئەرکێك ئەنجامبدات؟ چۆن حەزی فێربوونی لا بورژێنێت و ئاگایی ئاڕاستە بکات؟

پێشکەوتنخوازەکان تاکە جۆرێکی هاندەر ماناداربێت حەزلێکردن و نقومبوونی فێرخوازە لە ئەرك یان بابەتێکدا هاندانی ناوەکیە. فۆرمالیستەکان ئەڵێن ئەمە ئایدیاڵیە و بەدەستهێنانی ئەستەمە و لەگەڵ دونیای ڕاستەقینەدا نایەتەوە. هاندان بۆ فێربوون ئەبێ لە دەرەوە بێت واتە هاندانی دەرەکی.

نەریتەکان ئەکرێنەوە لە ئایدیاوە بۆ کردار

لە پراکتیکدا بەشێکی کەمی مامۆستاو قوتابخانەکان دابەش ئەبن بەسەر دوو بەرەدا پێشکەوتنخوازەکان و فۆرمالیستەکان، بەڵام لە ڕاستیدا هەریەك لەو بۆچونانە بەشێك لە هەقیقەتیان تێدایە. بەو پێیە پرسیارەکە ئەمە یان ئەو نییە، بەڵکو چەندێك لە هەردووکیان؟

مامۆستایانی قوتابخانە سەرەتاییەکان زیاتر سود لە بەرنامەی پێشکەوتنخوازەکان دەبینن تاوەکو هاوپیشەکانیان لە خوێندنگە ئامادەییەکان.

پۆل و کاری گروپ

ئەوانەی سەردانی قوتابخانە حوکیەکانیان کردوە لە ڕۆژئاوا ئەبین منداڵان بە شێوازی گروپ ڕێکخراون، ئەمجۆرە ڕێکخستنە بەرهەمی کاریگەری بیرمەندە پێشکەوتنخوازەکانە. ئایدیاکە ئەوەیە منداڵەکان لەناو ئەم گروپانەدا بتوانن، کاری پێکەوەی، گفتوگۆ، هاوکاری، ئاڵوگۆری ئایدیا و تاقیکاری بکەن. کاری گروپ باشیەکەی ئەوەیە کاری هەرەوەزی تێدایە، خراپیەکەشی ئەوەیە فێرخواز ئەتوانێ چاوبڕێتە هاوڕێکانی و لە کارەکانی خۆی بدزێتەوە. بیرۆکەی کوالیتی بیرکردنەوە لە لایەن هەردوو نەریتەکەوە ناکۆکی زۆری لەسەرە، هەندێکیان پێیان وایە کوالیتی لە بیرکردنەوە، کۆڵنەدان، تێگەشتن و خەیاڵ دەگرێتەوە. هەندێکیشیان دەڵێن دروستی، خێرایی میمۆریە.

لە کتێبی ستایلەکانی فێرکردن و پێشکەوتنی فێرخواز نێڤل بێنتێدا دەڵێت: بە کورتی فێرکردنی فەرمی ئامانجە ئەکادیمیەکانی بەدەستدەهێنێت بە بێئەوەی زیانی بۆ گەشەی سۆزداری و کۆمەڵایەتی فێرخواز هەبێت، لەکاتێکدا فێرکردنی پێشکەوتنخواز بە نیوەناچڵی بە ئامانجەکانی دەگات لە گەشەپێدانی لایەنی سۆزداری و کۆمەڵایەتی، بەراورد بە فەرمیەکەش ئامانجە ئەکادیمیکانی کەمترە. لە ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٠١ کۆنگرێس یاسایەکی دەرکرد (هیچ منداڵێك بەجێناهێڵین) کە دەیویست بەرپرسیارێتی قوتابخانەکان زیاد دەکات لە ڕێگەی کۆمەڵێك پێوەرەوە؛ یەکێك لەو پێوەرانە داوا لە مامۆستایان دەکات لە بارەی جۆرە زانستیە سەلمێنراوەکانی پراکتیکەوە کە مامۆستا پێویستە بەکاریبهێنن. دەبێت تەنها باشترین میتۆدی وانەوتنەوە بەکاربهێنێت و تەنها مەنهەجێك کە زانستیانە سەلمێنراوە ئەبێت پەیڕەو بکرێت. فەرمانی لەمجۆرانە بە ئەنقەست ئەو شارەزاییانەی مامۆستا کە خۆی گەشەیپێداوە نادیدە ئەگرێت. ئامارە نێودەوڵەتیەکان ئاماژە دەکەن بۆ ئەدای فێرخوازان دوای جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە بەڵام

بەرەوپێشچونێکی زۆرکەم نیشاندەدەن. لە بەریتانیاش لە سەرەتای سەدەی ٢١بیستویەك ستراتیجی خوێنەواری نەتەوەیی ڕاگەیاند، لەسەرەتادا وەها دیاربوو سەرکەوتووە، بەڵام هەروەکو ئەوەی لە زۆر نوێکاری لەمجۆرەدا ڕودەدات کە کاریگەریەکەیان خێرا نەمان. هەروەها لە ساڵانی ١٩٧٠ بۆ ١٩٨٠ لە ئەمریکا جێبەجێکردنی میتۆدێکیان ڕاگەیاند بە ناوی میتۆدی فێرکردنی ڕاستەوخۆ؛ فێربونی شارەزاییە سەرەکیەکان و بەکارهێنانی میتۆدی بێ مامۆستا. لە سەرتادا ئومێدێکی زۆریان لەسەر هەڵچنی، بەڵام لە کۆتایدا دەرکەوت کە ئەو منداڵانەی مەنهەجی فێرکردنی ڕاستەوخۆیان هەبووە بە ئەگەری زۆرەوە تێوەگلاون لە تاواندا، کەمتر گونجاو بوون و کەمتر بەشداربوون لە چالاکیە جڤاتیەکاندا بەراورد بەوانەی بەشداری خوێندنی نەریتی بوون. ئەو شکستانە نابێت توشی سەرسوڕمانمان بکەن، لەبەر ئەوە مامۆستایان بێتوانا دەکەن، ڕێگری دەکەن لەوەی مامۆستایان وەکو تاکی بیرکەرەوە کاربکەن و کاردانەویان هەبێت ئەوکاتەی بە گونجاوی ئەبینن. ئەم دەستپێشخەرانە مامۆستایان لە جوڵە دەخەن؛ لە ئەزمون و زیرەکی خۆیان وەکو پیشەگەرێ دایان ئەبڕێ. داڕێژەرانی پەروەردە دەبێت لە فیلەندیەکانەوە فێربن کە ڕێگای بێمامۆستا ناسەپێنن، لەبری ئەوە بەردەوامن لە ڕێزگرتن لە شارەزایی، زانین و پیشەگەری مامۆستا. مامۆستایان ڕێزیان لێدەگیرێت، موچەیان باشە، متمانەیان پێکراوە کاری باش ئەنجامبدەن.

ئایدیا گەورەکانی سەدەی بیست

سەدەی ٢١بیستویەك سەردەمی گۆڕانکاری نائاسیی بوو. دیمەنە سیاسی و فیکریەکان گۆڕانیان بەسەردا هات، پەروەردەش بەدەرنەبوو لەمە، خەڵکی کەوتنە پرسیارکردن لەبارەی ئامانجی قوتابخانە.

جۆن دیوی و هاوڕێکانی

هەموو ئەمانە لە پەروەردەدا لەوکاتەدا ڕویاندا کە وەرچەرخانێك هەبوو لە ئەوروچاوە بەرەو ئەمریکا وەکو ناوەندی هزری پەروەردەیی. سەدەی بیست هەلومەرجێکیان بۆ دیوی ڕەخساند کە بە جدی بەرەنگاری میتۆدە باوەکان ببێتەوە، ئەو لەبارەی پەروەردە بە دیموکراسیەوە دەدوا ئەمەشی لە چوارچێوەی ئەو شێوازانەدا جێکردەوە کە قوتابخانە و پۆلەکانی تێدا ڕێکدەخرا. دیوی فەیلەسوف و دەروناس و پەروەردەکار و تیۆریستێکی سیاسی باش بوو. لە فەلسەفەدا پراگماتیکیانەی بە پێویست دەزانی؛ لە دەرونناسیدا جەختی لەوە دەکردەوە کە پێویستە ژینگەی کۆمەڵایەتی فێرخواز بە هەند

وەربگیرێت. هەرچەندە دیوی نوسینی زۆرە، بەڵام کارەکانی لە ڕوی کوالیتیەوە تێکەڵە، زمانی ڕەوان نییە و ناڕونیەکەشی لە نوسیدا لە قسەکردنیشدا قەرەبووی نەدەکردەوە. جۆن دیوی لە کتێبی ئەزمون و پەروەردەدا دەپرسێت: چەن فێرخواز وایانکێکراوە بایەخ بە هیچ ئایدیاك نەدەن؟ چەند خولیای فێربونیان تێدا کوژراوە بەرئەنجامی ئەزموونی هەڵە لە فێربووندا؟ چەندیان کتێبی فێربوونیان لەلا بووە بە بارێکی گران و تەنها چاوی پێدا دەخشێنن؟ دیوی ئەڵێ منداڵ بە زگماکی زانایە. لە سەرەتای کتێبی ئێمە چۆن بیردەکەینەوە دەڵێت: هەڵوێستی ڕەسەن و نەشێواوی منداڵی کە بە حەزی فێربوون خەیاڵی بە پیت و شەیدای لێکۆڵینەوەی ئەزمونی ناسراوە زۆر نزیکە لە هەڵوێستی بیرکردنەوەی زانستی. هەروەها دەڵێت: شێوازی زانستیانەی چارەکردنی کێشەکان زیاتر لەوەدا خۆی ئەبینێتەوە کە منداڵ فێری هەوڵدان و هەڵەکردنی بکەیت نەك هەندێك ئامراز و میتۆدی تایبەتی پێبدەیت. پێویستە منداڵ فێربکرێت ڕەخنەگربێت، ئەمە زۆر لەوە قورسترە کە فێری بکەیت ئەوەی تۆ دەیڵێیت بە بێپرسیار قبوڵی بکات. وەرگرتنی شتێك بە بێپرسیار ئاسانە، بەڵام بۆ پەروەردە وێرانکەرە. جۆرە کەسێك دروستدەکەن کە زیانی ئەبێت بۆ توانای تێڕامان لە شتەکان.

دیوی لە کتێبی باوەڕ و بیرکردنەوە بە تێڕامانەوە پێیوایە بیرکردنەوە بە تێڕامانەوە کرۆکی پەروەردەیە؛ پەروەردە فێربوونی ڕاستی و زانیاری نییە بەڵکو گومانکردن و ڕەخنەگرتنە. دیوی جیاوازی دەکات لە نێوان زانیاری و زانینەوە، دەڵێت قوتابخانەکان سەرنج دەخەنە سەر زانیاری لەسەر حسابی زانین. دیموکراسی (شێوەیەکی ژیانی پێکەوییە، ئەزمونێکی یەکگرتووی ئاڵوگۆڕکراوە). ولیام کیلپاتریکی فێرخوازی دیوی دەڵێت: قوتابخانەکان ئەبێت هاوڵاتی باشتر و وریاتر دروستبکەن، هاوڵاتیەك کە بتوانێت بیربکاتەوە و کاربکات، زۆر لەوە زیرەکتر و ڕەخنەیتر بێت کە سیاسیەکان بە ئاسانی بتوانن کڵاوی لەسەر بنێن.

پلاودنی پێشکەوتنخواز

لە ساڵانی سەردەمی جەنگ لە ئەمریکا نەوەیەکی نوێی مامۆستایان بە ئایدیاکانی دیوی پەروەردە ئەکران، بەڵا لە ئەوروپا جگە لە دیوی کاریگەری هەندێك بیریاری گەورەشی تێدابوو وەك ئەی ئێس نێڵ و ماریا مۆنتیسۆری. لە بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٠ بۆ ١٩٣٠ ڕاپۆرتی بۆردی پەروەردە دەرچوو لە بارەی کۆمەڵێك پرسی پەروەردەوە بە سەرۆکایەتی ویلیام هادەو، ڕاپۆرتەکەیان دەڵێت: دەبێت مەنهەج زیندوو و واقعیانە بێت، جۆگەلەیەکی جوڵاو بێت نەك گۆمێکی مەنگ. لە دوای ئەوە ڕاپۆرتەکەی خاتوو پلاودنی

که له ساڵی ١٩٦٠ بڵاوکرایەوە کە بە شێوەیەکی رێکخراو ئایدیاکانی پێشکەوتنخوازی هێناوەتە پێشەوە. ڕاپۆرتەکەی پلاودن دەڵێت: هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی لە نێوان ساڵانی ١٩٠٠ بۆ ١٩٦٠ ڕویانداوە بێپلان و بێهاوئاهەنگی بوون- ئەمەش پاساوی هەیە چونکە دوو جەنگی جیهانی ڕویداوە و بە دوایدا قەیرانی ئابوری. لە ڕاۆرتەکەدا دەپرسێت ئایا، سەلمێنراو لە پێگوتن باشترە؟ زانیان بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیتریتر سەردانی قوتابخانەکانی دانیمارك، فەرەنسا، سوید، پۆڵەندا، ئەمریکا و یەکێتی سۆڤێتیان کرد، ئەوکات سەرنجیاندا خەمەکان هەمان خەمن، لە هەموو شوێنێك کێشەکان کێشەی: مەنهەج، شێوازەکانی وانەوتنەوە، چۆن مامەڵە لەگەڵ منداڵی توانا جیاواز بکرێت. هەروەها چۆن یارمەتی ئەو منداڵانە بدرێت کە لە بارودۆخی خراپدان. لە دۆکیمێنتەکەی ١٩٦٧دا دوجۆریتر پسپۆڕی دێتە ناو ئەویش دەرونناسی و کۆمەڵناسیە لە پەیوەند بە مەسەلەکانی وەکو گەشەی فیکری منداڵ و فێربونی منداڵ  پێگەیان لە نێو کۆمەڵگادا.

کۆمیتەکە دوو گروپی دەرونناسی جیاکردبووەوە لەسەر شێوازی فێربوون، گروپی یەکەمیان ڕەفتارگەراکان بوون وەك سکینەر و پافلۆڤ، گرووپی دووەم بونیادگەراییەکان بوو کە پێشیاندەوترێت مەعریفی وەك سوزان ئایزاکسی و ئەلێکساندەر لۆریا و جیرۆم برۆنەر و ژان پیاژە بوون. پلاودن قوتابخانەی بونیادگەری بەلاوە پەسەنتدربوو تاوەکو ڕەفتاریەکان، لەبەر ئەوەی بونیادگەراکان چوارچێوەیەك بۆ بیرکردنەوە لەبارەی پەروەردە پێشکەشدەکەن. بەڵام ڕەفتاریەکان ڕوانینێکی زۆر تەسکیان بۆ فێربون هەیە، ئەگەر بیروبۆچونی ئەمان کاری پێبکرێت دەرفەتەکانی گەشەی مەعریفی منداڵ سنوردار دەکات.

سوزان ئایزاکس و لۆریا و ڤیگۆتسکی، گرنگیان دابوو بە گرنگی یاریکردن لە گەشەپێدانی توانای منداڵان بۆ فێربوون. برۆنەر و پیاژە زیاتر سەرنجیان خستبووە سەر ڕێگاکانی بیرکردنەوەی منداڵ و چۆن بیرکردنەوە گەشە ئەکات.

جۆن هۆڵت گەوهەرەکانی پۆل

کەسیکی نا ئاسایی دەرکەوت، نە پەروەردەکارێکی ئەکادیمی بوو نە زانایەکی دەرونناسی گەشە. ئەویش جۆن هۆڵت بوو، لە کتێبە پڕفرۆشەکەی چۆن منداڵان شکستئیهێنن، لە ساڵی ١٩٦٤ دەڵێت: ئەگەر هەوڵمانبدایە منداڵ فێری قسەکردن بکەین بەو شێوازەی هەوڵئەدەین فێری خوێندنەوە بکەین ئەوە هەرگیز فێرنەدەبوو. منداڵ بەم

شێوەیە ساردەبێتەوە، ئەشکێتەوە، سەرلێتێکدەچێت و تورە ئەبێت، هەندێکجاریش بێدەنگ دەبێت. کاتێك منداڵان لە پۆلەکانی خوێندنن نۆ لەسەر دەی مێشکیان بە شتگەلێکەوە سەرقاڵبووە کە هیچ پەیوەندی بەو ئەرکەوە نەبوو خەریکی ئەنجامدانیبوون، بەڵکو مێشکیان بەوە سەرقاڵکبوو مامۆستا دڵخۆشبکەن یان تەمبەڵ دەرنەکەون. بێگومان ئەم دوو شتەی کۆتایی بوون بە ئامانجی سەرەکی فێرخوازان. هۆڵت ئەڵێت: ئەو ئەرکەی مامۆستا ڕوبەڕووی دەبێتەوە گەورەیە، مامۆستایان ئەبێت مەکینەیەکی ژەنگگرتوو بخەنەکار و لە هەمانکاتدا داوایان لێدەکرێت ئەنجامی گەورە بدەن بەدەستەوە بەم شتە غەریبە.

گای کلاکستۆن لە کتێبی ئامانج لە قوتابخانە چییە؟ ئەڵێت: منداڵان لەبری ئەوەی ئازاتر و بوێرتربن، لە ڕاستیدا ملکەچتر و ناسکتربوون لە ڕوبەڕوبوونەوەی نارەحەتیەکاندا. پێیوایە: منداڵان فێردەبن تەسکبینانە بیربکەنەوە لەبری ئەوەی فراوان بیربکەنەوە. (منداڵان ئەبوو ڕاستیەکانی زانست فێربن، بەڵام نابێت لەم پرۆسەیەدا بیرکردنەوەی ڕەسەنی خۆیان لێبسەندرێتەوە).

باداناوە نیۆلیبراڵیەکە

لە کۆتای سەدەی بیستەم، کاریگەریەکان زیاتر سیاسی و ئابوری بوون تاوەکو پەروەردە. پەروەردە و سیاسەت زۆر بە دەگمەن نەبێت ئیشیان بەیەکتر نەبوو. ستیڤن بۆڵ دەڵێت لە بەریتانیا ڕێکەوتن هەبوو بۆ گوێگرتنی حکومەت لە ڕاپۆرتەکان بەڵام (بەڵگەی کەم هەبوو کە ویستێکی سیاسی هەیە بۆ گۆڕانکاری تەواوەتی). چیرۆکی شکستی زۆربەی قوتابخانەکان دەخرایە ئەستۆی مامۆستایان وەکو وەزیری پەروەردەی حوکمەتەکەی پارتی کاری بەریتانیا شێرلی ویلیامز لە ١٩٩٧ وتی: خراپی مامۆستا، لاوازی بەڕێوبەر، .. میتۆدە مۆدێرەنەکانی وانەوتنەوە بوون. لە ساڵی ١٩٥٥ فریدمان سەرنجی گواستبوەوە بۆ سەر پەروەردە و کتێبی ڕۆڵی حوکمەت لە پەروەردەدای نوسی، پەروەردە زۆر سەرنجی ڕاکێشابوو لەبەر ئەو پێگە سەیرەی لە بازاڕدا هەیبوو . پەروەردە بە تەواوەتی لەو قاڵبەی خواست و خستنەڕوو کە هەڵبژاردن چەقەکەیەتی جێگەی نەدەبویەوە. فریدمان بۆی دەرکەوت پێویستە حکومەت پاڵپشتی دارایی قوتابخانەکان بکات، هەرچەندە ئەمە شتێکی نا ئاسایی بوو، بۆ مۆدێلە ئابوریە نوێکە و ئەولەویەتدان بە بژاردەی بەکاربەر.

جیاکاری

هەتاوەکو ساڵانی ١٩٦٠کان هەندێك ویلایەتی ئەمریکا قوتابخانەکانیان بەپێی ڕەگەز جیاکردیوەوە، ئەمجیاکاریە بە پێی کەیسی براون و هاوڕێکانی لە ساڵی ١٩٥٤ هەڵوەشێندراییەوە، بەڵام لە ڕووی پراکتیکیەوە کاتێکی زۆریویست لە ساڵی ١٩٦٢ زانکۆی جیاکراوەی میسسپی ڕەتیکردەوە جەیمس مێردیتی بە ڕەچەڵەك ئەفریقی وەربگرێت، تاوەکو وەزیری داد ڕۆبەرت کەنەدی تەدەخولی بابەتەکەی کرد و پۆلیسی بۆ جەیمس دانا، هەرچەندە گرژی ڕویدا و فێرخوازە سپی پێستەکان پۆلیسەکانی یاوەری جەیمسیان بەردبارانکرد. هەرچەندە ئێستا کەمبوەتەوە بەڵام جیاکاری بە پێی ڕەنگی پێست یەکێکە لە دیاردە هەرە ناشرینیەکانی جیاکاری. بەڵام ئێستا لە بری جیاکاری ڕەنگ جۆرێکی وردتری جیاکردنەوە دەبینیتەوە کە لەسەر دەسکەوتەکانی منداڵ دامەزراوە؛ وەك دانانی فێرخوازە زیرەکەکان لە پۆل و گروپی جیاوازدا یان جیاکردنەوە و دانانی فێرخوازان بە پێی وانەکانیان. مارتا مینەو ئەکادیمیستی هارڤارد لە پێداچونەوەیەکی گەورە بەو دەرئەنجامە گەشتووە کە لە ڕێگای جیاکاری لە ڕێگەی زیرەکیەوە هۆکارە بۆ جیابونەوەی فێرخوازان تەنانەت لەسەر مێزی نانخواردنیشیان.

بازاڕ و پێشبڕکێ و تاقیکردنەوە

دروستکردنی بازاڕ لەناو سیستەمە حوکمیەکاندا، بەمشێوەیە؛ کڕیار: دایباب و منداڵەکانیان، دابینکاریش: قوتابخانەکان. کاتێك دایباب ئەو قوتابخانە دەستنیشان ئەکرد ئەیانویست منداڵەکانیان بۆ بنێرن. هەر منداڵێك بڕە پارەیەك دەدات بە قوتابخانەکان. قوتابخانە بەناوبانگ و دەرکەوتووەکان بەردەوام دەبن لە کارکردن، بەڵام قوتابخانە نەناسراوەکان داهاتیان نەدەما و کڕیاریشیان لێدوردەکەوتەوە.

ئێمە ئێستا لەسەردەمی شۆڕشی بەبازاڕکردنی پەروەردەدا ئەژین، وەکو هەر دیاردەیەکی هاوچەرخ تێگەشتن لێی و پێزانین بە گرنگیەکی لە کۆتایدا سەختە. بەڵام کڕیارانی خواردن زۆرجیاوازن لە کڕیارانی خۆراك، کڕیارانی خۆراك زۆر بە ئاسانی دەتوانن ئەو شوێنەی خورادنەکەی لێدەکڕن بیگۆڕن، بەڵام گۆڕینی قوتابخانە کارێك تاڕادەیەکی زۆر سەختە، زۆرجار گەر دایبابیش ڕازینەبن لە قوتابخانەکە دودڵی ئەکەن لە گۆڕینی قوتابخانە منداڵەکانیان لەبەر کۆمەڵێك هۆکار: هاوڕێ، دووری، جیاوازی مەنهەج... نەبونی بژاردەیتر. هەندێکجار دایبابی دەوڵەمەند دەتوانن مەرجەکانی خۆیان بەسەر قوتابخانەکەدا بسەپێنن. قوتابخانە دەربارەی دەرئەنجامە پەروەردەییەکان هەمویان ملئەدەن بۆ فشاری بەدەستهێنانی ئەنجامی بەرز.

بە بازاڕکردنی پەروەردە لە ئێستا هەندێکجار بە ڕادیکاڵ وەسفدەکرێت، هەندێ گۆڕانکاری گرنگی هێناوەتەکایەوە؛ ناسەقامگیرکردنی پیشەی فێربوون و خووگرتن بە تاقیکردنەوە. میڵتۆن فریدمانیش زۆر بە جوانی تەعبیری لەم واقیعە کردوە و دەڵێت: خەڵکی ئەو شتەیان دەوێت کە لە ئێستادا لەبارەیەوە دەزانن. مەترسیەکە ئەوەیە کە کردنەوەی بازاڕێك لە پەروەردەدا لەوانەیە ئەنجامەکەی دروستکردنی وێنەیەکی پەڕپوتی تایبەتی بێت -سەرنجی ئەو منداڵانە ڕابکێشێت کە زۆر ئامادەن بۆ پەروەردەی فەرمی و ئەوانەش دوربخاتەوە کە فێرکدرنیان سەختە.

شیکەرەوە تیۆریستەکان: تا ئێستا چیان بۆ کردوین؟

لە ساڵی ١٩٠٠ بۆ ٢٠٠٠ خوێندنگەکان هیچ گۆڕانکاریەکی وایان بەسەردا نەهاتووە جێی باس بێت. دامەزراوەی هەردوو سەردەمەکە ئەماناەی تێدایە: پۆلێك بە مامۆستایەکەوە لەبەردەم فێرخوازەکاندا وەستابێت، کورسی، مێز، خشتە و پرۆگرام. لە زانستە کۆمەڵایەتیەکان هۆکاربوو بۆ ئەوەی پێشوازی لە زۆر ڕێگاوە بکرێت، بەڵام لە ڕێگاکانیترەوە بەشداریەکانتان زیاتر خەڵەتێنەربوو تاوەکوو بەرهەمهێنەر.

سەرهەڵدانی دەروونناسی

دەروونناسان پرسیاری ئەوەیان دەکرد کە چۆن منداڵ وەك بیرکەرەوەیەك گەورە دەبێت؟ ئایا منداڵان جیاواز لە گەورەکان بیردەکەنەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە دەبووە دەرئەنجامێکی گرنگ بۆ مامۆستایان. کەوابو مامۆستایانیش ئەگەر بڕیار بوو فێرکردنیان کاریگەری هەبێت، دەبوو شێوازی وانەوتەوەیان بگۆڕن بە دابینکردنی پێویستیەکانی فێربوونی منداڵ. وەڵامی ئەم پرسیارانە بە سێ تیۆریای جیاواز وەڵامدرایەوە.

یەکەم تیۆری ژان پیاژەی سویسری بوو، کە منداڵەکانی خۆی وەکو بەشدار لە تاقیکردنەوە شروشتیەکەی خۆی بەکارهێنا. پیاژە بۆیدەرکەوت منداڵان  هەر بە ڕاستی لە گەورەکان جیاوازتر بیردەکەنەوە، منداڵی بچوك بە ڕێکی و بە بەردەوامی هەندێك پرسیار بە هەڵە وەڵامدەداتەوە. بۆ نمونە ئەگەر ئاوێکی سوراحیەکی بەرز بکرێتە سوراحیەکی کورتی فراوانەوە؛ دواتر لە منداڵەکە بپرسی کام سوراحی ئاوەکەی زۆرترە دەڵێن سوراحیە بەرزەکە.

پیاژە لەم سەرنجدانەوە بانگەشەی ئەوەی کرد منداڵان بە قۆناغی جیاوازی بیرکردنەوەدا تێدەپەڕن: یەکەم: قۆناغی هەست و جوڵە لە لەدلیکبونەوە تا تەمەنی دوو ساڵ کاتێ

جوڵەو هەستەکان هەموو شتێکن. قۆناغی پێش ئۆپراسیۆن دێت لە تەمەنی دووساڵیەوە دەست پێدەکات بۆ تەمەنی حەوت ساڵی، منداڵ لەو تەمەنەدا خودسەنتەرە. بە دوای ئەمدا قۆناغی ئۆپراسیۆنی کۆنکرێتی دێت لە حەوت بۆ یانزە ساڵیە، لە کۆتاییدا قۆناغی ئۆپراسیۆنی فەرمی دێت لە یانزە ساڵی بۆ سەرەوە کە بیرکردنەوەی لۆژیکی و پەتی گەشە دەکات. لای پیاژە منداڵ لە قۆناغی ئۆپراسیۆنی کۆنکرێتی دەزانێت هەردوو سوراحیەکە وەك یەك ئاویان تێدایە. پیاژە پێی وابوو جیناتی مرۆڤ ئەو قۆناغە دیاریدەکەن کە منداڵی پێدا تێدەپەڕێت. ئەم تیۆریە ئەو هۆشداریەیدا کە منداڵان ئەبێت ئەم قۆناغانە یەك لە دوای یەك ببڕن، ئەگەر منداڵان قۆناغێك نەبڕن توانای تێگەشتن و مامەڵەکردنی چەمکەکانی دواتریان نابێت. مناڵان ئەو کارامایيە زەینیەیان نییە کە مامەڵە لەگەڵ ئایدیا ئاڵۆزەکاندا بکەن. ئایدیای ئامادەبوون هاتە کایەوە؛ بە مانای ئەوەی منداڵان پێویست بوو ئامادەبن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هەندێك جۆری فێربوون و فێرکردن وەك خوێندنەوە. گرنگترین پەیامی سەرەکیەکی پیاژە ئەوەبوو کە منداڵانی بچوك مۆدێلی زیهنی خۆیان دروستدەکەن- واتە بنیاتنانی جیهانی خۆیان لە ڕێگەی ئەزمونیەکانیانەوە.

بەڵام لە هەندێك ڕووەوە ئایدیاکانی پیاژە ڕاست دەرنەچوون، ئەگەر منداڵان هەلومەرجی دروستیان بۆ بەخسێنرێت ئەتوانن هەندێك ئەرکی قورسی لۆجیکی ئەنجامبدەن. بەرپەرچدانەوەی ئایدیاکانی پیاژە بە زۆری لەلایەن دەروونناسی ئۆکسفۆرد پیتەر براینتەوە بوو لە ١٩٧٠کان. توێژینەکانی نیشانیدا منداڵان ئەتوانن سەروتر لەو قۆناغە مەعریفیەی پیاژە داینابوو کاربکەن ئەگەر هاوکاری دروست بکرێن و هەلومەرجی دروستیان بۆ دابینبکرێت. بۆ نمونە سەر لێشێواوی لە تاقیکردنەوەکەی سوراحیەکەی پیاژە منداڵەکان زۆر بە سادەیی وشەی زیاتریان لیتێکچوبێت. ئایا ئەم وشەیە بۆ منداڵان بە مانای بەرزتر بووە؟ ئەگەر ئەرکەکە بۆ منداڵان زیاتر ڕوونبکرایەتەوە دەکرا وەڵامی دروستبدەنەوە. ئەم بەرپەرچدانەوە باری زۆر پەروەردەکاری سوککرد، لای زۆربەی مامۆستایان نەگۆڕی ئەم ئایدیایە بە واتای ئەوبوو گەشەکردن زۆرتر پشتی بە گەشەی بایلۆژی بەستبوو نەك کاری مامۆستا.

دووەم تیۆر بونیادگەری کۆمەڵایەتی لیۆ ڤیگۆتسکی و جیرۆم برۆنەر. ڤیگۆتسکی دەروونناسێك بوو لە سەردەمی پێش شەڕ لە یەکێتی سۆڤێت کاری دەکرد، برۆنەر دەروناسێکی هارڤاردی دوای شەڕە. هەردوکیان وەك پیاژە لەسەر ئەو ڕێگایەبوون کە منداڵان مۆدێلی خۆیان بۆ بیرکردنەوە تێیدا بونیاد دەنا، بەڵام ئەمان ئەم بونیادەیان لە ڕێگایەکی جیاوازتر بەدیدەهێنا، ئەویش ئەوە بوو جەختیان لە گرنگی زمان ئەکردەوە لە

فێربوندا، ئەمەش لە خۆیدا نویَ و جیابونەوە بوو لە پیاژە. جیاوازیەکەش ئەوەبوو کە هەردوکیان جۆری ئەو هاوکاریەی لە گەورەکانەوە بە منداڵ دەگەشت زۆر بە گرنگ دادەنا.  برۆنەر هاوکاری گەورەکانی وەك وەستایەی دەچواند کە داربەست (ئەسکەلە) بۆ بینایەکی بەرز دائەنیَ، ڕایگەیاند ئەو شارەزا نوێیانەی منداڵ فێریان ئەبێت پێویستی بە یارمەتی و ڕێبەرە.   ڤیگۆتسکیش بیرۆکەی زۆنی گەشەکردنی نزیکی پێشکەشی پەروەردەکارانی کرد، ئەوەیە چالاکیەك هەیە کەمێك ئەکەوێتە سەرووی ئەوەی منداڵ ئەتوانیَ بیکات، منداڵ بە هاوکاری گەورەکان دەیکات. ئەم بۆچونانە دژی ڕوانینی سەپێنراو بۆ گەشەکردنی منداڵ خستیانەڕوو. تیۆرەکەی پیاژە هانی ڕوانین ئەدات وەك پرۆسەیەکی هێواش و کاوەخۆ، تیۆرەکەی ڤیگۆتسکی و برۆنەر هانی ڕوانینێك ئەدەن بۆ نوسێك گۆڕاو بێت و قابیلی چاکردنیش بێت. وانەی یەکەمی برۆنەر ئەوەبوو کە کار گەشتە فێربوون و فێرکردن هیچ شتێك مەحاڵ نییە: هەموو کەسێك ئەتوانێت هەر شتێك فێربێت ئەگەر ئاستەکەی گونجاو بێت و بە ڕێگای دروستیش پێشکەشی بکرێت. واتە کاری مامۆستا ئەوە نییە زانیاری ببەخشێتەوە، بەڵکو کاری ئەوەیە هانی فێرخوازان بدات بە شێوەیەك بیربکەنەوە کە لە بابەتێك تێبگەن. وە دەڵێت: شتێکی سروشتیە کە سەرنجەکە دەبیَ بگوازرێتەوە سەر فێرکردنی پرەنسیبە سەرەکیەکان و بنەڕەتیەکان، دەبێت لەگەڵ فێرخواز گفتوگۆی فیزیا بکرێت نەك کەسێك باسی فیزیان بۆ بکات.

تیۆری سێیەم، تیۆری ڕەفتاری باڤلۆڤ و سکینەر. ڕەفتاریەکان پێیان وایە کە فێربوون، هەتا فێربوونی ئاڵۆزەکانیش، باشترە وەك بڕی جیاکراوە تەماشابکرێت کە ئەکریَ جودا بە فێرخواز بوترێتەوە، ئەمەش لە ژینگەیەکدا بە شێوەیەکی سیستەماتیك پاداشتی سەرکەوتن بکات. ئەمەش وێرانکردنی مەنهەج بوو لەبەر ئەوەی ئەبوو زانیاریە ئاڵۆزەکان پارچە پارچە بکرێن پاشان ئەزبربکرێن وەك ئامانجی ڕەفتاری.

تاقیکردنەوە

یەکێك لە لقەکانی دەرونناسی پێوانی تواناکانی مرۆڤە. ئەلفێرد بێنێتەوە لە زانکۆی سۆربۆن تاقیگەی دەرونناسی جەستەیی دەستپێکرد، ئەم گەنجە فەڕەنسیە تاقیکردنەوەی زیرەکی گەشەپێدا، لە ساڵی ١٩١٦ دەرونناسی ئەمریکی لویس تێرمان ڕادەی زیرەکەی (IQ) داهێنا. تێرمان جەختیکردەوە یەکەم کاری قوتابخانە دیاریکردنی کوالیتی ڕەسەنی هەر فێرخوازێکە، ئەرکی دووەم دابینکردنی جۆرێك لە فێرکردنە بگونجێت لەگەڵ ئاستی تواناکانی.

زۆر لە دەروونناسەکانی ڕابردوو لەو بڕوایەدابوون زیرەکی ئەدگاریە، خەڵك دەبێت ناچاربن بەو زیرەکیەی بۆیان ماوەتەوە قەناعەت بکەن و کاریپێبکەن. دەروونناسێك بەتایبەت پێشەنگی ئەوانی ئەکرد کە پشتیوانی ئەم بۆچونە بوون. ئەویش سیرێل بێرت بوو کە وەك یەکەم دەروونناس لە لەندەن لە ساڵی ١٩١٣ دیاریکرا. بەڵام ساختەکاریەکانی بێرت تەنها دوای مردنی ئاشکرا بوو. بێرت کاریگەری هەبوو لەو کەشەی کە ڕێگا خۆشکەربوو بۆ یاسای پەروەردەی ١٩٤٤ لە بەریتانیا بە جیاکردنەوەی منداڵان بەپێی ئاستی زیرەکی و تواناکانیان. یاسای ساڵی ١٩٤٤ لەگەڵ دابینکردنی پەروەردە بە خۆڕایی بۆ هەمووان، سیستەمێکی پەروەردەیی جیاکاری لە بەریتانیا دروستکرد. واڵتەر لیپمان زانای سیاسی ئەمریکی لە ساڵانی ١٩٢٠ کۆمەڵێك وتاری لە ئەمریکا بڵاوکردەوە کە تێیدا ڕایگەیاند تاقیکردنەوەکانی زیرەکی پشتیان بە بیرێکی تەسك بەستووە. لیپمان دەڵێت: تاقیکردنەوەی زیرەکی بەدەستی کەسانێکەوە کە هەڵگری ئەم بیرە تەسکەن سەرئەکێشێ بۆ سیستەمێکی چینایەتی لەسەر بنەمای زیرەکی. پاش ئەمە کۆمەڵێك توێژینەوە ئەنجامدران لە کۆتایدا باوەڕبەخۆبونی ئەوانە لەقکرد کە پشتیوانی زیرەکی بۆماوەیی بوون. بەتایبەت لەو ڕوانگەوە کە بۆچونی بۆماوەییەکان زیاتر پەیوەندی هەبوو بە ڕەگەز و تواناوە. فێینبێرگ و ڕێسنیك دەڵێن: لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٢٠کان باوارڕداره ڕاستەقینەکان بوون بە گومانکار. دەڵێن زۆربەی بەڵگەکان لە سەرچاوەی زۆر و جیاوازە هاتن، یەکەم: ئەوە ئاشکرابوو کە نابەرپرسیارانە مامەلەکراوە بە داتاکانی پەیوەست بە کاریگەرە ژینگەییەکان. دووەم: هەندێك لەو توێژینەوانە نیشانیاندا ئەو ڕەشت پێستانەی لە باکوری ئەمریکا گەورەکراون نمرەکانیان لەو سی پێستانە زیاترە لە باشوری وڵاتن. لە ساڵێ ١٩٦٠دەروونناسی پەروەردیی بەناوبانگ ئارسەر جێنسن لە توێژینەوەیەکی کاریگەر لە زانکۆی هارڤارد پرسی: ئایا مەترسی ئەوە هەیە ئەم بەرنامە سیاسیە خۆشنودگەرایەی ئێستا، بەبێ یارمەتی زانستی باشکردنی وەچەی مرۆڤ، سەربکێشێ بۆ کۆیلەکردنی بەشێکی زۆری دانیشتوانەکەمان لە ڕووی جینەتیکەوە.

با بۆ خۆ ی قسە بکات

تێڕوانین زۆربەی منداڵان لەبارەی قوتابخانەوە لەمڕۆدا لەو قسە باوەدا کورتبووەتەوە (با بۆ خۆی قسە بکات)؛ ئەڵێن با قسە بکات من گوێی لێناگرم. ژمارەیەکی زۆرکەمی ئەوانەی لە قوتابخانەن گوێ بۆ ئەوشتانە دەگرن و بایەخی پێئەدەن کە پێیان ئەوترێتەوە. بە داتای فەرمی لە بەریتانیا سەلمێندراوە ٤٠٪ فێرخوازان دە ساڵی سەرتای

خوێندنی زۆرە ملیٚ تەواو ئەکەن بەبیٚ ئەوەی لە ئاستی ئەو پێوەرە هەرە سەرەتاییانەدابن کە بۆ پەروەردە قبوڵکراوە.

پرسیارێك دێتە ئاراوە، بۆچی قوتابخانەکان بە ئەم ژمارە زۆرەی فێرخوازانەوە سەرکەوتوو نابن؟ جۆرج بۆشی سەرۆکی ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٠٤ ڕایگەیاند: ڕێژەی نەخوێندەواری منداڵەکانمان لە ناوەندی زۆر بەرزە.

سیاسیەکان هەوڵیانداوە وەڵام بۆ ئەم پرسە ئاڵۆزە بدۆزنەوە، وەڵامەکەشیان بەزۆری لەوەدا خۆی بینیوەتەوە کە فێرکردن لاوازە بابەتەکان خراپبوون و بە ڕێگایەکی خراپیش گوتراونەتەوە. پیشەگەرانی پەروەردەش زیاتر بایەخیان بە ئایدیا بەرزەکانی وەکو دادی کۆمەڵایەتیداوە تاوەکو ئەوەی پێویستیە بنچینەکانی منداڵان و گەنجان کە لە ئەستۆیاندایە دابینی بکەن. زۆرکەس هەمان هەستیان هەیە و هاوڕان، بەڵام ڕونکردنەوەکان جیاوازن. بەشێکیتریان هۆکاری شکستەکە دەخەنە ئەستۆی جیاوازی کلتوری ماڵ و قوتابخانە: زۆر منداڵ لە قوتابخانە باش نین لەبەر ئەوەی تێناگەن لەو شتەی لە قوتابخانە دەگوزەریٚ. ئێمە دەزانین بارودۆخەکە بەو شێوەیەیە؛ لەبارەی ئەو ژینگەیەوە فێرئەبین کە تێیدا دەژین، ئەگەر ژینگەی ماڵەوە زۆر جیاواز بێت لە ژینگەی قوتابخانە، ئەوا شتێکی وا لە قوتابخانە فێرنابین. تەنها کوالیتی ئەو پەروەردەیە کە لە قوتابخانە پێشکەشدەکرێت بەرپرس نییە لە شکستی فێرخوازان. باسیل بێرنستەینی کۆمەڵناس لەمبارەیەوە دەدوێت و دەڵێت: جیاوازی نێوان کلتوری ماڵەوە و کلتوری قوتابخانە بەتایبەت جۆری ئەو زمانەی لەو دوو جێگەیەدا بەکاردێت. بێرنستەین درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: ئەو چینە کۆمەڵایەتیەی منداڵی تێدایە جۆرێك لە بەکارهێنانی زمان ئەسەپێنیٚ بەسەر ئەندامەکانیاندا. دووجۆر زمان یان کۆد هەیە کە یارمەتیمان ئەدات لە ژیاندا بەردەوامبین، جۆرە زمانێکی چڕ و ورد هەیە لەلایەن جیهانی فەرمیەوە بەکاردێت بەتایبەتیش قوتابخانە (پێکهاتەکەی ئاڵۆز، ڕستەی درێژ، وشەی نائاسایی)؛ هەروەها زمانێکی سنوردارتر هەیە کە لەلایەن هاوڕیٚ و خێزانەوە بەکاردێت بۆ زۆربەی بەرکەوتەکانی ژیانی ڕۆژانە. بێرنستەین دەڵێت: کێشەی منداڵانی چینی کرێکار ئەوەیە کە ئەزمونێکی کەمیان هەیە لەگەڵ زمانە چڕەکە. لەبەر ئەوە کاتێك دەچنە قوتابخانە نامۆن بەوەی کە لەو شوێنە چی ئەگوزەرێت، ئەوان بەڕاستی لەوناگەن کە مامۆستا باسی چی دەکات.

نایەکسانی چ لە کۆمەڵگادا بێت یان لە قوتابخانە زیانی خۆی هەیە، جیاوازیکردن لە نێوان فێرخوازان بەوەی هەندێك خۆشەویستبن هەندێکیشیان کەمتر کاریگەری هەیە

هەم لەسەر ئەنجام هەم لەسەر ڕەفتاریش. بۆ ماوەیەکی زۆر پەروەردەکاران کە شتێك لە کلتوری منداڵدا کەمە یان هەڵەیەك لە سۆزدار منداڵدا هەبووە بوەتە هۆی شکستیان لە خوێندنگە. لەبری ئەوەی دامەزراوەی قوتابخانە یان سروشتی مەنهەج بخرێتە ژێر پرسیارەوە.

مەنهەج

لە ساڵی ١٩٩٣ پەروەردەکاری ئەمریکی هارۆڵد بێنجامین ساتیرێکی لە بارەی مەنهەجەوە بڵاوکردەوە بە ناوی مەنهەجی کەڵبەدار. ئەم زنجیرە باس لە چیرۆکێکی خەیاڵی خێڵێکی سەردەمی نیۆلیتیکەوە دەکات، کە مەنهەج بۆ منداڵەکانیان دائەنێن بۆ ماسیگرتن، ئەسپسوار و ترساندنی پڵنگی کەڵبەدار، هەموو شتەکان بۆ خێڵەکان باش بوو تا ئەوکاتەی سەهۆڵبەندانێك ژینگەکەی گۆڕی؛ ماسیەکان کەمتر و خێراتربوون، ئەسپ و پڵنگ بە تەواوەتی لەناوچون، لەبەر ئەوە لێهاتووی و شارەزایی نوێی گونجاو لەگەڵ ژینگە تازەکە لەلایەن خێڵەکەوە داهێنران. دروستکردنی تۆڕ و ترساندنی بزنە کێوی و چاڵهەڵکەندن بۆ ورچ. بەڵام شارەزایانی پەروەردە و ئەو کەسانەی بەرپرسبوون لە قوتابخانە ڕەتیاندەکردەوە مەنهەج دەستکاری بکرێت بە مەبەستی فێرکردنی ئەم وانانە.

لایەنگرانی گۆڕانکاری تورەبوون: چۆن دەکرێت کەسێکی ئاقڵ حەزی لەو چالاکیە بێسودانە بێت؟ سودی چیە منداڵ فێری چۆنیەتی ماسی گرتنی بکەیت بە دەستی بەتاڵ لە کاتێکدا ئیشەکە چیتر بەو شێوەیە ناکرێت؟

نەریتیەکان بەم شێوەیە وەڵامیان ئەدایەوە: ئەوەندە بێمێشك مەبن ئێمە ماسیگرتن بۆ ئەوە ناڵێینەوە کە منداڵ ڕاوە ماسی بکات؛ ئێمە ئەو وانە ئەڵێینەوە بۆ ئەوەی چوست و چالاکیەك لە منداڵدا گەشە بکات کە بە ڕاهێنان دروستنابێت.

ئەی ئێن وایتهێد  فەیلەسوف و بیرکاریزانی گەورە لە کتێبی ئامانجەکانی پەروەردە دەڵێت: لە مێژووی پەروەردەدا  دیاردەیەکی زۆر زەق هەیەو ئەویش ئەوەیە قوتابخانکان کە لەسەردەمانێکی زیندوون و تەژین بە داهێنان بۆ نەوەیەکی دواتر تەنها ڕۆتین و پڕوپوچ دەردەکەون. مەبەستی ئەوەبوو فێرکردنی ئەم شارەزایی و  چالاکیە مردوانە نەك هەر بێسودن بەڵکو زیانیشیان هەیە.

گواستنەوەی شارەزایی شتێکی پوچە، یاری شەترەنج شتێکی باشە بۆ ئەمە، شەترەنج یەکێکە لەو شارەزایانەی کە زۆرترینجاتر لە لایەن دەرونناسیەوە لێکۆڵینەوەی لێکراوە،

یاریزانانی شەترەنج یەکەمن لە ڕیزکردنی ئایدیا، بەکارهێنانی یادگە، گەشەپێدان بە پێشبینی و خەیاڵ. بەو پێیە بێت یاریزانانی شەترەنج دەبێت لە چارەسەرکردنی کێشەدا یەکەمینبن بەڵام بەداخەوە وانییە. وانەیەك لەمەوە فێردەبین: تۆ لەوەدا باشدەبیت کە مەشقی تێدا دەکەیت نەك لەوەی کە مەشقی تێدا ناکەیت. ئەمەش قسەکەی سایمۆن وەیلێ فەیلەسوفی فەرەنسیمان بە بیردا دەهێنێت کە لە کتێبی پێویستی ڕەگوڕیشەدا لەبارەی فێرکردنی زمانە مردووەکانەوە دووا و دەڵێت: کەلتوور ئەو ئامرازەیە لەلایەن پرۆفیسۆرەکانەو بەکارئەهێنرێت بۆ بەرهەمهێنانی پرۆفیسۆر، ئەمانیش کە سەرەیان هات پرۆفیسۆریتر بەرهەمدەهێنن. ئەمەش بۆقوتابخانە ڕاستە، مەنهەج لەلایەن کەسانی پێگەشتووەوە دائەنرێت کە پێیان وایە گەنجان و فێرخوازان پێویستیان بەو شتەیە کە خۆیان بە منداڵی پێی گۆشکراون، ئا بەم شێوەیە مەنهەج دووبارە بەرهەمدەهێنرێتەوە.

پریارێك دیێتە ئاراوە، ئایا وانە وتنەووە دەبێت تیشك بخاتە سەر فێرکردنی شارەزاییە بنچینەییەکان یان ئێمە ئەبێ ئیلهام و حەماسەت بدەین بە منداڵان و خەیاڵیان بورژێنین؟

باخچە نهێنێنیەکە

وەزیری پەروەردەی بەریتانیا داڤید ئیکڵە لە ساڵی ١٩٦٠ لە وتەیەکی بەناوبانگیدا بە مەنهەجی گوت (باخچە نهێنیەکە). ئەمەش بوو بە وشەیەکی باو، جەیمس کاڵاگنی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٧٩ لە دیبەیتە گەورەکەی پەروەردە لە کۆلیجی ڕەسکن بەکاری هێنایەوە. سیاسیەکان پێیان وایە مەنهەج لە لایەن مامۆستایان و پەروەردە پیشەگەرەکانەوە حەسودانە پارێزگاری لێکراوە؛ هەرگیز سەلیقەی سیاسیەکان و خەڵکی گشتی بۆی نەبووە قسیەی تێدا بکات.

قسەی باو ئەوەیە کە ڕەگ و ڕیشەی مەنهەج تۆزێك پەنهانە و لە ژوورە تاریکەکاندا لە لایەن ڕێکخراوی مامۆستایانەوە دادەنرێت.

لە ئەمریکا بەمدوایەنە بە مەبەستی یەکخستنی مەنهەج لە ساڵی ٢٠١٠ - دەستپێشخەری ستانداردی هاوبەش بۆ ویلایەتەکان - هەوڵیدا هەموو مەنهەجە جیاوازەکان لە یەکدانەدا کۆبکاتەوە، دەستپێشخەریەکە ئامانجی ئەوەبوو: تێگەشتنێکی ڕوون و نەگۆڕ پێشکەشبکات دەربارەی ئەو شتانەی فێرخوازان ئەبوو فێرببن، بۆ ئەوەی

مامۆستایان و دایباب بزانن چیبکەن بە مەبەستی یارمەتیدانیان. وە بە جۆرێك بێت پەیوەست بێت بە جیهانی ڕاستەقینەوە.

مەنهەجی نەگۆڕ

بۆ ئەوەی ئاسۆیانە لەم پرسە بڕوانین  وەها باشترە فراوانتر لە مەنهەج بە درێژای مێژوو بڕوانین. بۆ نمونە کۆنفۆشیۆس ئەڵێت فێرخوازان پێویستە ئاکاری باش بخوێنن. یۆنانە کۆنەکان مەنهەجیان لەسەر بنەمای هارمۆنیکەکان داناببو کە پێکهاتبوو لە ئەستێرەزانی، ئەندازە، زانستی ژمارە و مویسیك. ڕۆمانیەکانیش زۆریان حەز لە ڕەوانبێژی بوو. هەریەك لەمانە کاریگەریان لە مەنهەجی سیانیەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەبوو بەتایبەت موسڵمانان کە ڕێزمان، لۆژیك و ڕەوانبێژیان دەخوێند. هەروەها مەنهەجی چواریەکەش ئەمانەبوون: ژمارناسی، ئەستێرەناسی، ئەندازە و موسیك.

نیل پۆستمان کە شیکەرەوەیەکی گرنگی بواری پەروەردەیە، پشتگیریەکی توندی ئەودەکات بابەتی خوێندن لەسەر بنەمای سێ ئەیەکە دابنرێت. ( astronomy – archaeology - anthropology) ئەستێرەناسی، شوێنەوارناسی و مرۆڤناسی. جیاواز لە سێ ئارەکە کە بریتین لە خوێندن، نوسین و ئەندازە.

گای کلاکستۆن لە کتێبی ئامانجی قوتابخانە چییە؟دا  دەربارەی مەنهەج دەڵێت: مەنهەجی ئەمڕۆ باشتر دەبێت ئەگەر جەختبکاتەوە لە کوالیتی و ڕەفتارەکانی مێشك تاوەکو بابەتەکان. هەروەها دەڵێت مەنهەج ئەبێت ئەم چەشنانە لە خۆبگرێت: ئامار، ئەگەرەکان، بەڕێوبردنی مەترسی، مافەکانی مرۆڤ، ژینگە، ئاگاداربون لە دۆخی جیهان، ئاکار و ئاگاداربون لە جەستە. هەرەوەزی، توانای گفتوگۆکردن، گومانکردن، ئیرادە و ڕامانیش لەخۆ بگرێت. بەڵام بە باوەڕی فەیلەسوفی سەدەی بیست مایکڵ ئۆکیشۆت بانگەشە بۆ مەنهەجێکی لەوجۆرە لە جێگای خۆیدا نییە. بە بۆچونی ئۆکشێت دەبێت مەنهەج لەمانە پێکبێت: مێژوو، بیرکاری، زانست...هتد. بەلای ئۆکشیتەوە ئەم بابەتانە میراتێکی بەنرخن مە بگوازرێنەوە بۆ نەوەی تازە، هەروەها ڕێگایەك پیشاندەدەن بۆ تێگەشتن و وێناکردنی جیهان.

پێچاوپێچ و شەشپاڵوو

مەنهەج تەنها ناوەڕۆك نییە، پەروەردەکاری بەناوبانگ لۆرێنس ستێنهاوس دەڵێت: مەنهەج ئەبێت وەکو کۆمەڵێ پێچکەی لێکئاڵاو بیری لێبکرێتەوە: هەندێ چالاکی هەیە

ئەبێت لەلایەن مامۆستاوە ئەنجامبدرێت، بابەتی خوێندن هەیە، ڕەفتاری گشتی هەیە و هەروەها تێگەشتن هەیە. ستێنهاوس باسی ئەوە ئەکات مەنهەج هەروا بە ئاسانی و سادەیی گواستنەوەی زانیاری نییە، بەڵکو ئەوەشە کە ئەو زانیاریانە چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. یان چۆن تێئەپەڕێنرێت لە لایەن مامۆستایانەوە بۆ ئەوەی وا بکەن فێرخوازان تێبگەن. بەلای ستێنهاوسەوە بابەتی خوێندن و زانیاری هەرچەندە گرنگە بەڵام گرنگتر لەمە ئەو دەرفەتانەیە کە ئەیخاتە بەردەست بۆ گەشەپێدان بە بیرکردنەوە. لە کۆتاییدا ستێنهاوس دەڵێت: زانیاری لە مەنهەجدا بەشێوەیەکی سەرەکی ئەبێت وەکو ڕێگایەك بۆ بیرکردنەوە تەماشا بکرێت. ئەم قسەیە بۆ ئێستا زۆر ڕاسترە لەبەر ئەوەی دەسڕاگەشتن بە زانیاریەکان ئاسانن. لە کۆندا مرۆڤ تاوەکو زیاتر لە مێشکدا خەزنکردبێت ئامادەتربووە بۆ ژیان.

ستێنهاوس مەنهەج وەك شتێکیتر بەراورد دەکات، دەڵێت: مەنهەج ئەکرێت وەکو یاریەك بیری لێبکرێتەوە بە یاریزان و پێویستیەکانی (پارچە و بۆرد...) ئەم بەشانە یان پارچانە هاوشێوەی مەنهەجن. لە کاتێکدا پارچەکان کەرەستەی یاریەکە دابیندەکەن، جۆری یاریەکە باش یان خراپ، هێواش یان هەڵەشە پەیوەستە بەو جولانەی یاریزانەکان ئەنجامیدەدەن. پارچەکان بەراورد بە یاریزانەکان گرنگ نین. هەمان شتیش بۆ مەنهەج ڕاستە: جۆری ئەو فێرکردنەی کە ڕوئەدات تەنها پەیوەست نییە بە بابەتی خوێندنەوە، بەڵکو پەیوەستە بەو ڕێگایانەی لێکئەدرێتەوە بە سوودی فێرخوازان، یان بەو شارەزاییانەی لە ڕێگایەوە بابەتەکە ئەگوازرێتەوە. خاڵی گرنگ شارەزایی مامۆستاکەیە. جەختێکی زۆر ئەکرێتەوە لەبەش و پارچەکانی مەنهەج، بەڵام بایەخێکی کەمیش ئەدرێت بەوەی ئەم بەش و پارچانە چیلێبکرێت. ئەم بەشە میکانیکیە ڕەنگە مامۆستایان و بەکارهێنرانیشی بکەن بە ئامێر و نەك چاودێر و فێرکار.

خوێندنی هەرچی زۆرتری بابەتەکە بێ ئەوەی بایەخێکی ئەوتۆ بدرێت بەوەی فێرخوازان چیان لەو بابەتە وەرگرتووە. ئایا تێگەشتوون؟ ئایا بیریان تیژبووە؟ جیرۆم برونەر دەڵێت: ئەوە بێمانایە کەسانێکیتر لەدەرەوە برێك لە زانیاری لە چوارچێوەی مەنهەجێکدا ئامادەبکەن، بەشێوەیەك کە مامۆستای نەوێت. چونکە نەبوونی خولانەوە لە پەیوەندیدا نەبوونی پرسوڕا لە فێرخوازەوە بۆ مامۆستا و بە پێچەوانەوە تێگەشتنێکی کەم بەرهەمدەهێنێت و پەروەردەیەکی کەمیش ڕوودەدات.

هەریەکێك لەمانە بە مانای ئەوە نییە ك ناوەڕۆکی مەنهەج بێمانایە، بەڵکو ئەمە زیاتر بۆ ئەوەیە کە سەرنج زیاتر بخەیەنە سەر چۆنیەتی و چییەتی مەنهەج. برۆنەر دەڵێت:

مامۆستایان پێویستە هەست بەوە بکەن کە فێرخواز پێویستی بە فێربوونی پێکهاتەی بابەتە زیاتر لە ئەزبەرکردنی ڕاستی و تەکنیەکان. یەکێك لە قورسترین ئەرکەکانی مامۆستا پێکەوەگرێدانی ئەم ڕاستی بەویتر ە باسەکانی پێشتر بەوانەی دواتروە.

هەندێك لە دەرەنناسان پێیان وایە منداڵان بە کۆمەڵێك قۆناغی دیاریکراودا تێئەپەڕێن کە توانا و ئامادەیی ئەوان بی بیرکردنەوە دەستنیشانئەکرد. پێیان وایە منداڵان نابێت بەسەر قۆناغێکدا بازبدەن. بەڵام برۆنەر ڕایگەیاند ئەمە هەڵەیە، پێیوایە منداڵان بە شێوەیەك لە شێوەکان لە هەر ئایدیاك تێدەگەن؛ ئەم بانگەشەیەی جێگای موشتومڕە. هەروەها پێوایە منداڵان هەمیشە ئامادەن بۆ فێربوون و کاری مامۆستایە گوێڕایەڵانە شوێن هیچ دەستورێك بۆ گەشەی مەعریفی نەکەوێت، بەڵکو ئەبێت ئەزموون و هاوهەستی خۆیان بەکاربهێنن بۆ فێرکردنی بابەتەکان هەرکاتێك گونجاو بێت. برونەر دەڵێت: (خاڵی دەستپێکی مرۆڤ لەو جێگایەدایە کە فێرخوازی لێیە).

منداڵان ئەبێت فێربکرێن چۆن بیربکەنەوە لە ڕێگای بەکارهێنانی خەملاندنی زیرەکانەوە، بازدانی بوێرانەو و گریمانەی بە پیت. ئەبێت لەوە تێبگەن کە پێویستە منداڵان تامەزرۆی خوێندنبن بۆ خاتری فێربوون نەك بەمەبەستی نمرەی باش و دەرچوون لە تاقیکردنەوەکان.

تید ڕاگ کە توێژەرێکی پەروەردەییە شتێکیتری بۆ مەنهەجی شەشپاڵوو زیادکردوە، پێوایە مەنهەج پێویستە وەك تەنێك سێ رووی هەبێت. ڕووی یەکەم هی بابەتەکانە وەك فێربونی ئینگلیزی و بیرکاری و جوگرافیا، ڕووی دووەم بیرۆکەکانە وەك زمان و خەیال و هاوڵاتیبوون. ڕووی سێیەمیش شێوازە جیاوازەکانی فێرکردنی تێدایە وەکو دۆزینەوە، وردبنەوە و تەماشاکردن. خاڵی گرنگی شەشپاڵوەکەی ڕاگ و پێچاوپێچەکەی برۆنەر ئەوەیە کە هیچیان لە شێوازەکانی تێگەشتنی مەنهەجدا (ئەم یان ئەو)یان نەکردووە.

مەنهەجی شاراوە

بە جیا لە مەنهەجی دیار و ئاشکرا مەنهەجی شاراوە هەیە. مەنهەجی شاراوە ئەو باوەڕ و بەهایانە ئەگرێتەوە منداڵان وەریئەگرن بەر ئەنجامی شێوازی بەڕێوبردنی قوتابخانە و ڕێکخستنی فێربوون. ئەمەیان دەربارەی ڕەفتاری مامۆستایان، کتێبە هەڵبژێردراوەکان و یاساکانی قوتابخانەیە. یاساکانی قوتابخانە منداڵان فێری چیدەکەن؟ چ جۆرێك کتێبك بۆ خوێندن بەکارئەهێنرێت؟ ئایا ئەم کتێبانە زانیاری بە منداڵان دەبەخشن یان هانی بیرکردنەوە بە منداڵان دەدەن؟

فلیپ جاکسۆن لە ساڵی ١٩٦٨ لە کتێبە گرنگەکەیدا بە ناوی ژیان لە پۆلدا، دەڵێت: مەنهەجی شاراوە پلەیەك لەم پەیامانەش قوڵتر ڕۆئەچێت. مەنهەجی شاراوە لە قەرەباڵخی، پیاهەڵدان و هێزی پۆلدا خۆیدەبینێتەوە، فێربونی ژیانکردن لە پۆلدا فێرکردنی ژیانکردنە لە قەرەباڵخیدا لەگەڵ ئەو شتانەی ئەم قەرەباخیە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت. مامۆستا بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەم قەرەباڵخیە پاداشت و سزا بەکاردەهێنن.

جاکسۆن جەخت لەوە دەکاتەوە پاداشت کە لە مەنهەجی فەرمی و شالاوەشدا بەکارئەهێنرێت بۆ ئاسانکاریی و نەرمییە لە بەڕێوربدنی قوتابخاندا: منداڵان پاداشت دەکرێن بە هۆکاری پابەندبوون، گۆێڕایەڵی و خۆگونجاندن لە بیرکردنەوەدا نەك لە پایی بلیمەتی و ڕەسەنیان. جاکسن دەپرسێت ئایا ئەمە ئەو سیفەتەیە کە ئێمە ئەمانەوێت لە گەنجەکانماندا بیچێنێن؟

ئێڤرێ ڕەیمەر لە کتێبە دژە قوتابخانەکەیدا بە ناوی قوتابخانە مردوو دەڵێت: عوسمانییەکان ئەو کەسانەیان ئەخەساند کە پۆستی باڵای خزمەتکدنیان لە فەرمانڕەوایدا پێدەدان بۆ ئەوەی زیاتر ملکەچ و دەستەمۆبن. ڕەیمەند دەڵێت بەڵام قوتابخانە خەساندنە جەستەییەکەی کردوو بە کارێکی ناپێویست، چونکە ئیشەکە کاریگەرترە ئەو کاتەی خەساندنەکە لە ئاستی کوشتنی هەوەس و ئارەزودایە.

تاقیکردنەوە ئاڕاستەی مەنهەج دەکات

لە کەلتورێکدا کە چاوی لە ئەدا و جێبەجێکردنە، شتە بەرجەستەکانی مەنهەج ئاسانترە تاقیکردنەوەیان تێدا ئەنجامبدرێت و حوکمەتەکانیش ئەیانەوێت مامۆستایان بکەن بە بەرپرسیار و لۆمەیان بکەن. لەوەدەچێت تاقیکردنەوە و بەرپرسیارێتی پێکەوە ژیان بکەن.

تۆ ناتوانی تێگەشتنی فێرخوازان وردبکەیتەوە و پێوانەی بکەیت بەو شێوە ئاسانەی ئەتوانی توانای فێرخوازان لە بیرهاتنەوەی زانیاریدا پێوانەبکرێت. زۆر ئاسان پرسیارێکی هەڵبژاردن ئامادەبکەیت نمرەی لەسەر دابنێیت، تاوەکو ئەوەی داوا لە فێرخوازان بکەیت ڕاپۆرتێك لەسەر گەرمبوونی زەوی بنوسن.

دەرئەنجامە وێرانکاریەکانی ئەمە ئەوەیە کە سیاسیەکان گرنگیەکی زۆر ئەدەن بە ئەنجامی هەڵسەنگاندن. بەڵام پێویستە مامۆستا خۆی بەدوور بگرێت لەوەی وانە بڵێتەوە بۆ تاقیکردنەوە، بەڵکو لەبری ئەوە سەرقاڵی پەروەردەکردن و پێگەیاندنی فێرخوازەکان بێت.

دەبێت مەنهەج  سەربەخۆ بێت لە هەر ڕەچاوکردنەوەیەکی تاقیکردنەوەوە هەتا ئەگەر تاقیکرنەوەکانیش لامان گرنگبن. تاقیکردنەوەکان دەبێت لە شوێن و کەشێکیتردا ئەنجامبدرێن؛ ئەبێت تەواو دابڕاوبن لە چاوی مامۆستا و لەوەش گرنگتر لە ڕەچاویەکانی مامۆستا. تاقیکردنەوە کاریگەری نەك تەنها لەسەر ناوەڕۆك، بەڵکو لەسەر ستایڵ و چۆنیەتی فێرکردنیش دادەنێت. ئەوکاتە پشت دەبەستێت بە وەرگرتنی وەڵام نەك تێگەشتن: فێرکردن دووبارە و کڵێشەی ئەبێت. هەروەرها بەربڵاوی و دەسەڵاتی تاقیکردنەوە پرۆسەی پەروەردە تێکدەدات. بۆ نمونە بەڵگەی زۆر هەیە لەسەر گزیکردن، بەرتیل وەرگرتن لەلایەن چاودێرەکانەوە، هاوڕێیەکیتری فێرخواز لەبری فێرخوازەکە وەڵامدەداتەوە و یان فرۆشتنی پرسیارەکانی تاقیکردنەوە.

قوتابخانە تەواو بووە

یاسا تا ئێستاش بەردەوامە لە ناچارکردنی دایباب بۆ ناردنی منداڵەکانیان بۆ دامەزراوەیەك کە لەسەر شێوازی سەربازی ڕێکخراوە؛ لەم دامەزراوەدا منداڵان فێری ئەو شتانە ئەکرێن کە گرنگن بۆ بەڕێوەچوونی کۆمەڵگایەکی بێکێشە و گرفت.

بە دڵنیاییەوە زۆرینەی فێرخوازان لەسەر مەسەلەی تێڕوانیان بۆ قوتابخانە هاوڕان کە پەیامی مانگی نۆ (ئەچینەوە بۆ قوتابخانە) کە لە مانگی نۆ لە تەلەفزوێن و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بڵاودەکرێتەوە زۆر بێتاقەت و خەمبار دەبن.

گۆرانیەکەی ئەلیس کوپەر (نە مامۆستایتر، نە کتێبیتر، نە ڕووخساری چەپڵەی مامۆستا). هەستێکی هاوشێوەی گۆرانیەکەی پینك فلۆیدیکە ئەڵێت (ئێمە پێویستمان بە پەروەردە نییە، ئێمە پێویستمان بە کۆنترۆڵێ بیرکردنەوە نییە، ئێمە پێویستمان بە شکاندنەوەی فێرخواز نییە). زۆربەی فێرخوازان بە کردنەوەی قوتابخانە توشی فۆبیایەکی سوك دەبن، حەزێکی زۆر بۆ هەڵهاتن.

بۆچی ئەم ڕقلێبونەوە؟ ئەمە لەبەر ئەوە نییە مامۆستایان هەوڵی جدی نادەن. بە دڵنیاییەوە لە پیشەگەرە دڵسۆزەکانن کە منداڵان هاندەدەن، حەماسەت و ئیلهامیان پێدەبەخشن.  وەکو هارۆڵد ویڵسنی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا لە ١٩٧٠کان وتی بۆ زۆرۆلەو منداڵانەی کە ڕابردویەکی وەك منیان هەیە مامۆستایان گرنگترین کەسانی پێگەشتوبوون لە چیانیاندا. ڕەخنەگران ئەڵێن کێشەکە ڕەنگە ئەوەبێت کە قوتابخانە بۆ زۆربەی منداڵان شوێنێکی نەشیاوە. قوتابخانە شتێکی پێنیە پێشکەشی ئەم منداڵانەی بکات کە بیانەوێت یان پێویستیان بێت لە کۆتاییدا بە دەستە بەتاڵ دەردەچن.

قوتابخانە ئەوە ناهێنێ

لە جیهاندا پارەی زۆر بۆ قوتابخانە تەرخاندەکرێت، چونکە لەو باوەڕەدان دەستیکاری باشتر پەروەردەکراو  گەشەی ئابوری بەدوای خۆیدا دێنێت. قسەی سواوی ژیانی مۆدێرن ئەوەیە کە قوتابخانە باشترینە بۆ هەمووان. بە مانایەکیتر بڕوانامەی باشتر ئیشی باشتر و دەستکەوتی باشتر.  ئەمباوەڕە بووە هۆی  زیادکردنی پەروەردەی قوتابخانە. بەڵام بەڵگەکان نیشانی ئەدەن لە ڕاستیدا هاوکێشەیەك نییە گەشەکردنی ئابوری و ژیانێکی باشتری کەسەکان ببەستێتەوە بە پەروەردەی قوتابخانەوە. لە ڕاستیدا قوتابخانە شتێکی کەمی پێئەکرێت بۆ باشترکردنی دەرفەتەکانی خەڵکی. لە ساڵی ١٩٦٦ جەیمس کۆڵمان ئەوەی ئاشکراکرد لە نێوان قوتابخانە و باردۆخی خێزاندا قوتابخانە کاریگەری کەمترە لە دەستنیشانکردنی نمرە و ئەنجامی فێرخوازان، ناتەواوی و دواکەوتوی خوێندن لە خێزانە هەژارەکاندا لە هەموو چینەکانیتر زیاترە. کریستۆڤەر جێنکس کە ئەکادیمیەکی ئۆکسفۆردە چەند ساڵ دواتر ڕەخنەیەکی زۆر لێگیرا، چونکە بەهەمان دەرئەنجامی کۆڵمان گەشت لە کتێب نایەکسانی: دوبارە هەڵسەنگاندنەوەی کاریگەریەکانی خێزان و پەروەردەی قوتابخانە لە ئەمریکا.

 ئالیسۆن وۆڵف لە شیکردنەوە وردەکەی ئایا پەروەردە گرنگە؟ دەڵێت: کەسێك کە پرسیار لە هەڵکشانی لەناکاوی بودجەی پەروەردە بکات یەکسەر وەکو گەمژە سەیر دەکرێت. جۆن مارش لە کتێبی وانەکە تەواو بووە بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە داتاکانی ئەمریکا دەبەستێت، بە هەمان دەرئەنجامی هاوشێوەی وۆڵف گەشتووە، بەڵام مارش لێکدانەوەیەکی جیاوازی بۆ دەکات، سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێت کە ئەو بودجە گەورەیەی وڵاتان لە پەروەردەدا خەرجی دەکەن زۆرکەم دەرفەتی ئەوانە باش دەکات کە گوزەرانیان خراپە. مارش بەو دەرئەنجامەش گەشت کە قوتابخانەکان شکستیان هێناوە تەك لە یەکسانکردنی دەرفەتەکان، بەڵکو هەتا لە گۆڕینی دابەشبوونی دەرفەتەکانیش بەسەر فێرخوازاندا.

وۆڵف خەفەت بەوە دەخوات کە وڵاتە تازە پێگەشتووەکان مۆدیلە پەروەردەیە نەزۆك و خراپەکەی ڕۆژئاوا کۆپی ئەکەن. لە وەڵامی ڕەخنەیەك لە شیکردنەوەیەکدا وۆڵف ئەڵێت: لەوەباوەڕەدام هەر کەسێك شارەزای وڵاتانی تازەپێگەشتوو بێت گومان لەوە ناکات کە پەروەردە ڕاکەڕاکێ بێبەرهەمە. لەوەش خراپتر باوەڕبون بەوەی پەروەردە ئەتوانێ گەشەسەندن بهێنێتە کایەوە ڕێگایەکی ئاسانمان پێدەدات بۆ ڕاکردن لە بەرپرسیارێتی.

ئێمە پێویستمان بە کۆنترۆڵی بیرکردنەوە نییە

بێرتراند ڕاسل دەربارەی قوتابخانە دەدوێت و دەڵێت: تێکەڵەیەکە لە زیندان و کامپی سەربازی. ئەو کەسانەی کە ڕەخنەی جدیان هەبوو لەمجۆرە لە قاڵبدانە، ئەی ئێڵ نێس بوو لە بەریتانیا قوتابخانەی سەمەرهێڵی دامەزراند. نێڵ پێیوایە کە سەپاندنی دەسەڵات منداڵ ئەترسێنێت و ڕێگری دەکات لە دەربڕینی بیروڕاکان. جیۆفری ڕۆبەرتسنی پارێزەری مافەکانی منداڵ دەڵێت: منداڵانیش مافیان هەیە و نابێت لەلایەن دایباب و مامۆستاکانەوە خاوەندارێتی بکرێن؛ هەڵەیەکی گەورەشە ناچاربکرێن پێچەوانەی ویستی خۆیان بجوڵێنەوە تەنها ئەوکاتە نەبێت ڕەچاوی ویستی ئەوانیتر ئەکرێت.

لەبەرامبەر ناردنی منداڵ بۆ قوتابخانە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە پەروەردەی ماڵەوە بوو بە شتێکی باو بەتایبەت لە ناو چینی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارەکان. وەك وەڵامێك بۆ جۆن لۆك کە دژی جیاکاری منداڵان لە قوتابخانە قسەیان کردبوو. دوای لۆك ڕۆسۆش ئامۆژگاریمان دەکات کە: هەژاری، فشاری ئیشوکار، تێڕوانینی هەڵەی کۆمەڵایەتی هیچیان نابنە پاساو بۆ ئەوەی کە مرۆڤ ئەرکی خۆی بەجێنەهێنێ کە ئەویش هاریکاری و پەروەردەکردنی منداڵەکەی خۆیەتی. چارلۆت ماسۆن کە پەروەردەکارێکی بەناوبانگی ئینگلتەرایە دەڵێت لە ژێر کاریگەری قسەکانی لۆك و ڕۆسۆ خەڵکی لە دونیایی تازە هەندێکجار مێردەکانیان جێدەهێشت بۆ خوێندنی کلاسیك، تاوەکو بە دەستی خۆیان منداڵەکانیان فێربکەن.

قوتابخانەکان ئەوە ناکەن کە بانگەشەی ئەنجامدانی ئەکەن

ئایڤان ئیلچ لە ساڵی ١٩٧١ لە کتێبە کورتەکەیدا بەناوی "پەروەردەی کۆمەڵگا لە دەرەوەی قوتابخانە" ئیلچ ئارگۆمێنتێکی بەهێزی پێشکەشکرد بۆ ڕزگاربوون لە دەستی قوتابخانە. پەیامەکەی بەمجۆرە کورتدەکاتەوە: ناچارکردنی منداڵ بۆ ئامادەبوون لە قوتابخانە مافی فێربوون سنوردار دەکات. ئیلچ دەڵێت: ئێمە فێرکردن لەگەڵ فێربوون، پەروەردە لەگەڵ نمرەی بەرز، بڕوانامە لەگەڵ لێهاتوویمان تێکەڵکردووە. لەبارەی فێربونەوە ڕوبەڕوی تەحەدیەکمان دەکاتەوە: دەڵێت لە خەڵکی بپرسن با ڕوونیبکەنەوە کە چۆن فێری ئەوشتە بوون کە دەیزانن و لایان بەهادارە؛ زۆرینەیان دانبەوەدا دەنێن لەدەرەوەی قوتابخانە فێربوون. خەڵکی ڕاستیەکان، تێگەشتن لە ژیان و کار هەمویان لە هاوڕێ و دۆستەکانیان وەرگرتوە یان لە تەماشاکردنی تەلەفزوێنەوە، لە خوێندنەوە، لە نمونەی هاوپیشەکانیان یان بینینی کەسێك لە بازاڕدا. زۆر بە سادەیی هۆکاری شکست

له قوتابخانه‌دا له هه‌ژاریه‌وه سه‌رچاوه ده‌گرێت نه‌ك له كێشه‌گه‌لێك له منداڵدا هه‌بێت، ئیلچ له‌وه‌دا زۆر وردبین بووه كه به‌مه‌ی زانییوه.

له كتێبی په‌روه‌رده‌ی سته‌ملێكراواندا فرێری ده‌ڵێت: شێوه نه‌ریتیه‌كانی په‌روه‌رده له خزمه‌تكردنی به‌رده‌وامپێدانی چه‌وسانه‌وه‌ی هه‌ژاراندا بووه. پێیوایه په‌روه‌رده ده‌بێت شكۆ بدات به كرێكار و هاوكاری بێت له ئازادكردنی له سته‌مكاری نه‌وه‌ك كرێكارێكی باشی لێدروستبكات.

جۆن گاردنه‌ری وه‌زیری ته‌ندروستی و په‌روه‌رده‌ی ئه‌مریكی له لێدوانێكدا له ساڵی ١٩٦٥ گوتی كه هه‌موو ئه‌وه‌ی ده‌رچویه‌كی ئاماده‌یی له‌ماوه‌ی دوانزه ساڵ فێری ده‌بێت ئه‌كرێت به ئاسانی له ماوه‌ی دوو ساڵ فێری بێت.

ئایا داهاتوو چی ده‌هێنێت

هۆكار چیه ته‌مه‌نی به‌رده‌وامبوون له قوتابخانه به‌رزده‌كرێته‌وه؟ بۆچی به جدی ته‌ماشای ئه‌و له سه‌دا چله‌ی فێرخوازان ناكه‌ن كه پۆلی نۆی ناوه‌ندی ته‌واو ده‌كه‌ن به ده‌ستكه‌وتێكی كه‌مه‌وه، ئه‌مه بۆچی وه‌هایه؟ بۆچی ئێمه زۆریان لێده‌كه‌ین ئاماده‌ی قوتابخانه ببن له كاتێكدا خۆیان حه‌زی لێناكه‌ن؟

له كتێبی ئه‌و قوتابخانه‌ی من حه‌زم لێیه‌تی له نوسینی بێركه‌و سڤێنه‌ر، باس له منداڵێكی چوارده ساڵان ده‌كات ده‌رباره‌ی ئه‌و قوتابخانه‌ی حه‌زی لێده‌كات و ده‌ڵێت: حه‌زم لێیه چیتر نه‌بینم منداڵ و قوتابخانه پێكه‌وه هاوتا بكرێن. هه‌رچه‌نده دودڵیشم له ڕووی ئابوریه‌وه شتێكی كرده‌یی بێت. به‌ڵام حه‌زم لێیه سیسته‌مێكی په‌روه‌رده‌یی گشتگیر و ئاره‌زومه‌ندانه هه‌بێت بۆ هه‌موو ته‌مه‌نه‌كان.

له‌بری دابه‌زینی ته‌مه‌نی منداڵ بۆ هاتن بۆ قوتابخانه ته‌مه‌نی به‌رزبكرێته‌وه.

بڕی ئه‌و كاته‌ی منداڵ له قوتابخانه به‌سه‌ریده‌بات گرنگ نییه.

قه‌باره‌ی پۆل گرنگه بۆ كالێتی فێربوون.

فێربوون له ئاماده‌یی نه‌رمیه‌كی تێدابێ، بۆ ئه‌وانه‌ی له قوتابخانه نین پلانیان هه‌بێت بۆ سود وه‌رگرتن له كاته‌كانیان كاتێك له ده‌ره‌وه‌ن.

برۆن كاری كۆمه‌ڵایه‌تی ئه‌نجامبده‌ن

لەگەڵ داپیرە و باپیرەیان کات بەسەر بەرن

لەگەڵ فێرخوازانی وڵاتانیتر جێگۆڕکێ بکەن

پەروەردە و پەروەردەی قوتابخانە دووشتی جیاوازن. پەروەردەی باش لەگەڵ هێنانی نمرەی بەرز دووشتی زۆر لەیەك جیاوازن.

جۆن مارش دەڵێت: ئەگەر قوتابخانەکان لە ڕادەبەر دەرفەتەکانی ژیانی فێرخوازان باشتر یان خراپتر ناکەن، ئیتر بۆچی فێرخوازان ئازاد ناکەن کە شوێن ئامانجی پەروەردەییتر بکەون.

## کتێبی دوانزەیەم: گێلمان دەکەن. - نوسینی: جۆن تایلەر گاتۆ.

وەرگێرانی: بنار جەبار.

چاپی یەکەم ٢٠٢٤

### بەندی یەکەم

حەوت وانەکەی مامۆستای خوێندنگە

فێرکردن لە شوێنە جیاوازەکان مانای جیاوازی هەیە، بەڵام حەوت وانە هەن بەبێ جیاوازی. ئەو حەوت وانەیە بەرنامەیەکی نەتەوەیی خوێندن و بەرێزیشت بە چەندین شێوە کە بیریشت لێنەکردوەتەوە نرخەکەی دەدەیت.

وانەی یەکەم: سەرلێشێوان: یەکەم وانە فێری فێرخوازانی دەکەم سەرلێشێوانە، هەمووی ئەوەی فێریان دەکەم لە دەرەوەی سیاقە. باسی شتە بێپەیوەندیەکانی هەموو شتێك دەکەم، فێری نەبوونی پەیوەندیەکانی دەکەم. مامۆستاکان منداڵەکان نوقمی سەرلێشێوان دەکەن، کەمترین هاوکاری لە نێوان مامۆستایاندا هەیە، هەمویان وای نیشاندەدەن شارەزای شتێك بن، لە کاتێکیشدا وانییە.

خوێندنی ڕاستەقینە واتە فێربوونی شتێك بە قووڵی، مرۆڤ بە دوای ماناوەیە، نەوەك کۆمەڵێك زانیاری لێکپچڕاو، پەروەردەیش کۆمەڵێك کۆدە بۆ گۆڕینی زانیاریە خاوەکان بۆ مانا. خوێندنگە ئارەزوومەندیەکی سەیری بۆ زانیاری و بیردۆزەکان هەیە. زۆربەی مامۆستایان ناوێرن فێرخوازان فێری ئەو کەرەستەیە بکەن کە دەکرێت ڕەخنەیان لە دۆگمایی خوێندنگە یان خودی مامۆستایان پێ بگیرێت، چونکە لە خوێ"دنگە دەبێت هەموو شتێك قەبوڵ بکرێت.

وانەی دووەم: شوێنی پۆل: فێرخوازان فێردەکەین لە شوێنێك بمێننەوە کە هی ئەوانە. من نازانم کێ بڕیاری داوە منداڵان لەوێدابن، بەلام ئەوە کاری من نییە. ئەگەر من مامۆستایەکی باش بم کارەکەم بە جوانی ئەنجام بدەم، منداڵەکان ناتوانن وێنای ئەوە بکەن کە لە جێیەکیتر بن، چونکە فێرم کردوون ئیرەیی بە پۆلە باشترەکان ببەن و لێیان بترسن، هەروەها بێز لە پۆلە گێلترەکان بکەن، پۆل وەك ڕێکخراوی سەربارزی دەردەکەوێت. هانی فێرخوازانم دەدەم هەوڵی باشبدەن و لە تاقکیکردنەوەکاندا باشبن و نمرەی بەرز بهێنن، ڕۆژێك دێت خاوەن کارەکان بەهۆی نمرەی بەرزەنەوە کاریان پێدەدەن، بەڵام چاکیش دەزانم ئەوەی خاوەن کار گرنگی پێنادات نمرەی بەرزە.

وانە سێیەم: گوێپێنەدان: منداڵەکان فێردەکەم گرنگییەکی ئەوتۆ بە هیچ شتێك نەدەن، بەڵام وای بنوێنن دەیدەن. بە شێوەیەکی زۆر لێزانانە ئەمە دەکەم. داوایان لێدەکەم لە وانەکاندا

ڕۆبچن، بە خرۆشانەوە چاوەڕێ بن، هەروەها لە پێناو قایلکردنی مندا ڕکابەری بکەن. بەڵام کاتێك زەنگەکە لێدەدات داوایان لێدەکەم واز لە هەموو ئەوە بهێنن کە باسمانکرد خێرا خۆیان بۆ وانەی مامۆستایەکیتر ئامادە بکەن، واتەی زەنگەکان ئەوەیە هیچ شتێکی گرنگ شایستەی تەواوکردن نییە.

وانەی چوارەم: پشتپێبەستنی سۆزداری: فێرخوازەکانم ناچار دەکەم ویستی خۆیان ملکەچی فەرمانە یەك لەدوای یەکەکان بکەن، بۆ نمونە بە هەندێکیان ئەستێرە دەدەم، لە هەندێکیان نمرە دەشکێنم، بە ڕویاندا پێدەکەنم، خۆمیان لێ سوردەکەمەوە، خەڵاتیان دەکەم هەروەها ڕیسوایان دەکەم. دەکرێت مافەکان بە هیچ هۆیەك بدرێن یان ڕابگیرێن، چونکە لە خوێندنگە مافەکان بونیان نییە. وەك مامۆستا من دەست لە زۆرێك لە بڕیارە کەسیەکان دەدەم، ئەوانەی بە گونجاویان دەزانم بەڵێ وەردەگرن، ئەوانەشی هەڕەشە لە جڵەوی من دەکەن ڕوبەڕووی سزا دەبنەوە.

وانەی پێنجەم: پشتپێبەستنی فکری: فێرخوازەباشەکان چاوەڕێی مامۆستا دەکەن پێیان بڵێت چی بکەن. ئەمە گرنگترینی هەموو وانەکانە؛ ئێمە دەبێت چاوەڕێی کەسانێك بکەین مانا بە ژیانمان بدەن، کە لە خۆمان باشتر ڕاهێنراون و ئاستیان بەرزترە. تەنیا منی مامۆستا دیاریدەکەم فێرخوازەکانم چی بخوێنن، یان ڕاستر بڵێم ئەو کەسانەی پارەم پێدەدەن ئەو بڕیارانە دەدەن. دەسەڵاتی جڵەوکردنی بیرکردنەوەی منداڵان کەرەستەیەکی باشە بۆ جیاکردنەوەی فێرخوازە سەرکەوتووەکان لە فێرخوازە شکستخواردوەکان.

فێرخوازە سەرکەوتووەکان بە کەمترین بەرهەڵەستیەوە ئەو بیرکردنەوەیە ئەنجام دەدەن کە من بۆم داناون، هەروەها وایشی دەنوێنن بابەتەکەیان لا گرنگە. بەڵام منداڵە خراپەکان بەرهەڵەستی ئەمە دەکەن، بەڵام چەمکی پێویستیان نییە بۆ ئەوەی بزانن دژی چی دەجەنگن، هەروەها بێتاقەتن لەوەی ناتوانن بڕیار لەسەر ئەوە بدەن فێری چی دەبن و کەی فێردەبن. خۆشبەختانە ڕێگەی تاقیکردنەوە بۆ شکاندنی ویستی بەرهەڵستکاریان هەیە. ئەگەر دەتەوێت موچەکەت نەبڕێت، لە داواکردنی چاکسازی خوێندنگە پەلە مەکە. ئێمە شێوازێکی ژیانمان دروستکردوە پشت بەوە دەبەستێت خەڵکی ئەوە بکەن کە پێیان گوتراوە، چونکە خۆیان ناوانن چی بکەن.

وانەیشەشەم: ڕێز لەخۆگۆتنی پچڕپچڕ: ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان ویستبێتت منداڵێك بخەیتە ڕیوی ئەوانیترەوە کە دایبابیان قەناعەتیان پێکردبێت هەمیشە خۆشیان دەوێت، دەزانیت ملکچکردنی ڕۆحیەتە متمانە بەخۆبوەکان چەندە گرانە. کاتێك داوەری لەسەر منداڵێك دەکرێت؛ لە ئەنجامدا منداڵەکە بە پشتبەستن بە داوەری سەرپێی کۆمەڵێك کەسی بێگانەدەگات بە کۆمەڵێك بڕیار سەبارەت بە خۆی و داهاتووی.

واتەی حەوتەم: خۆشاردنەوە نییە: فێرخوازانم فێری ئەوە دەکەم بەردەوام چاودێریان دەرکێت و هەموویان لە ژێر چاودێری من و هاوکارەکانمدان. فێرخوازەکان هاندەدرێن دنگوباسی یەکتر بگوازنەوە، بگرە ڕازەکانی دایبابیشیان باس بکەن. من هانی دایباب دەدەم باسی بزێوی منداڵەکانیانم بۆ بکەن، خانەوادەیەك لەسەر بلاوکردنەوەی وورەکاریەمانی خۆی ڕاهێنرابێت ناتوانێت ڕازێکی مەترسیدار بشارێتەوە.

جۆرێکی درێژکراوەی مەکتەباندن بە ناوی "ئەرکی ماڵەوە" بەکاردەهێنم، تاوەکوو کاریگەری چاودێرێکە بچێتە ماڵەکانیشەوە، چونکە ئەگەر وانەکەم بۆی هەیە فێرخوازەکان ئەوکاتە بەتاڵە بۆ فربوونی شتیك لە دایبابیانەوە فێربن.

لە دوای جەنگی ناوخۆوە کۆمەڵگە کەوتە ژێر دەستی جلەوێکی ناوەندیەوە، کۆمەڵگەیەکی ئاواش بۆ بەرداومبوون پێویستی بە خوێندنی مەکتەباندنی ناچارییە. پێش خوێنجنی ناچاری ئێمە خوێندنمان هەبوو، بەڵام زۆرنا و بە ئەندازەی خواستی تاك، خەڵك بە بێ مێشە فێری خوێندنەوە، نوسین وژماردن دەبوون؛ هەندێك توێژینەوە هەن دەڵێن خوێندەواری لە سەردەمی شۆڕشی ئەمریکیدا، لانی کەم ئەوانەی لە بەندەری ڕۆژهەڵات کۆیلە نەبوون، نزیکبوەوە لە ڕێژەی تەواو. کتێبی کۆمۆن سێنسی تۆماس پەین، شەسسەدهەزار دانەی لێفرۆشرا بە دانیشتوانێکی سێ ملیۆن کەسی کە سەدا بیستیان کۆیلە بوون و سەدا پەنجایان خزمەتکاری بێمووچە.

لە دوای شەڕی ناوخۆوە کۆمەڵگەکەمان بە تەواوەتی کەوتوەتە ژێر دەستی دەسەڵاتی ناوەندیەوە، ئەمەش بە تەواوەتی لە ژیانماندا ڕەنگی داوەتەوە. لەوەیش زیاتر، باوەڕم وایە پەتای مادده هۆشبەرەکان، خۆکوشتن، جیابوونەوە، توندوتیژی، دڕندەیی و ڕەقبوونی چینە کۆمەڵایەتیەکان بەرهەمی لە مرۆیخستنی ژیانمانن، بەرهەمی بێبایەخکردنی تاك و خانەوادە و کۆمەڵەی ڕاستەقینەن، بەهێزبوونی دەسەڵاتی ناوەندنی واتای لاوازبوونی ئەمانە.

ڕاستیت بووێت کاتێك منداڵەکەت دەخەیتە بەردەست شارەزاگەلێکی مۆڵەتپێدراو، کۆمەڵەی ڕاستەقینە لەناودەبات و لە منداڵەکانمان دەسەنێتەوە، بەم شێوەیە ناهێڵێت ببێت مرۆڤێکی کامڵ. حەوت وانەکە ئەو پرۆگرامە ئیفلیجی جەستەیی، ئەخلاقی، هەروەها فیکری دروستدەکات، هیچ پرۆگرامێکی ناوەڕکپڕیش ناتوانێت کاریگەریە خراپەکانی پێچەوانە بکاتەوە.

ئێمە بژاردەمان لە پەروەردەکردن لاواندا هەیە: تاقە ڕێگەیەکی ڕاست نییە. ئابووری جیهانەی قسە لەگەڵ پێویستی خەڵك بۆ کاری مانادار، پەروەردەی کامڵ، ژینگەی پاك یان دادگەری ناکات، هەموو خواستەکانی ئابووری جیهانی پشت بە بەرهەمداری و ژیانێکی باش دەبەستێت کە هێندە لە واقعی خەڵکەوە دوورە.

هۆکار چیە قوتابخانە دروستبووە؟

هەی یەکەم لە ڕاستیدا خوێندنی ئاسایی هەمیشە بە جۆری جیاواز هەبووە و بۆ پێگەشتن سوجی هەبووە، بەڵام خوێندنی مۆدێرن وەك ئەوەی ئێستە دەیناسین، زادەی دوو ترسە سورەکەی ساڵلا ١٨٤٨ و ١٩٩٩یە، کاتێك بەرژەوەندیدارە خاوەن دەسەڵاتەکان لە شۆرشی هەژارەکانی کۆمەڵگەی پیشەسازی ترسان. هۆکاری دووەم دروستبوونی خوێندنگە بەم شێوەی ئێستا خانەوادە دێرینە ئەمریکیەکان ڕقیاان لە فەرهەنگە ڕەسەنەکانی کۆچبەرە سەڵتیکی، سلاڤی و لاتینیەکانی ١٨٤٠ەکان بوو. هۆکاریی سێیەم دروستکردنی زیندانێك بۆ منداڵان بوو بەناوی خوێندنگە، دڵەڕاوکێ و بێزاری ئەمریکیەکان بوو بەرامبەر جوڵەی ئەفریقیە ئەمریکیەکان لە کۆمەڵگەی کازیوەی جەنگی ناخۆدا.

هیچ سەرسامیەك لەودا هەیە کە سوکرات پێی ناخۆش بوو کاتێك تۆمەتباریان کرد بەوەی بە پارە وانەی گوتبێتەوە؟ تەنانەت ئەوکات فەیلەسوفان دەیانزانی بە پیشەیکردنی پرۆسەی فێرکردن ئەرکی سەرەکی فێرکردن لەناو دەبات، کە لە کۆمەڵگەیەکی تەندروستدا بۆ هەمووان بەردەستە.

بە لە بەرچاوگرتنی ئەم وانای دەیانڵێیمەوە، جێی سەرسامی نییە ئێمە  لە قەیرانێکی نەتەوەییدان، بەڵام قەیرانێکی جیاواز لەوەی ڕاگەیاندنی نەتەوەیی نیشانی دەدات. لاوان گوێ بە جیهانی پێگەشتووان و داهاتوو نادەن، لە دابەشکردنی یاریەکان و توندوتیژی نەبێت لە هەموو شتێك بێخەبەرن.

گرنگ نییە دەوڵەمەندن یان هەژار، ئەو منداڵانە لە بەرانبەر سەدەی بیست و یەك وەستاون ناتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ تەرکیزیان لەسەر هیچ شتێك وردبکەنەوە، تێگەشتنێکی ڕێکوپێکیان بۆ داهاتوو نییە، ئەوان بەانبەر خۆسەویستی و نزیکی ڕاستەقینە بە گومانن؛ ڕقیان لە تەنهاییە، بێڕەحمن، دونیاپەرەستن، ناتوانن پشت بە خۆیان ببەستن، ناچالاکن، توندوتیژن، بەرانبەر شتە چاوەڕوان نەکراوەکان شەرمن و کزۆڵن، هەروەها ئالودەی شتە سەرنجبەرەکانیش بوون.

لە سەردەمی منداڵیدا مرۆڤ هەندێك ەیلی لاوەکی هەیە، خوێندنگەش لە ڕێگەی پرۆگرامە شاراوەکەیەوە ئەو مەیلانە زەقدەکاتەوە و ڕێگە بە گەشە تەندروستی کەسایەتی نادات. خۆ ئەگەر خوێندنگە سودی خراپی لە چاونەترسی، خۆبەکەمگری، هەروەها بێئەزموونی منداڵان وەرنەگرتایە نە خوێندنگە دەما نە منێکیش دەمتوانی بە خۆم بڵێم مامۆستای مۆڵەتپێدراو. کاتی ئەوە هاتووە دان بەوەدا بنێین خوێندنی دامەزراوەیی خوێندنگەیی بۆ منداڵ خراپە.

هەمو ئەو نەخۆشیانە زادەی ئەوەن خوێندنگە ناهێڵێت منداڵان کاتی پێویست لەگەڵ خۆیان و خانەوادەکانیان بەسەر بەرن، تاکو فێری هاندانی خودی، بەردەوامی، پشتبەخۆبەستن، ئازایەتی، شکۆ و خۆشەویستی ببن، هەروەها لەو وانانەش بێبەشیان دەکات کە بە خزمەتکردنی ئەوانیتر فێریان دەبن، ئەو وانانە گرنگترین وانەکانی ژیانی کۆمەڵە و خانەوادەن.

بەر لە سی ساڵ، منداڵ دەیتوانی پاش هاتنەوە لە خوێندنگە فێری ئەو وانانە بێت، بەڵام ئێستا تەلەفزوێن و مۆبایل بەشێکی زۆری ئەو کاتەش دەبات، بۆیە تەلەفزوێن و مۆبایل شانبەشانی فشارەکانی خانەوادە یەك باوانەکان کە کاردەکەن بەشێکی زۆری ئەو کاتە لەناو دەبەن کە جاران پێیان دەگوترا کاتی خانەوادە.

داهاتوو داوامان لێدەکات فێری دانایی ئەزموونە نامادیەکان ببین؛ داهاتویەك دەڵێت ئەگەر نیازتان مانەوەیە، دەبێ ژیانێکی سروشتی بەرێکەن قەناعەتی تێدابێت و زیادەڕەوی تێدا نەبێت.

خوێندنگە زیندانێکی دوانزە ساڵییە، تیایدا خووە خراپەکان تاکە بابەتن منداڵ بە تەواوەتی فێریان ببێت.

بەندی دووەم

خوێندنگەی بێڕەحم

لەسەردەمی ئێمە قەیرانێکی گەورەی خوێندنگەیی لە قەیرانێکی گەورەتری کۆمەڵایەتی ئاڵاوە، پشکی ئابوری جیهانی مادەی هۆشبەر و جگەرە و نێرگەلە بە کارهێنانی قایمە؛ ئەگەر ئەوەندە دەرمانی هۆشبەر و جگەرە و نێرگەلە نەکڕابایە، بازرگانی ئەو جۆرە ماددانە دادەڕما، خوێندنگەکانیش بەرهەمهێنەیێکی باشی موشتەرین. ڕێژەی خۆکوشتن لە نێو لاوانمان زۆر بەرزە، زۆربەی جاریش ئەو منداڵانەی خەیاڵی خۆکوشتن دەکەن لە خانەوادە دەوڵەمەندەکانن، ڕێژەی جیابونەوە لە نێو گەنجانیش بەرزترین ڕێژەیە، دەی کەوایە کێشەیەك هەیە.

وا دەردەکەوێت ئێمە شوناسمان لەدەست دابێت. منداڵان و بەساڵاچوان بە جۆرێك لە کاروباری ژیانی ڕاستەقینە دابڕێندراون، لە مێژوودا هاوشێوەی نییە؛ چیتر کەس لەگەڵ ئەم دوو چینە نادوێت، خۆ ئەگەر منداڵان و بەساڵاچوان لە ژیان ڕۆژانە بەشداریان نەبێت، کۆمەڵگە نە داهاتووی دەبێت نە ڕابردوو، بەڵکو تەنها ئێستایەکی بەردەوامی دەبێت، لە ڕاستیدا زاراوەی

کۆمەڵە بەسەر شێوازی مامەڵەکردنی ئێمە لەگەڵ یەکتردا جێبەجێنابێت، ئێمە لە تۆڕدا دەژین نەك کۆمەڵە هەموو خەڵکیش بەهۆی ئەوەوە هەست بە تەنهایی دەکەن، خوێندنگەش بەشێکی گەورەی ئەم کارەساتەیە، چونکە کارای سەرەکی فراوانکردنی درزی نێوان چینە کۆمەلایەتیەکانە، کاتێك خوێندنگە وەك میکانیزمێکی پۆلێنکردن بەکار دەهێنین، وا دەردەکەوێت سیستەمێکی چینایەتی دروست بکەین، کە تیایدا کەسانێك هەن لە خواری خوارەوەن، لە شەمەندەفەرەکاندا سواڵ دەکەن و لە سەر شەقامەکاندا دەخەوەن و لە ناو زبڵدانەکاندا نان دەخۆن.

خوێندنگە و مەکتەباندن تا بێت لە بابەت و کارە گرنگەکانی ژیان دووردەکەونەوە، چیتر کەس باوەڕی بەوە نییە زاناکان لە وانەکانی زانستەوە فێرببن، سیاسیەکان لە وانەکانی سیاسەت و شاعیرەکانیش لە وانەکانی شیعرەوە. ڕاستیەکەی ئەوەیە خوێندنگە فێری هیچت ناکات گێڕایەڵیکردن و فەرمانکردن نەبێت.

ئەمە مەتەڵێکی گەورە و ئاڵۆزە، هەزاران کەسی باش و دڵسۆز لە خوێندنگەکاندا مۆستا و یاریدەدەر و بەڕێوبەرن، بەڵام وا دیارە لۆجیکی پەتی دامەزراوەکە بەسەر هەوڵە تاکە کەسیەکاندا زاڵ دەبێت.

بابەتێکی سەرنجڕاکێشمان بۆ بیرکردنەوە هەیە، ئۆفیسی تێد کێنەدی ئەندامی ئەنجومەن، پەڕاوێکی بڵاوکردەوە دەیگوت پێش ئەوەی خوێندن لە ویلایەتەکەدا ناچاری بێت، ڕێژەی خوێندەواری سەدا نەوەد و هەشت بووە، کەچی پاش خوێندنی ناچاری، واتە لە ئێستادا هەرگیز لە سەدا نەوەدی تێنەپەڕاندووە.

ئەگەر بمانەوێت قەیرانی نەزانی چارە بکەین، دەبێت بزانین خوێندنگە لە مەکتەباندا باشە و لە فێرکردن و پەروەردەدا خراپ. هۆرەیس مان، بیردنارد سێرز و هارپەر لە زانکۆی شیکاگۆ، هەروەها سۆرندایکی کۆلێژی مامۆستایانی کۆڵەمبیا و هەندێك کەسیتر خوێندنگەیان دروستکرد، بۆ ئەوەی وەك کەرەستەیەك بۆ بەڕێوبردنی زانستی کۆمەڵگە بەکاری بهێنن، لە ڕێگەی کۆمەڵێکهاوکێشەوە ئامانجی خوێندنگەکان بریتیە لە بەرهەمهێنانەوی کۆمەڵێك مرۆڤی ئامادە و لێکچوو کە ڕەفتاریان پێشبینی دەکرێت و جڵەو دەکرێن.

بە بۆچونی من، ئەو داماوییە ڕۆژانەییەی لە دەوروبەرمان بەدی دەکەین، وەك پۆڵ گۆدمان بەر لە سی ساڵ گوتویەتی، بەرهەمی ئەوەیە ئێمە زۆر لە منداڵەکانمان دەکەین زۆر بە بێمانایی گەورە بن. شتێکی دژە ژیانە بەشێك بیت لە سیستەماتیك کە ناچارت دەکات لەگەڵ کەسانێك دابنیشیت لە تەمەن و چینی کۆمەڵایەتیدا ڕێك وەك خۆتن، ئەو سیستەمە ناهێڵێت بەر هەمەڕەنگی ژیان بکەویت؛ بەڵێ لە ڕابردوو و داهاتوو دادەبڕێت، لە ئێستایەکی بەردەوامدا گیرت دەدات. شتێکی بێمانایە و دژە ژیانە هەموو ڕۆژێکی ژیانی لاویت لەگەڵ لێدانی وەنگدا لەم پۆل بۆ ئەو پۆل برۆیت، لە دامەزراوەیەکدا کە هیچ بوارێکی تایبەتت بۆ ناهێڵێتەوە و تەنانەت لە

ماڵەوەش وازت لێ ناهێنێت و داوای کاری ماڵەوەت دەکات. ئێمە لە وڵاتی قسەکەرانین، زۆرترین پارە بە قسەکەران دەدەین و لە هەموو کەسێك زیاتر خۆشمان دەوێت، بۆیە منداڵەکانیشمان لاسایی قسەکەرە گشتیەکانی تەلەفزوێن و سۆشیال میدیا و مامۆستاکان دەکەنەوە و بەردەوام قسە دەکەن.

لە ئێستادا دوو دامەزراوە جڵەوی ژیانی منداڵەکانمانیان کردووە: شاشە و خوێندنگە، بەو ڕیزبەندیە. ئەو دوو دامەزراوەیە دانایی، ژیانی ڕاستەقینە، خۆڕاگری، پشوو درێژی و دادگەری کەمدەکەنەوە بۆ پەتیکردنێکی کۆتایی نەهاتوو. لە سەردەمانی ڕابردوو ساڵانی منداڵی و هەرزەکاری لە کاری ڕاستەقینە، کاری خێرخوازی، سەرکێشی، هەروەها لە گەڕان بۆ ڕێبەرانێکدا بەسەر دەبران کە دەکرا شتێکی گرنگت فێربکەن.

مرۆڤانێك کە ناتوانن کاتەکانی خۆیان پڕ بکەنەوە، ناتوانن بچنە سەر هێڵە مانادارەکان تا چێژ و ناوەڕۆکی ڕاستەقینە بە ژیان بدەن، ئەم نیازمەندی و بێئامانجیە نەخۆشی نەتەوەیین، پێشم وایە شاشە و خوێندنگە هۆکاری سەرەکین.

بیر لەو دیاردانە بکەرەوە کە دەستیان لە بینەقاقای نەتەوەکەمان گیر کردووە: ماددەی هۆشبەر، ڕکابەری بێمێشکانە، سێکس لەبەر چێژ، پۆرۆنۆگرافی توندوتیژی، قومار، هەروەها کحول لە هەمووەوی خراپتر سەرفکردنی ژیان لە کڕینی شتدا، واتە کۆکردەوەی کاڵا وەك فەلەسەفەیەکی ژیان. هەموو ئەمانە ئالودەبوونەکانی کەسانێکی پشتبەخۆنەبەستووە، شێوازی خوێندنی ئێمەش ئەمانە بەرهەم دەهێنێت.

دەمەوێت پێتان بڵێم داگیرکردنی کاتی منداڵان و ناچارکردنیان بە خەرجکردنی کاتێکی زۆر لە بابەتە پەتیەکاندا چ زانێکیان لێدەدات، ئەو منداڵانەی من وانەیان پێدەڵێم:

١- گرنگی بە جیهانی گەورە ساڵان نادەن، ئەمە پێچەوانەی ئەزموونی هەزار ساڵەیە.

٢- کنجکۆڵ نین، کاتێك سەبارەت بە شتێك کنجکۆڵ دەبن، زوو بیریان دەچێتەوە، ناتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ تەنانەت لەسەر شتە دڵخوازەکانیشیان ورد بکەنەوە.

٣- تێگەشتنێکی لاوازیان بۆ داهاتوو هەیە، هەروەها تێناگەن داهاتوو چۆن بە ئەمڕۆوە بەستراوەتەوە.

٤- دابڕاون لە مێژوو، ئەوان نازانن ڕابردوو چۆن نەخشەی ئێستای کێشاوە، بڕیارەکانیانی سنوردار کردووە هەروەها بەها و ژیانیانی دیاریکردووە.

٥- بەرامبەر بە یەکتری بێڕەحمن، بانبەر بە دۆخی ناخۆش و کارەساتی ئەوانیتر بێسۆزن، بە لاوازەکان پێدەکەنن، ڕقیان لەوانەیە پێویستیان بە یارمەتیە.

٦- ناتوانن لەگەڵ ئەوینی ڕاستەقینە هەڵبکەن، چونکە فێربوون خودێکی دەروونی شاراوە لە کەسایەتیەکی گەورەتری دەرەکیدا بشارنەوە؛ کەسایەتیەکی دروستکراو لەو ڕەفتارانەی لە شاشە و مامۆستا زۆردارانەکانەوە وەرگیراون.

٧-ماددەگەران، چونکە شوێنی ئەو مامۆستایانە کەوتوون کە بە شێوەیەکی نمرە لەسەر هەموو شتێك داداەنێن.

٨-لە بەانبەر ئاڵنگاری نوێدا نیازمەند و لاواز و شەرمنن.

لە نێوان شاشە و خوێندنگەدا منداڵ کاتی بۆ نەماوەتەوە، چیتر کاتێکیان بۆ نەماوەتەوە تیایدا ئەزموونی بابەتە گرنگترەکان بکەن.

چی بکەین؟

پێویستمان بە گفتوگۆیەکی زیندووی نەتەوەییە خۆی بەدەستەوە نەدات، ڕۆژ لە ڕۆژ بەردەوام بێ، لەو گفتوگۆیەی ڕۆژنامەکان بە وەرزکەریان دەزانن. دەبێت ئەوەندە باسی ئەم بابەتی خوێندنگەیە بکەین یان چاکی دەکەین یان بە تەواوەتی وێرانی دەکەین. ئەگەر ئەو پارەیەی ئێستا دەیخەینە خزمەت خوێندنگەوە بیخەینە خزمەت پەروەردەی ناو خانەوادەوە، ڕەنگە بە دەرمانێك دوو دەرد چارەسەر بکەین: دەردی وێرانبوونی خانەوادە، دەردی پەروەردەی منداڵ.

چاکساز ڕاستگۆیانە ڕێتێچووە، بەڵام نابێت پارەیەکی وا تێبچێت. ڕژاندنی پارەی زیاتر بەسەر ئەم دامەزراوەیەدا و هێنانی خەڵکی زیاتر بۆ ناوی خراپتری دەکات. پێویستە بڕیار لەوە بدەین دەمانەوێت منداڵان فێری چی ببن و بۆچی فێری ببن. دەتوانیت ژیانی خەڵکی بە پەروەردەی ئامێریانە جڵەو بکەیت، بڵام ئەوانیش بە چەکی نەخۆشییە کۆمەڵایەتیەکان وەڵامت دەدەنەوە.

یەکێك لە باشترین شێوازەکانی وانە وتنەوە هی چسنی فەرمانڕەوایانی ئەوروپایە بە درێژایی هەزاران ساڵ بەکاریان هێناوە، دڵی ئەم سیستەمە دەستەبژێرەی پەروەردە ئەوەیە مەعریفەی خودی تاکە بناغەی مەعریفەی ڕاستەقینەیە، لە هەموو جێیەکی ئەم سیستەمەدا لە هەموو تەمەنێکدا، کۆمەڵێك ئەرك هەن منداڵ بە تاقی تەنها دەخەن دۆخێکی ڕێنمایی نەکراوەوە تاکو کێشەیەك چارەسەر بکەن، جاری وا هەیە کێشەکە مەترسیشی تێدایە. هەندێکجار کێشەکە شارەزابوونە لە تەنهاییدا.

لە ئێستادا، ئێمە هەموو ئەو کاتە لە منداڵ دەبەین کە بۆ پەرپێدانی مەعریفەی خودی پێویستیەتی. پێویستە ئەوە بوەستێنین، دەبێت ئەزمونگەلێکی خوێندنگەیی دابهێنین کاتێکی زۆر بگەڕێنینەوە، لە تەمەنێکی کەمەوە متمانەی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ بە منداڵان بدەین. کاتێکی فێری مەعریفەی خودی دەبن دەبن بە کەسایەتیەکی باش. دەبێت هەر لە ئێستاوە کاتی سەربەخۆ بە منداڵان بدەین، چونکە ئەوە کلیلی مەعریفەی خودییە، هەروەها دەبێت تا زووە بیانخەینە ناو جیهانی ڕاستەقینە، تاکو کاتە سەربەخۆکانیان لەبەردەم شاشە و خوێندنگەدا بەسەر نەبەن.

سیستەمێکی نوێی و چاککراوی خوێندنگە پێویستی بە چییە؟

پێویستە منداڵان چیتر مشەخۆرێك نەبێت بەسەر شانی کۆمەڵگەی کارکەرەوە. پێم وایە پێویستە خزمەتکردنی کۆمەڵە بکەین بە بەشێکی پێویستی خوێندنگە، خزمەتکردنی کۆمەڵە منداڵان فێری ئەوە دەکات خۆنەپەرەستانە بجوڵێنەوە، هەروەها خێراترین ڕێگەشە بۆ پێدانی بەرپرسیارێتی ڕاستەقینەی منداڵان و وایان لێدەکات ئەزمونی کەسانیتر ژیانیان بگۆڕێت و جیاواز بڕوانن. هەروەها خوێندن و توێژنەوەی سەربەخۆ و سەرکێشی و ئەزموون، کاتی زۆر و تایبەت و تەنهایی گرنگن بۆ چاکسازی. گرنگ نییە چاکسازی چەندە گەورە بێت، هەتاوەکو خانەوادە نەکرێت بە بزوێنەری سەرەکی پەروەردە، چاوەڕێی چاکبونەوەی منداڵە وێرانکراوەکانمان و کۆمەڵگە پەریشانەکەمان مەکەن. ئەگەر بهێڵین خوێندنگە و مەکتەباندن هۆیەك بن بۆ دابڕینی منداڵان لە دایبابیان، ئەوا ئەم کارەساتەی ئێستا بەردەوام دەبێت. ئەرکی سەرەکی خوێندنگە دابڕینی خێزان بوو لە قوتابخانە کاتێك ئامانجی خوێندنگەی کۆڵۆنییەکان کە جۆن کۆتن لە ساڵی ١٦٥٠دا ڕایگەیاند و ئامانجی خوێندنگەی ماساچوسێتسی هۆریسمان لە ساڵی ١٨٥٠دا ڕایگەیاند.

بەرنامەی خوێندنی خێزان دڵی هەموو ژیانێکی باشە، ئێمە لە بەرنامەی خوێندن دورکەوتوینەتەوە، ئیتر کاتی ئەوەیە بۆی بگەڕێینەوە. ئەگەر بمانەوێت بەرەو هۆشیاری بڕۆین و لە پەشێوی و شێتی دوربکەوینەوە، دەبێت دەستی دامەزراوەکان لە بینە قاقای خێزان بکەینەوە، لە کاتیماوەی خوێندنگەدا منداڵ و دایبابببەستینەوە بە یەکەوە.

ئەمەش بیرۆکەیەکی ترە بۆ بیرلێکردنەوە: بزاڤی ماڵپەروەردە، گەشە بکات، دایباب خۆیان فێردەکرێن؛ مانگی ڕابردوو ڕاگەیاندنی پەروەردە ڕاگەیاند ئەو منداڵانەی لە ماڵەوە

فێردەکرێن، بە بەراورد بەوانەی لە خوێندنی فەرمیدان، لە توانای بیرکردنەوەدا پێنج یاخود تەنانەت دە ساڵ لە پێشەوەن.

دەبێت داوای گوێگرتن لە دەنگ و بیرۆکە نوێیەکان بکەین: ئێمە پڕین لەو دەنگە دەسەڵاتخوازانەی لە ڕێگەی شاشە و ڕاگەیاندنەوە دەدوێن؛ پێویستمان بە دەیەك گفتوگۆی ئازادە، نەك بۆچونی شارەزایان، شارەزایانی پەروەردە زۆرجار ڕاست نەبوون؛ چارەسەرکانیان گرانە و خزمەتی خۆیان دەکات، هەروەها هەمیشە بە ناوەندیکردنی زیاتری تێدایە، ئەنجامەکانیشمان بینیوە. کاتی گەڕانەوەیە بۆ لای تاك و خانەوادە.

یاساکان پێویستیان بەوە نییە بیاننوسینەوە، ئەگەر ئەتەکێتی سروشتی کاری بکردایە و پیاوان کاتیان هەبوایە پێشانی کوڕەکانیان بدایە چۆن گەورە دەبن. لە نیۆرك سیتی خوێندنگەمان نییە، بەڵکو زیندانی ڕۆحە ونبوەکانمان هەیە. وانە گوتنەوە فرتوفیڵە، پرۆژەیەکە بۆ ئەو دۆڕاوانەی ناتوانن هیچیتر ئەنجام بدەن.

بەندی چوارەم

خوێندنگەی کەمترمان دەوێت نەك زیاتر

جێی سەرسوڕمانە، ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی ژێر پێیان وایە زیادکردنی بوار و مەودای تۆڕە خوێندنگەییە فەرمییەکان (بۆ نمونە، لە ڕێگەی زیادکردنی کاتی خوێندن لەڕۆژ یان ساڵدا) چارەسەرێکی ئابورری کێشەکانی دارمانی خانەوادەیە. بە هۆی ئەم هەڵە تێگەشتنەوە، وا دەزانن گۆڕینی تۆڕێکی خراپ بە تۆڕێکی باش ڕێگە ڕاستەکەیە. هەرگیز تۆڕەکان جێگای خانەوادە ناگرنەوە. هەروەها خوێندنگەی زیاتر واتە پارەی زیاتر.

تۆڕەکان، تەنانەت باشەکانیش وزەی کۆمەڵە و خانەوادەکان دەدزن، تۆرەکان چارەسەرێکی میکانیکی بۆ کێشەکان دەدۆزنەوە، لە کاتێکدا چارەسەری راستەقینە بریتیە لە پرۆسەی هێواش و سروشتیی خودخۆشیاری، خۆناسین بە بێ ئەمانە تەمای چارەسەری درێژخایەنت نەبێ. چارەسەری زۆربەی کێشەکان پێویستی بە پرۆسەیەکی تایبەتە، کە زۆرینەی کات ئەزمونێکی تەنهایە.

ئەرستۆ سەردەمانێك لەمەوبەر، لەوە تێگەشتبوو تاکە ڕێگە بۆ ئەوەی ببیت بە مرۆڤێکی کامڵ، ئەوەیە بەشدارییەکی پڕت لە پەیوەندی و کاروبارە هەمە جۆرە مرۆییەکاندا هەبێت. هەرچی تۆڕەکانە مرۆڤێکی کامڵیان ناوێت، تەنها بەشێکیان دەوێت. ئەگەر لە تۆڕێکدا کار بکەیت داوات لێدەکەن هەمو و بەکانت بێدەنگ بکەیت، تەنها ئە بەشە

نەبێت کە بۆ بەرهەمداریت لە تۆڕەکەدا پێویستە. ئەوە بازرگانیەکی شەیتانیە، چونکە لە پێناو بەڵێنی هەندێك سودی گریمانەیی لە داهاتوودا، ناچاریت تێکرایی و پارچەپارچە نەبونی مرۆیت بکەیتە قوربانی.

ئەو پارچەپارچەیەی زێدەڕەوی لە تۆڕدا دروستی دەکات مرۆڤایەتیەکی ئاوابوو بەرهەم دەهێنێت، وامان لێدەکات هەست بکەین ژیانی خۆمان لە دەست خۆماندا نییە، ئەو هەستەیشمان ڕاستە و بێ بنەما نییە. ئەگەر ڕاستەوخۆ ڕوبەڕووی قەیرانی خوێندنگە و کۆەڵە ببینەوە و ئارەزووی دۆزینەوەیەکی ڕێیەکی باشتر بکەینەوە، دەبێت قبوڵی بکەین خوێندنگەکان وەکو تۆڕ، بەدیهێنەری بەشێکی فراوانی ئازار وناڵینی هاوچەرخن.

خوێندنگە، کۆمپانیا، سەربازگە، کۆلێژ و نەخۆشخانەکان ئەمانە کۆمەڵەی ڕاستەقینە نین تۆڕن، تۆڕەکان پێچەوانەی کۆمەڵەکانن، تۆڕەکان دەرفەتێکی کەم بە بەشداریکردنی بەشداربوان دەدەن، ئەو دەرفەتە کەمەش هەمیشە لە شێوازێکی دیاریکراودایە. کاتێك کەسێك لە تۆڕێکدا ئازار دەچەژێت، بە تاقی تەنها دەیچێژێت، مەگەر ئەوەی خانەوادەیەکی هەبێت یان کۆمەڵەیەك کە لەگەڵیدا ئازار بچێژن.

ئەوە گەشەسەندنێکی سەیر و مەتەڵاویە کە گرنگیپێدانی ناو تۆڕ بە تەواوەتی ڕاستەقینە نییە، بەڵام تا ئێستا بە جوانی لەمە تێنەگەیشتوین، کرداری مرۆڤ لە دۆخە تۆڕێکاندا وەکو کردەیەکی شانۆیی دەردەکەوێت. تەنانەت لە کۆمەڵەی بەشە ناوخۆیەکاندا، ئەو کۆمەڵە لێکنزیك و بزوێنەرانە، کاممان پاش تەواوکردنی خوێندن نەگەشتوین بەو حەقیقەتە تاڵەی، ناتوانین ناو و ڕوخساری هاوڕێکانمان بە جوانی بهێنینەوە یاد.

لە گەشەی کۆمەڵگەی مرۆییدا، خانەوادەکان گرنگترین بوون، پاشان کۆمەڵەکان، پاشان ئەو دامەزراوانەی کۆمەڵەکە بۆ خزمەتکردنی خۆی داینابوون. لە سەدەکانی ڕابردوو لە حاڵەتی پاشا دێرینەکاندا، کاتێك دەکەویتە دەرەوەی مەودای دەسەڵاتی ئەوانەوە، دەتوانی ئەوە بکەیت کە دەتەوێت؛ لە باسی دامەزراوە هاوچەرخەکاندا، تەکنەلۆژیا لە هەموو شوێنێکە، ئەگەر ئەو خانەوادەیەی تیدا دەژیت پەناگەت بۆ دروست نەکەن ناتوانیت لەدەست دامەزراوە هاوچەرخەکان هەڵبێت.

کێنەدی سەرۆکی ئەمریکا دەڵێت: مەپرسە وڵاتەکەت دەتوانێت چی بۆ تۆ بکات، بەڵکو بپرسە تۆ دەتوانیت چی بۆ وڵاتەکەت بکەیت. ئەمە توندترین جۆری پەتیکردنە، ڕێنمایەکەی کێنەدی دەربڕینێکی فەلسەفیە، کە تیایدا قسەی نەتەوە پێش قسەی

خانەوادەیە، ئەگەر ئەم بۆچونەت بەلاوە ئاسایی بێت، ئەوا ئگەری زۆرە پێشت وابێت خوێندنگەکانمان کێشەیان نییە.

ئەگەر بەهای مرۆڤ بە سەرکەوتن یان شکست لەم کۆششە پەتیانەدا هەژمار بکرێت، ئەوا ئامێرێکی کۆمەڵایەتی دروست دەبێت کە لە ڕێگەی وەپاڵدانی ماناوە بۆ لای چالاکیە بێماناکان، فێرخوازان لە مرۆڤبوون دەخات، لە سروشتی خۆیان بێگانەیان دەکات.

لە ئێستادا زۆربەی وڵاتان ببون بە نەتەوەی دامەزراوەکان، لە کاتێکدا پێشتر نەتەوەی کۆمەڵەکان بوون. شارە گەورەکان توشی قەیرانی قورس دەبنەوە، هۆکاری سەرەکی ڕکابەری بەردەوامی دامەزراوەکان و تۆڕەکانە لەسەر چاودێریکردنی منداڵان و بەتەمەنەکان.

قوڵترین ئامانجەکانی ئەم تۆڕە زەبەلاحانە دروستکردن و بەڕێوبردنی یەك ڕەنگییە. لۆجیکی خانەوادە و کۆمەڵە دابینکردنی جۆراوجۆریە لە دەوری بابەتێکی ناوەندی، بۆیە کاتێك دامەزراوەکان دەست لە بابەتە کەسیەکان وەردەدەن، زیانی گەورە دەگەیەنن، کاتێك سەرنجی خۆمان لەسەر خانەوادە و کۆمەڵەکان لادەبەین دەیبەخشینە دامەزراوەکان، بە شێوەیەکی قوڵ مرۆڤەکان لە مەیلە مرۆییەکانی خۆیان بێبەشیان دەکەن، ئامێرێك دەکەین بە پاشای خۆمان.

نزیکەی سەدەیەك لەمەوبەر، کۆمەڵناسێکی فەرەنسی نوسی، ئامانجی نەگوتراوی هەموو دامەزراوەیەك مانەوە و گەشەکردنە نەك ئەو ئامانجەی بانگەشەی بۆ دەکات. بۆ نمونە ئامانجی سەرەکی سوپای هەمیشەیی بەرگریکردن نییە لە ئاسایشی وڵات، بەڵکو مسۆگەرکردنی بەشێکی بەردەوامی بودجەی وڵاتە بۆ خۆی.

ئەو بازرگانیەی ناومان ناوە پەروەردە (مەکتەباندن) نمونەیەکی جوانی پێکدادانی بەهاکانی تۆڕە لەگەڵ بەهاکانی کۆمەڵەی ترادیشناڵدا. بە درێژایی ١٥٠ ساڵی رابردوو وا زانراوە خوێندنی دامەزراوەیی گونجاوە بۆ ئەوەی ئەندامەکانی بۆ سەرکەوتنی ئابوری ئامادە دەکات. خوێندنی باش = بە کاری باش و موچەی باش. ئەم دروشمە هەم هارڤارد بەرزیدەکاتەوە هەم ئامادەییەکان.

ئەگەر دەتەوێت بزانیت پێناسەکردنی پەروەردە وەك کاڵایەکی ئابوری چەندە بێمانایە، لە خۆت بپرسە کاتێك پەروەردە بە ڕێگەیەك بۆ زیادکردنی ئەقڵی بەکاربەر دەزانین، ئەو

بەکاربەرەی هەڕەشە لە ئاو و هەوا و تەواوی زەویەکەمان دەکات چیمان دەستدەکەوێت.

پرسیارێکی مانادار ڕوبەڕومان دەبێتەوە و خۆمانی لێدەشارینەوە، ئەویش ئەوەیە خوێندنی مەکتەباندنی بە کۆمەڵ چیە؟ ئەگەر وەڵامەکەی خوێندنەوە و نوسین و حیساب بێت، ئەوا کەمتر لە سەد کاتژمێری پێویستە، کەوایە بۆچی بە زۆری زۆردار منداڵ ١٢ ساڵ دەنێرینە خوێندنگە.

جیاوازیەکی گرنگی نێوان کۆمەڵە و دامەزراوەکان ئەوەیە کۆمەڵەکان سنوری سروشتیان هەیە؛ یان لە گەشەکردن دەوەستن، یان دەمرن، ئەمە هۆکارێکی باشی هەیە، لە باشترین کۆمەڵەکاندا هەمووان کەسێکی تایبەتن کە زوو یان درەنگ جێی خۆیان لە هۆشیاری ئەوانیتردا جێگیر دەکەن. لە دامەزراوەکاندا کەسێکی نەناسراویت، خۆشت حەزت لە نەناسراو بوونە، چونکە دەزانیت ناسراوبوون دەتخاتە مەترسیەوە.

خودی ڕاستەقینەش خاڵێکی جیاکەرەوەی نێوان کۆمەڵە و تۆڕەکانە، ئەگەر قسەی خۆت لە کۆمەڵەدا نەبەیتە سەر هەمووان پێتدەزانن و  توشی کێشە دەبیتەوە، بەڵام درۆکردن لە پێناو بەرژەوەندی کەسیدا لە دامەزراوە گەورەکاندا ئاسایی و پێوەریە.

کۆمەڵەکان کۆکراوەی کۆمەڵێك خانەوادە و هاوڕێن، کە مانایەکی مەزن لە درێژکردنەوەی پەیوەندی خانەوادەییدا بۆ کۆمەڵێك برا و خوشکی فەخری بەدی دەکەن. ئەوان پەیوەندیگەلێکی ئاڵۆزی هاوبەسی و بەرپرسیارێتیین کە سنورەکانی ماڵ تێدەپەڕێنن.

خوێندنگەکان ئێستەش هۆکارێکی سەرەکی خانەوادە و کۆمەڵە لاوازەکانن. ئەوان دایبابیان لە منداڵەکانیان دوردەخەنەوە و ناهێڵن کونجکۆڵی ڕاستەقینەیان سەبارەت بە ژیانی یەکتر هەبێت، خوێندنگەکان ڕەسانەیەتی خانەوادە دەخنکێنن. ئەو کاتانەش دەدزێت کە بۆ گەشەسەندنی خانەوادە پێویستە.

پەروەردە هەرچی بێت، دەبێت بتکات بە مرۆڤێکی تاقانە، نەك لاسایکەرەوەیەك؛ دەبێت ڕۆحێتێکی ڕەسەنت بداتێ بتوانیت ئاڵنگاریە سەختەکان ببەزێنێت؛ دەبێت بەها گەلێکت پێ ببەخشێت لە گەشتی ژیانتدا ڕێیان پێبدۆزێتەوە؛ دەبێت لە ڕووی مەعنەویەوە دەوڵمەندت بکات، بتکات بە کەسێك حەز بەوە بکەیت کە ئەنجامی دەدەیت، لە هەر کوێ و لەگەڵ هەر کەس بویت ئاسودە بیت؛ دەبێت شتە گرنگەکانت فێربکات: چۆن

بژیت و چۆن بمریت. ئەوە ئێستا لە ئەمریکا هەیە یەخەی پەروەردەی گرتووە بیردۆزێکی ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیە کە دەڵێت یەك ڕێگەی ڕاست هەیە بۆ گەورەبوون. ئەوە بیرۆکەیەکی کۆنی میسریە و هێماکەی هەڕەمێکە چاوێك لە لوتکەکەی دایە، ئەو هەڕەمەی لە دیوەکەیتریدا دۆلارێکە.

منداڵان دەخەنە پۆلێکەوە، تەواوی ژیانیان لە قەفەزێکی نەبینراو دەژین، بەبێ ئەوەی دەرفەتی تامکردنی کۆمەڵیان هەبێت؛ بە زەنگەکان زووزوو سەرنجی منداڵەکان ببە، فێری ئەوە دەبن هیچ شتێك گرنگ نییە، زۆریان لێبکە بۆ مافە سروشتیەکانی چوون بۆ تەوالێت تکا بکەن.

خوێندنی بە کۆمەڵ ناتوانێت کۆمەڵگەیەکی تەندروست بەرهەم بهێنێت، چونکە هەموو ڕۆژێك ڕکابەری و بێدەنگکردن و ترساندنی تیادایە، ئەو خوێندنگەیەی ئێمە بەرهەممان هێناون توانای فێرکردنی هیچ بەهایەکی نامادییان نییە. خوێندنی بە کۆمەڵ منداڵان وێران دەکات، هەروەها سوکراتیش پێشبینی کردبوو، بە ناوی پەروەردەوە گیرفانمان دەدرێ. یەکێك لە ڕێگە دڵنیاکانی ناسینەوەی پەروەردەی ڕاستەقینە ئەوەیە زۆری تێناچێت و پشت بە کەرەستەی گران نابەستێت. ئەو ئەزمونانەی پەروەردە دروستدەکەن و ئەو خود هۆشیارەی هانی دەدات بە خۆڕایین.

٦٥ ساڵ لەمەو پێش، بێرتراند ڕاسڵی گەورە بیرکاریزان و فەیلەسوف، کە پەیوەندیەکی نزیکیشی لەگەڵشای ئینگلتەرا هەبوو، باوەڕی وابوو خوێندنی مەکتەباندن بە کۆمەڵی ئەمریکا پرۆسەیەکی دژە دیموکراسیە، هەروەها کەرەستەیەکی دەستکردی نەتەوەیی لە ڕێگەی لابردنی هەمە جۆریی مرۆیی و لابردنی ئەو یەکەیەی هەمە جۆری دروست دەکات. ڕاسڵ پێی وایە ئەمریکا تاکە وڵاتی گەورەی سەر زەویە بە ئەنقەست ڕێگەی بیرکردنەوەی دیالێکتیکییانە لە منداڵەکانی دەگرێت.

بەندی پێنجەم

بنەما کۆنگرێگەیشنالیەکە سەرەتای چارەسەری ئەمریکی بۆ کێشەی خوێندنگە

خەڵکی نیو ئینگلاند سیستەمێکیان داهێنا ئەو کەسانەی دەیانویست پێکەوە کاربکەن و بژین دەیانتوانی وا بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا تەواوی ناوچەکە لە گەشانەوەدا بوو: لە ڕووی مادی و فیکری و کۆمەڵایەتیەوە. دەتگوت ئەگەر گرنگی بە کاروباری خۆت بدەیت گرنگی بە کاروباری خەڵکیش دەدەیت.

من نالێم بیرکردنەوەی جیهانی بێمانایە، بەڵام ئەستەمە. ناتوانیت بیر لە شتێك بکەیتەوە نەیزانیت و کەسیش هەموو خەڵکی ئەم هەسارەیە ناناسێت. هەندێك کەس کەمێك لەسەر هەندێك بەشی کەمی دەزانن.. ئەو کەسانەی جیهانیانە بیر دەکەنەوە بە شێوەی ئاماری و پەتیکردنەوەیی، جیهان بۆ ژمارە کەم دەکەنەوە، ستەمکارە سیاسی و پیشەسازیەکان بە سەرکەوتوترین شێوە ئەمەیان کردووە. چەمکەکانیان و چلێسیەکەیان پەتیە؛ پەتیکردنەکەشیان ڕێیان بۆ کرداری وێرانکەر خۆش کردووە.

بە پێی زۆرینەی پێوەرەکان، دۆخی ڕەشتپێستەکان لە ئێستادا خراپترە لە ساڵانی ١٩٦٠کان. ڕۆحیەتی بەدخوی لە هەموو جێگایەك هەیە، بە خوێندنگەکانیشمانەوە؛ ئەم دۆخی ڕقە لە هەموو ناوچەیەکەوە هەیە. دۆخی ناخۆشی ژنانیش هەیە، بەڵام تێگەشتنی لێی ئاڵۆزترە، بەڵام ئەگەر ڕێژەی بەرزبونەوەی خۆکوشتن، نەخۆشی دڵ، نەخۆشیە سۆزداریەکان، نەزۆکی، هەروەها دۆخە نەخۆش ئامێزەکانی تربکەین بە پێوەر، ئەوا ناچارین بڵێین پاڵنانی هەموو ژنان بۆ کارکردن شانبەشی پیاوان و لەگەڵ پیاوان زیانیشی هەبوو. لەوەش زیاتر بەڵگەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لە ساڵی ١٩٩٠دا، داهاتی ئەو ژن و مێردانەی هەردوکیان کار دەکەن بە حاڵ لە داهاتی ئەو پیاوە کاریگەریترە کە لە ساڵی ١٩١٠دا خۆی کاری کردووە و ژنەکەی لە ماڵەوە بووە. کارکردنی ژنان بوەتە هۆی لە ناوبردنی ماڵ کە پەناگە و پارێزەرێکە بۆ منداڵ. هەروەها گەورەکردنی منداڵان لە لایەن بێگانەکانەوە گەورە کران. زۆربەی منداڵان پەروەردە ناکرێن، بەڵکو دەمەکتەبێنرێن.

شێوازی بیرکردنەومان لە کێشەکان بەندە بە شێوازی بیرکردنەوەمان لە سروشتی مرۆڤ، میتۆدی پەروەردەی ئەمریکی فێرخوازان تێدەگەیەنێت ئەوان ئامێرن. زەنگەکان لێدەدرێت، وانیەکیتر دەخوێنرێت. لە ساڵی ١٩٣٠دا، تۆماس بریگز، لە وانەیەکی هارڤاردا گوتی: گەورەترین وەبەرهێنانی نەتەوەکە لە خوێندنی ناوەندیدا هیچ دەستکەوتێکی ئەوتۆی نەبووە. پاش پاش دوو دەیە لە ساڵی ١٩٥١دا لێکۆڵینەوەیەك لە سەر ٣٠٠٠٠ هەزار فێرخوازی لۆس ئەنجلس دەریخست لە سەدا ٧٥ی فێرخوازانی پۆلی هەشت ناتوانن لەسەر نەخشە زەریای ئەتلانتیك بدۆزنەوە، هەروەها زۆرینەیان ناتوانن سەدا پەنجای ٣٦ دەربهێنن.

لە کۆتایدا بزانە پەرژینی باش دراوسیی باش دروست دەکات.

ئەم کتێبە پێکهاتووە لە دوانزەی کتێبی پەروەردەیی گرنگ کە ژمارەی لاپەڕەکانیان نزیکەی (٣١٩٥) لاپەڕەیە، کە کورت و پوختکراوەتەوە بۆ (٢٣٢) لاپەڕە، ئەم کتێبانە لە گرنگترین کتێبەکانی بواری پەروەردە وفێرکردنن. گرنگی ئەم کتێبانە لە جیاوازی ناوەڕۆك و گەورەیی نوسەرەکانیاندایە. گەر دەتەوێت لە بیر و فەلسەفەی پەروەردە بگەیت، پێویستە ئەم پوختەیە بخوێنیتەوە؛ لەسەرەتاوە باس لە گرنگی پەروەردەی تیۆری دەکاتەوە پاشان باسی گرنگی قوتابخانە کاریگەری لەسەر پەروەردە و فێرکردن، هەروەها پەروەردە لە ڕوانگەی دەروونناسی و کۆمەڵاناسیەوە، لە کۆتایدا باس لەو کەسانە دەکات رەخنە لە پرۆسەی خوێدن دەگرن بە کۆیلەکردن ناوی دەبەن و پییان وایە سیاسیەکان خوێندنگە لە بەرژەوەندی چینی باڵادەست بەکاردەهێنن. ئەمەی خوارەوە ناوی کتێبەکانە لەگەڵ ژمارەی لاپەڕەیان.

کتێبی یەکەم: ئەی ڕۆڵەی شیرینم- نوسینی: ئیمامی غەزالی. ٦٤ لاپەڕەیە.

کتێبی دووەم: ئێمیل - نوسینی: ژان ژاك ڕۆسۆ. ٤٢٠ لاپەڕەیە.

کتێبی سێیەم: دەربارەی هونەری پەروەردە. - نوسینی: ئیمانوێل کانت. ١٣٢ لاپەڕەیە.

کتێبی چوارەم: ڕۆحی پەروەردە - نوسینی: گۆستاڤ لۆبۆن. ٢٧٨ لاپەڕەیە.

کتێبی پێنجەم: دەربارەی پەروەردەکردن. - نوسینی بێرتراند ڕەسڵ. ٣٣٤ لاپەڕە.

کتێبی شەشەم: ئەزمون و پەروەردە. - نوسینی: جۆن دیوی. ١٥٦ لاپەرەیە.

کتێبی حەوتەم: کۆمەڵناسی پەروەردە. - نوسینی: مەحمود شارعپور. ٣٦٨ لاپەڕەیە.

کتێبی هەشتەم: دەروونناسی پەروەردەیی. - نوسینی: محەمەد پارسا. ٤٧٠ لاپەڕەیە.

کتێبی نۆیەم: سایکۆلۆژیای هونەری سەرکەوتن. نوسینی: کۆمەڵێك پرۆفیسۆر. ٢٨٠ لاپەڕەیە.

کتێبی دەیەم: پێداگۆگی ستەملێکراوان - نوسینی: پاولۆ فرێری ٣٥٠ لاپەڕەیە.

کتێبی یانزەیەم: پەروەردە پێشەکیەکی زۆر کورت. - نوسینی: گاری تۆماس.١٩٠ لاپەڕە.

کتێبی دوانزەیەم: گێلمان دەکەن. - نوسینی: جۆن تایلەر گاتۆ. ١٥٣ لاپەڕە.